# تەفسیری خاڵ



بە قەڵەمی

شێخ

محمدی خاڵ

ئەندامی کۆڕی زانیاری عیراقی

جزمی ( تبارك )

« جزمی بیستو نۆهەم »

# تەفسیری خاڵ

بە قەڵەمی

شێخ

محەممەدی خاڵ

ئەندامی کۆڕی زانیاری عیراقی

**جزمی ( تبارك )**

« جزمی بیستو نۆهەم »

---

**لە چاپخانەی ( الحوادث ) لە بەغدا لەچاپدراوە**

**١٩٨٦**

# جزمی
# بیستو نۆهەمە
# ســـورەی ( ملك )ە

**مەککی‌یە ، ٣٠ ئایەتە ، ٣٣٥ ووتەیە ، ١٣٠٠ پییتە**

## بسم الله الرحمن الرحیم

**بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

سوورەتەکانی ئـەم جزمـە هـــەمووی مەککین ، واتە لـەپێش کۆچ‌کردنی پێغەمبـەر بۆ «مەدینە» هاتوونەتە خوارێ ، زۆرتر سوورەتی مەکـــکی هـــەوڵ‌ئەدات بۆ دامـــەزراندنی بیروباوەڕ بـــە خواو ، بەپێغەمبـەریەتیی پێغەمبـەرو ، بە ڕۆژی دوایی ، لەگـــەڵ ترساندنی بێ‌بڕوایان بە ڕۆژی دوایی ، کە لەوڕۆژەدا هەموو کەسێك بە ئەنجامی کردەوەی خۆی ئەگـــات ، ئنجـــا یا ئەچێ بۆ بەهەشت وە یا ئەچێ بۆ دۆزەخ ، وە ناوبەناو باسی ئەم دوو شوێنە ئەکات هەریەکەی بە ڕەنگێك ، وە هـــەر جارەی بەجۆرێك لەگـــەڵ ئەمانەشا ناوبەناو دڵخۆشیی پێغەمبەر ئەداتەوە تا نائومێد نەبێ ، وە دان بە خۆیا بـــگرێ ، وەك پێغەمبـــەرانی پێش خۆی ، تا سەرئەکەوێ‌و زاڵ ئەبێ •

سەرەتای ئەم سوورەتە دائەمەزرێنێ بە باسی گەورەیی ئەو خوایەی کـە خـاوەنی هـــەموو شتێکە ، وە ئادەمیی هێناوەتە جیهـان لـەدوای نەبوون ؛ بۆ تاقی‌کردنەوەیان ، وە ئـەم هەموو مانگ‌و ڕۆژو ئەستێرانەی

# سورة الملك

## بسم الله الرحمن الرحيم

تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (١)
الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ ،

## سوورەی ( ملك )ە

### بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

گـەورەیە ئەوکەسەی کـە هـەرچی دەسەڵات‌و پاشایی هـەیە بەدەست ئـەوە ، وە ئـەو دەسـەڵاتدارە بەسـەر هـەموو شتێـکا ( ١ ) ئەوکەسەی کە مردن‌و ژیانی داناوە ،

دروست‌کردووە بە ژوور سەریانەوە ، بەم دەستوورە جوانە ، وە بـەم ڕێك‌وپێـكی‌یە ، کـە تەماشاکردن‌و لێووردبوونەوەیان مایـەی بڕوا هێنانە بە خوا ، وە بە زانایی‌و دانایی‌و ئاگـاداریی ئەو ، فـەرمووی : ( تبارك الذي بيده الملك ) بەرزو گەورەیە ئەو خوایەی کـە هـەرچی دەسـەڵات‌و پاشـایی هـەیە لـەم بوونەوەر «کون»ە دا بەدەست ئـەوە ( وهو على كل شيء قدير )وە ئەو خوایە خاوەن توانایە بە سەر هەموو شتێـکا .

لەپاش باسی توانایی‌و دەسەڵاتی خوا بەسەر هەموو شتێکا ، ئنجـا وێنەیەکمان بۆ ئەهێنێتەوە لەو دەسەڵاتە ، ئەفـەرموێ : ( الـذی خلق الموت والحياة ) ئەو خوایەی کەمردن‌و ژیانی داناوە .

لِيَبْلُوَكُمْ : أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً ،

تا تاقیتان بکاتەوە : کە کردەوەی کامتان چاکترە ،

مەبەست لەم مردنە نەبوونیی پێش لەدایكبوونە کە ئادەمیی لەو کاتانەدا چەند توخم «عنصر»ێکی پەراگەندەیە لەناو خاکا ، نە ژیانی هەیەو نە نیاز «ارادە»و نە سەربەخۆیی «اختیار» لەپاشا خوا بەپێی دەستوورو باوێك کە دایناوە لە جیهانا ئەو توخمانە کۆئەکاتەوە لە خواردەمەنیی‌دا ، وە ئەو خواردەمەنی‌یانە ئەکات بە ڕۆزیی ژنو پیاو ، وە ئەبن بە خوێن لە جەستەیانا ، لەپاشا خوێنەکەش ئەبێ بە تۆو ، ئنجا هەردوو تۆوەکە کۆئەکاتەوە لە شوێنێکی تایبەتی لە ئافرەتا ، وە ئەیانکا بە مرۆڤێکی ڕێكوپێکی ، زیندووی ، تێگەیشتووی ، خاوەن نیازو سەربەخۆیی ، ئەوەش کە ئەکات ( لیبلوکم ایکم احسن عملا )تا تاقیتان بکاتەوە : کە کردەوەی کامتان باشترە ، واتە کردەوەی تاقی‌کردنەوەتان لەگەڵ ئەکات ، تا دەربکەوێ بۆ خۆتانو بۆ مەردوم ، کە تا چ ئەندازەیەك ئارەزووی چاکە ، یا خراپەتان هەیە ؟ تا بەپێی کردەوەی خۆتان پاداشتان بداتەوە ، ئەگینا خوا خۆی بە بێ تاقی‌کردنەوە بەندەی خۆی ئەناسێ ، بەڵام مەردوم خۆی‌و خەڵق نایزانن ، ئنجا کە ئەم تاقی‌کردنەوەیە بوو ، ئەوحەلە ، کەس ناتوانێ بیانوو بێنێتەوە ، وە هەمووکەسێك لە ڕۆژی خۆیا دان بە گوناهی خۆیا

وَ هُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ (٢) الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقاً

وەهەر ئەوە زاڵو خۆشبوو (٢) ئەوکەسەی کە حەوت ئاسمانی دروست کردووە یەك لەسەر یەك ،

ئەنێ ، وە چاكو خراپ بەئاشکرا لە یەك جیا ئەبێتەوە ، ئەوسا پاداشی ـ چاکان بە چاکەو خراپان بە خراپە ئەدرێتەوە ، وە کەس ناتوانێ لە دەستی دەرچێ چونکە ( وهو العزیز ) هەر خوا زاڵو بەدەسەڵاتە بەسەر گوناهکارانا ( الغفور ) هەروەك خۆشبووە لەو کەسانەی کە بەشیمان ئەبنەوەو خۆیان لە خراپە ئەگێڕنەوە .

لەپاش باسی نیشانەی دەسەڵاتی خوا بەسەر ئادەمیی‌دا ، ئنجا باسی نیشانەی دەسەڵاتی ئەکات لە جیهانا ، ئەفەرموێ : ( الذی خلق سبع سماوات طباقا ) ئەو خوایەی کە حەوت ئاسمانی دروست کردووە بە زوور سەرتانەوە یەك لەسەر یەك .

مەبەس لەم حەوت ئاسمانە ، حەوت ئەستێرەن لەو ئەستێرە گەڕۆکانەی کە بەدەوری ڕۆژا ئەسووڕێنەوە ، وە ئاسمانن بۆ زەویی .

لەکاتی کلدانی‌یەکانەوە وا زانراوە کە ئەستێرەی گەڕۆك حەوتن ئەویش : « ڕۆژو ، مانگو ، عطاردو ، زهرەو ، مریخو ، مشتریو زحل »ن ، کە بە چاو بینراوون ، وە هەریەکەی لەسەر چەمەرەیە

ئەسووڕێنەوە ، ئـەم زانیاری‌یە هـەروا مایەوە لەناو گەلانا تا ئەستێرەی « ئەورانوس »و « نیتۆن » دۆزرانەوە ، کـەچی کـە لـە قورئان وورد ئەبینەوە لە گەڵێ ئایەتا ئەگەیەنێ کە مانـگ‌و ڕۆژ لـە حەوتەوانەی گەڕۆك نین ، کـە ئەوەش وایە ؛چونکە ڕۆژ دایـکی هەموویانە ، وە ئەمان لەو جیابوونەتەوە ، وە بەدەوری ئەوا ئەسووڕێنەوە ، وە مانگیش کچی زەوی‌یە ، وە لەم پچڕاوە ، وە بـە گردی ئەمـا ئەسووڕێتەوە ، ئاشکراترینی ئەو ئایەتانە ، ئایەتی سوورەی «عنکبوت»ە کە ئەفەرمووێ : « ولئن سألتهم من خلق السماوات والأرض ، وسخر الشمس والقمر ؟ ليقولن الله »(١) کەواتە حەوتەوانەی گەڕۆك ئەبێ «عطارد • زهره • مریخ • مشتری • زحل • ئەورانووس • نیتۆن » بن •

لەپاشا ئەستێرەی «پلۆتۆ» دۆزرایەوە ، دوای ئەو ئەستێرەی ئێکس دۆزرایەوە،وە ئەستێرەی گەڕۆك بە بێ زەویی بوونەوە بە نۆ کەچی کە لە قورئان ووردئەبینەوە لە هەموولایەکەوە ، یا ئەفەرمووێ « سبع سماوات طباقاً »یا ئەفەرمووێ : « وبنينا فوقكم سبعا شدادا »(٢) کە واتە قورئان باس لە حەوت ئەستێرەی گـەڕۆك ئەکات کە ئاسمان بن بۆ زەویی ، واتە بە ژوور سـەری زەوی‌یەوە بن ، وە لـە زەویی دوورتر بن بـۆ ڕۆژ ،

(١) واتە ئەگەر لێیان بپرسییت کە کێ ئاسمانەکان‌و زەویی دروست کردووە ، وە ڕۆژو مانگی ڕام‌کردووە ؟ بێ‌گومان ئەڵێن : خوا •

(٢) واتە دروستمان‌کرد لە ژوور سەرتانەوە حەوت ئاسمانی قـایمی بەهێز •

کەوابوو « عطاردو زهره بەرناکەوون ؟ چونکە لە زەویی نزیکترن بە ڕۆژ ، وە لەژێر زەویی‌یەوەن ، هەروەك زەویی خۆشی بەر ناکەوێ ؟ کەواتە حەوتەوانەیەك کە ئاسمان بن بۆ زەویی بە پێی فەرموودەی قورئان « مریخ‌و ، مشتری‌و ، زحل‌و ، ئەورانووس‌و ، نیبتۆن‌و ، پلۆتۆو ، ئێکس »ە •

«عطارد» ٣٦ ملیۆن میل‌و «زهره» ٦٧ ملیۆن‌و «زەویی» ٩٣ ملیۆن‌و «مریخ» ١٤٢ ملیۆن‌و «مشتری» ٤٨٣ ملیۆن‌و «زحل» ٨٨٦ ملیۆن‌و «ئەورانووس» ١٧٨٢ ملیۆن‌و «نیبتۆن» ٢٧٩٣ ملیۆن‌و «پلۆتۆ» ٣٦٧٠ ملیۆن‌و «ئێکس» ٦٠٠٠ ملیۆن میل لە ڕۆژەوە دوورن ، وەك بە دوورو درێژیی لە تەفسیری جزمی یەکەما باسمان کردووە •

ئەم ئەستێرە ئێکسە بە ٤٦٤ ساڵی ئێمە چەرخەیەکی ڕۆژ ئەکا ، وە دەورەیەك تەواو ئەکات بەدەوری ڕۆژا ، قەبارەی سێ ئەوەندەی قەبارەی «زحل»ە ، وە ئەم ئەستێرەی ئێکسە وەك ئەستێرەی پلۆتۆ بە پێچەوانەی هەموو ئەستێرە گەڕۆکەکانی تر ئەسووڕێتەوە ، واتە لە ڕۆژ هەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا چەرخە ئەکات •

بەڕاستی ئەوە معجزەیەکی زۆر گەورەیە بۆ قورئان کە هەزارو پێنج سەد ساڵ لەمەو پێش ئەم زانیاری‌یەی ڕاگەیاندووە ، وە لەم معجزەیە گەورەتر ئەوەیە کە بەجۆرێکی‌وای فەرمووە کە هەڵنەتەقێ نە بە زانیاریی کۆن‌و نە بە زانیاریی تازەدا •

مَـا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَـانِ مِـنْ تَفَاوُتٍ ، فَارْجِعِ الْبَصَرَ ، هَلْ تَرَى مِنْ فُطُورٍ (٣) ثُمَّ ارْجِعِ الْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنْقَلِبْ إِلَيْكَ الْبَصَرُ خَاسِئاً وَهُوَ حَسِيرٌ (٤)

تۆ نابینیت لە دروستکردنی خوادا هیچ ناڕێکی‌یەك ، ( ئەگەر گومانێکت هەیە ) چاو بگێڕە (بزانە) هیچ ناتەواوی‌یەك ئەبینیت ؟ (٣) دووبارە چاو بگێڕە یەك لەدوای یەك ، چاووت بەنائومێدیی‌و ڕیسوایی ئەگەڕێتەوە بۆ لات (٤)

( ما تری )تۆ نابینیت ئەی تەماشاکەر ( في خلق الرحمن ) لە دروستکردنی ئاسمانەکان لە لایەن خواوە ( من تفاوت ) هیچ جۆرە ناڕێکی‌و ناتەواوی‌یەك ، ئەگەر گومانێکت هەیە لەمەدا ( فارجع البصر ) دووبارە تەماشا بکەرەوەو وورد بەرەوە بزانە ( هل تری من فطور ) ئایا هیچ جۆرە ناڕێکی‌و ناتەواوی‌یەك ئەبینیت ؟ ( ثم ارجع البصر ) دیسان بە ووردیی تەماشا بکەرەوە (کرتین) یەك لەسەر یەك ، واتە ئەگەر تۆ وابکەیت ، وە یەك لەدوای یەك تەماشای ئەستێرەکانی ئاسمان بکەیت ، هەرگیز ناڕێکی‌یەك نابینیت ، بەڵکو ئەو چاوەت کە بە هەموو هێزو تەوانایی خۆیەوە ئەگەڕێ بۆ نەنگێك ( ینقلب الیك البصر خاسئا ) بە ڕیسوایی‌و نائومێدیی ئەگەڕێتەوە بۆ لای خۆت وەك دەرکراو (وهو حسیر) وە ئەو چاوەت ماندووە تاقەتی چووە ؟ چونکە زۆر گەڕاوەو هیچی نەدۆزیوەتەوە .

وَلَقَدْ زَيَّنَّا السَّماءَ الدُّنْيا بِمَصَابِيحَ ،

بێ گومان ئاسمانی جیهانمان ڕازاندۆتەوە بە چرای زۆر(ی ئەستێرە)

بە ڕاستی ئەو زاناو پسپۆڕانەی کە ساڵەهای ساڵ جوستو جۆ ئەکەن لە مادەو دەستووریا ، وە لە بوونەوەرو باویا ئەڵێن هەموو بوونەوەر ، لە پچووکترین ووردیلەوە تاگەورەترین ئەستێرە هەموو فەرمانبەری یەك دەستوورو یەك باوون ، وە هەموو بەستراونەوە بە یەك ڕیشتەوە ، وەك هێزی کێشندەی تێکڕایی بێ ، وە لە هیچ لایەکەوە بەدەگمەنیش نارێکیو کەمو کووڕیی تیا نییە .

لەپاش ئەوەی کە فەرمووی هیچ جۆرە نەنگو نارێکییەك نییە لە ئاسمانەکانو لە دەستوورو باویانا ، ئنجا باسی جوانییو دڵچەسپییان ئەکات ئەفەرموێ : ( ولقد زينا السماء الدنيا بمصابيح ) بێگومان ئاسمانی جیهانمان ڕازاندۆتەوە بە چرای زۆر ، وەك ئەستێرەکان بێ ، واتە ئەم بۆشاییەی کە لەسەر زەوییەوە دیارە ، وە هەموو کەسێك بە شەو ئەیبینێ جوانمان کردووەو ئارایشمانداوە بە هەزاران هەزار ڕۆژو مانگو ئەستێرە ، هەر یەکەی بە جۆرێك ئەبریسکێتەوە ، وە هەریەکەی بە ڕەنگێك ئەتریسکێتەوە ، یەکێك سوورو یەکێك سپی ، یەکێك گەورەو یەکێك پچووك و یەکێکی تاونجی . یەکێك دوورو یەکێك نزیك ، یەکێك گەشو یەکێك کز ، یەکێك گەڕۆكو یەکێك نیشتەجێ . بەدرێژایی شەوو ڕۆژو ساڵو مانگ دێنو دەچنو هەڵدێنو ئاوا ئەبن ، وە لەم ئاسمانە کاکی بە

وَجَعَلْنَاهَا رُجُوماً لِلشَّيَاطِينِ ،

وە گێڕاومانن بە ڕەجمی بێبڕوایان

کاکی‌یەدا ـ کە بیبر نای‌بڕێو چاو هەنای سەدهەزاران هەزار یەکێکی ناکات ـ مەلە ئەکەن، وە هەریەکە لەسەر چەمەرەی خۆی ئەسووڕێتەوە، وە خولی خۆی تەواو ئەکات ، بـێ‌ئەوەی کە بـە یەکا هەڵتەقین یـا هەناسەیەك پاش‌و پێش بکەوون ، بە ڕەنگێکی‌وا کـە ئەستێرە شناسێك هـەر لـە ئێستاکەوە ئەتوانێ پێت‌بڵێ کـە ڕۆژ یا مانـگ لە فلان کاتا ئەگیرێ ، وە لە فلان کاتا بەر ئەبێ ، کـە ئەمانە گەورەترین بەڵـگەن لەسەر ڕێك‌وپێکیی هەڵاتن‌و ئاوا بوونی ئەم ئەستێرانە ، وە هــەر بێ بڕوایەك لەشەوێـکی پاکی تاریکی بێ گـەردا سەرێك بەرز بـکاتەوە ڕووەو ئاسمان ، بێ‌بەروا لەدڵا بڕوا ئەهێنێ بەوخوایەی کــە ئــەو ئەستێرانەی دروست کردووە بە خۆیان‌و دەستوورو باویانەوە ، وە لـەم حەوایەدا ڕای‌گرتوون بە بێ کۆڵەکەو ستوون ، وە تف لە دەمیا ووشك ئەبێ‌و قسە لە گەروویا ئەگیرێ ، وەکو ئەفەرموێ : ( وجعلناها رجومـا للشیاطین )وە گێڕاومانن بە ڕەجمی ئەو بێ‌بڕوایانەی کە وەك شەیتـان لە سنوور دەرچوون ، وە بڕوایان بە بوونی خــوا نی‌یە ، واتــە ئـەم ئەستێرانە بۆ مەردومی بێ‌بڕوا ، گەورەترین بەڵگەن لەسەر بوونی خوا ، وە هــەر ئەستێرەیەك وەك بەردێك وایــە بۆ ڕەجمی بیروباوەڕیان ، هـەرووەك یەکێك کـە بۆڕی بدەیت لە قسەیەکا ـ بێ‌ی ئەڵێیت : دەم‌کوتم کردوو بەردێـکم ئاخنی‌یە قوڕگی ، مەبەس لەم ئایەتەش ئەوەیە .

وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ السَّعِيرِ (٥)

وە ئامادەمان کردووە بۆ ئەوان سزای ئاگری هەڵگیرساو(٥)

زۆر لە تەفسیرەکان ئەڵێن : « رجوم » بەمانا گومانە ، وەك لە سوورەی « کهف »دا کە ئەفەرموێ « رجما بالغیب » ، « شیاطین » بە مانا ئەستێرەشناسە ، واتە ئەو نجوم‌گەرانەی کە تەماشای ئەستێرە ئەکەن لە کاتی هەڵاتن‌و ئاوابوون‌و نزیك‌کەوتنەوە و دوورکەوتنەوەیان لە یەکتری ، بەگومان هێندێ شتیان لێ هەڵئەکرێنن وە ئەم دەنگ‌و باسانە بلاوئەکەنەوە ، واتە خوا ئەستێرەی دروست‌کردووەو کردوونی بە مایەی جوانیی بۆ ئاسمان،بەڵام نجووم‌گەر کردوونیان بە مایەی پارە پەیداکردن‌و گومرایی مەردوم ، کەواتە جێی خۆیەتی کە دۆزەخیان بۆ تاوبدرێ ، وەکو ئەفەرمووێ : ( واعتدنا لهم عذاب السعیر ) ئامادەمان کردووە بۆ ئەو شەیتانە بێ‌بڕوایانە ئاگری هەڵگیرساو .

★ ★ ★

لە پاش باسی ئامادەکردنی سزای دۆزەخ بۆ هەموو بێ‌بڕوایەك ، ئنجا باسی ئەوە ئەکات کە ئەو سزایە هەروەك بۆ ئەو شەیتان سروشتانە هەیە ، بۆ هەموو کەسێکی تریشە کە بیروباوەڕی بە خوا خراپ

وَلِلَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ ، وَبِئْسَ الْمَصِيرُ (٦) اِذا أُلْقوا فِيهَا سَمِعُوا لَهَا شَهِيقاً وَهِيَ تَفُورُ (٧) تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ الْغَيْظِ

وە بۆ ئەوانەی کە بێبڕوان بە پەروەردەگاریان سزایان دۆزەخە ، کە مەنزڵگایەکی زۆر خراپە (٦) کاتێك کە فڕێدرانە ناوی‌یەوە ، لوورەیەکی لێ ئەبیەن ، وە ئەو ئەجۆشێ (٧) نزیکە (دۆزەخ) لەڕقانا پارە پارە ببێ ،

بێ ، ئەفەرموێ : ( وللذين كفروا بربهم ) بۆ ئەوانەی کە بڕوایان بە خوای خۆیان نی‌یە ، ئنجا هەر بڕوای نەبێ ، یا بڕوای ببێ ، بەلاّم هاوبەشی بۆ پەیدا بکات ( عذاب جهنم ) سزای دۆزەخ ئامادەیە ( وبئس المصير ) کە ئەو دۆزەخە شوێنێکی زۆر بەدو خراپە کە هەموو بێبڕوایان تیا کۆئەبنەوە .

ئنجا باسی دۆزەخ ئەکات،لەکاتێکا کە باوەشی خۆی ئەکاتەوە بۆ ئەو بێبڕوایانە ، ئەفەرموێ : ( اذا القوا فيها ) کاتێك کە فڕێدرانە ناوی‌یەوە ( سمعوا لها شهيقا ) ئەبیەن لەو دۆزەخەوە لوورەو نرکەیەك وەك نرکەی سنگی کەسێك کە ڕقی هەستابێ و هەڵی بۆ هەڵکەوتبێ بۆ تۆڵەسەندن لە دوژمنی خۆی ( وهي تفور )وە ئەو دۆزەخە ئەکوڵێ‌و جۆش ئەخوات ، وەك مەنجەڵی سەر ئاگر ، بەجۆرێکی‌وا ( تكاد تميز من الغيظ ) کە نزیکە لە داخی ئەو بێبڕوایانە بتەقێ و پارچە پارچە ببێ .

كُلَّمَا أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَا : أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ؟ (٨) قَالُوا : بَلَى قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ

هەرچەند دەستەیەك فڕێبدرێنە ناویەوە ، دەرگەوانەكانی دۆزەخ پرسیاریان لێ ئەكەن : ئایا پێغەمبەرێكی ترسێنەرتان بۆ نەهاتووە (لە جیهانا) ؟ (٨) ووتیان بەڵێ بۆمان هاتووە

هەموو ئاگرێكی داربەڕووی تەڕ كە لەگەڵ گرتنی ، ناو بە ناو ئەم گرە گرەو ، ووڕە ووڕەی لێ پەیدا ئەبێ ، تا ئەتەقێو لەیەك بەر ئەبێ ، ئنجا ئەبێ گرەو ووڕەو تەقەی ئاگری دۆزەخ چۆن بێ ؟

مەبەس لەرق هەستانی ئاگری دۆزەخ بەڕەنگێك كە نزیك بێ لەیەك بپچڕێ ، نوواندنی ناخۆشیی دۆزەخو سزای بەتینو تەووژمێتی ، كەسێك نەختێك شارەزای وێژەی عەرەبی بێ ئەزانێ كە ئەم جۆرە نوواندنانە زۆر جوانو كاریی‌گەرن لە دڵانا .

لە پاش باسی دۆزەخ ، ئنجا باسی دۆزەخیی‌ان بۆ ئەكات ، ئەفەرمووێ : ( كلما القی فیها فوج ) هەرچەند دەستەیەك لە بێبڕوایان فڕێ بدرێنە ناو دۆزەخەوە ( سألهم خزنتها ) دەرگاوانەكانی دۆزەخ پرسیاریان لێ ئەكەن لەڕووی سەركۆنەوە ، وە پێیان ئەڵێن : ( ألم یأتكم نذیر ) ئایا پێغەمبەرێكتان بۆ نەهاتووە لە جیهانا كە بەم ڕۆژە بتان ترسێنێ ، وە ڕێنموونی‌تان بكات ( قالوا : بلی قد جاءنا نذیر ) ووتیان بەڵێ پێغەمبەرمان بۆ هاتووەو ترساندوونیشی ، بەڵام

فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا : مَا نَزَّلَ اللهُ مِنْ شَيْءٍ إِنْ أَنْتُمْ إِلاَّ فِي ضَلاَلٍ كَبِيرٍ (٩) وَقَالُوا : لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ (١٠)

بەڵام بەدرۆمــان ئەزانی ، وە پێمـان ئـەووتن : خـوا هیچـی نەناردۆتە خوارەوە ، ئێوە لە گومڕایی‌یەکی گەورەدان (٩) وە ووتیان : ئەگـەر قسەی پێغەمبەرانمـان ببیستایە ، یا تێبگەیشتینایە ، ئەمڕۆ لــە هاوڕێیانی دۆزەخ نەئەبووین (١٠)

( فكذبنا ) قسەکانیمان بە درۆ ئەزانی ( وقلنا مـا نزل الله من شيء )وە پێمان ئەووتن : خوا هیچ جۆرە فەرمانێکی نەناردۆتە خوارەوە بۆ کەس ( ان انتم الا في ضلال كبير )ئێوە هەر گومڕاو سەرلێشێواوون ، کــەوا خۆتان بە پێغەمبەر ئەزانن •

لـە پاش ئەم وەڵامەی کە دۆزەخی‌یەکان دایانەوە ، ئنجا دێتە سەر پەشیمان بوونەوەو سەرکۆنەی خۆیان ، لەکاتێکا کە هیچ کەڵـکی نی‌یە بۆیان ، ئەفەرمووێ : (وقالوا) بێ‌بڕواکان لەوکاتەدا ووتیان ( لو كنـــا نسمع ) ئەگەر لە جیهانا گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکانمان بوینایە (او نعقل)یا تێبگەیشتینایە ، واتە بە قسەمان بکردنایە(١) ( ما كنا من اصحاب السعير ) ئەمڕۆ لــە هاوڕێیانی دۆزەخ نەئەبووین ، ئنجا خـــوا ئەفــەرمووێ :

(١) مەبەسەکەمان وا لێدایەوە ؛ چونکە دیارە کــە ئەوان نە کــەڕ بوونو نە شێت •

فَاعتَرَفُوا بِذنبِهِم ، فَسُحقاً لأَصحابِ السَّعِيرِ (١١) انَّ الَّذِينَ يَخشَونَ رَبَّهُم بِالغَيبِ ، لَهُم مَغفِرَةٌ وأَجرٌ كَبِيرٌ (١٢)

بێ‌یان نا لــە گوناهەکــەیان ، دووریی لــە میهرەبانی خــوا بۆ هاوڕێ‌یانی دۆزەخ (١١) بێ‌گومان ئەوانەی کە بە دڵ لە پەروەردگاری خۆیان ئەترسن لێخۆشبوونو پاداشی گەورەیان بۆ هەیە (١٢)

( فاعترفوا بذنبهم ) بێ‌یان نا لە گوناهەکەیان ، بەڵام لەپاش چی ؟ (فسحقا لاصحاب السعير ) دووریی لە میهرەبانیی خوا بۆ هاودەمانی دۆزەخ ، واتە خوا دووریان بخاتەوە لە میهرەبانیی خۆی •

دەستووری خوایە لە قورئانا هەرچــەند باسی سزای بێ بڕوایان بکات ، دوابەدوای ئەوە باسی پاداشی چاکانیش ئەکات ، وەکو ئەفەرموێ : ( ان الذين يخشون ربهم بالغيب ) ئەوانەی کە بە دڵ لــە خوای خۆیان ئەترسن ، واتە هەروەك بەئاشکرا گوناح ناکەن ، بەدزیشەوە نایــکەن ( لهم مغفرة واجر كبير ) لێخۆشبوونو پاداشی گەورەیان بۆ هەیە •

★ ★ ★

بت‌پەرستەکانی مەککە کــە لەناو خۆیانا دابنیشتنایەو قسەیان لــە پێغەمبەرو یارانی بکردایە ، بە‌یەکتری‌یان ئەووت : ئەم قسانە دەرنەچێ

وَأَسِرُّوا قَوْلَكُمْ أَوِ اجْهَرُوا بِهِ ، إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ (١٣)
أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ ، وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ؟ (١٤)

---

ئێوە قسە بەپەنهانی بکەن یا بەئاشکرا ( بۆ خوا چوون‌یەکە ؛ چونکە ) ئاگاداره بە نهێنی دڵان (١٣) ئایا ئەو خوایەی کەمەردومی دروست کردووە ئاگای لە نهێنی یان نی‌یە ، لەکاتێکا کە ئەو ووردبین‌و خەبەردارە ؟ (١٤)

---

نەوەك بە پێغەمبەر بگاتەوە ، ئنجا خوا پێ‌یان ئەفەرموێ : ( واسروا قولكم أو اجهروا به ) قسەتان بشارنەوە یا ئاشکرای بکەن بۆ خوا چون‌یەکە ؛ چونکە ( انه عليم بذات الصدور ) ئەو زانایە بەوەی کە بە دڵتانا تێ‌ئەپەڕێ لەپێش ئەوەی کە بەسەر زبانتاندا بێ ، ئنجا یەکێك وا ئاگادار بێ ، چۆن ئاگای لە چرپەو سرپەتان نی‌یە ؟.

لێرەدا ئەگونجێ یەکێك بڕوا نەکات بەمە کە خوا ئاگادارە بە دڵی بەندەگانی خۆی ، ئنجا هات بەڵگەی لە سەر هێنایەوە ، فەرمووی ( ألا يعلم من خلق )ئایا ئەوکەسەی کە خۆی ئادەمیی دروست‌کردووە ، نازانێ چی لە دڵیایەتی ، واتە بەڵێ ئەزانێ ؛ چونکە دروست کراوی خۆیەتی ( وهو اللطيف ) وە هەر ئەوە دانا بەسەر هەموو نهێنی‌یەکی ناو دووتوێی دڵی بەندەگانی خۆیا ( الخبير ) ئاگادارە بەسەر هەموو

هـُوَ الَّذِی جَعَلَ لَکُمُ الأَرضَ ذَلُولاً

خوا ئەو خوایەیە کـە زەویی بۆ ڕام کردوون

کاروبارێکی ئاشکراو پەنهانیا •

ئەوانەی کـە مووشەك «سارووخ» دروست ئەکـەن و ئەینێرن بۆ مانگ یا بۆ مریخ و مشتریی ، ئەزانن کـە بە چـەند ڕۆژ ، وە لـە چ کاتێـکا ئەگـاتە شوێنی خۆی ، وە ئەگـەر تێکچوونێکی بەسەراهـات ، خێرا ئەزانێ لـە چییەوەیە ، وە لـە کام پارچە دایە ، ئەمە بۆ بەندەیەکی زەبوونە کـە لە مشتێ خاك دروست کراوە ، ئنجـا وەرە بزانە خـوای گـەورەو ئاگـادار ئەبێ چۆن بێ ؟! وە ئاگاداریی بە بەندەی خۆی لـە چ ئەندزازەیەکا بێ ؟!•

لەدوای ئەوەی کـە لە ئایەتی پێشوودا فەرمووی خوا خـاوەنی میهرەبانی‌یە بە بەندەگـانی خۆی ، ئنجـا نموونەیەکمان بۆ ئەهێنێتەوە ئەفەرمووێ : ( هو الذی جعل لکم الارض ذلولا ) خوا ئەو خوایەیە کە زەویی بۆ ڕامکردوون ، وە لـە هەموولایەکەوە شـاخو داخو گردو تـەپەو دۆڵو دەرەو دەشتو نەرمـانو ڕێـگاوبانی بۆ ڕاخسـتوون ، وە کانی‌و کارێزو چـەمو ڕووباری بۆ دەرخستوون ، تا ئێوەش بـە مەکینـەو بێڵو خاکەنازو پاچو قوڵەنـگە ناوجـەرگی هـەڵدڕن ، وە هـەرچی کـانو شتی بەنرخ هـەیە لێی دەربێنن ، وە هەمووی بـکەن بە دەغڵو دانو دارو درەختو باخو باخاتو سەبزەو شینایی ، تا لەبەرو

فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا ، وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ ، وَإِلَيْهِ النُّشُورُ (١٥)

ئنجا بگەڕێن بە قەراغو لاشانیا ، وە لە ڕۆزیی خوا بخۆن ، وە هەر بۆ لای ئەوە گەڕانەوە (١٥)

سێبەرو لە دارو گەڵاو لقوپۆپو چڵوچێوو گەلێ شتیتر بەهرەمەند بین ، وەکو ئەفەرموێ : ( فامشوا في مناكبها ) بێنو بڕۆنو هاتوچۆ بکەن بە کەنارو لاشانیا بۆ کسبو کارو ڕاکیشانی قازانجو سوود لە هەموو لایەکەوە ، واتە بستێکی بە بەیار مەهێڵنەوە لە شاخو داخو گردو تەپەی ، چ جای دەشتو نەرمانی ، تەنها بەشی ڕێگاو بان نەبێ ( وکلوا من رزقه )وە بخۆن لەو ڕۆزییە پاكو تەمیزەی کە خوا داونێ بە هۆی هەوڵو تەقەلای خۆتانەوە ، وە لە سنوورو چوار چێوەی فەرمودەو فەرمانی دەرمەچن ، وە لەم کسبو کارو کشتوکاڵو هاتووچۆیەتانا ستەمو دەستدرێژیی لە کەس مەکەن ؛ چونکە لە ڕۆژی دواییدا ئەچنەوە بەردەمی خوا ، وە لەسەر هەموو گوفتارو کردارێکتان پرسیارتان لێئەکات ، وەکو ئەفەرموێ : ( واليه النشور )هەر بۆ لای ئەوە گەڕانەوە لەدوای زیندووبوونەوە •

بەڕاستی ئەم زەوییوزارو ئەرزو ئاوەی کە خوا پێیداوین ، هەر گەلی زیندووی خوا پێداو ئەزانێ بەهرەی لێ وەرگرێ ، بچۆ بە خاکیانا بگەڕێ هەمووی باخو باخاتو دارو درەختو دەغڵو دانو ڕەزو سەبزەو جەنگەڵستانو لەوەڕە ، لە هەموو لایەکەوە ڕێگاو شەقامو

ئوتومەبیلو شەمەندەفەرو ئەلکتریكو چراخانە ، هەر شاخەو کون کراوە ، هەر ماهی زەردەو قەدبڕ کراوە ، هەر تەپەو گردە و تەخت کراوە ، هەر چاڵو چۆڵە و پڕ کراوەتەوە ، لەپاشا چوونە ژێر دەریاو هەمووی بینرا ، ئنجا کەوتنە حەواو هەمووی پێورا ، هەموو سەرزەویی وەك تانوپۆ بە خەتی ئاسن تەنرا ، هەر شەمەندەفەرەو وەك ڕەشمار بە شاخا هەڵ ئەگەڕێ ، یا بەناو جەرگیا هاتوچۆ ئەکاتو دائەگەڕێ ، هەر فڕۆکەیەو بە ئاسمانا ویزەی دێ ، هەرکەشتییەو بەسەر دەریادا هاژەی دێ •

نهێنی سرووشتیان دۆزییەوە ، دەستوورو باوی مادەیان کۆڵییەوە ، هەرچی گزوگیا هەیە هەمووی لە یەك جیاکرایەوە ، زۆربەی گیانلەبەران ڕامو کەویی کران ، هەرچی کان هەیە هەمووی توێنرایەوەو داڕێژرا ، ئەی موسڵمانی نوستوو تاکەی خەبەرت نابێتەوە ، تاکەی بە تەمەڵییو تەوەزەلیی ئەمێنیتەوە ، تاکەی سواڵکەریی ، تاکەی ڕووتیو ڕەجاڵیی ، تاکەی نەخۆشییو برسێتی ، تاکەی نەخوێندەواریی ونادانیی ، تاکەی پیسیو بۆخڵی ، تاکەی چڵکنی و کوڵکنی ، تاکەی پڕوپوچ پەرستیی ، ئیتر بەسە ، ئاوڕێك لە قورئانەکەت بدەرەوە و نەختێك لێی وورد بەرەوە ، بزانە چیئەفەرموێ ، بەقسەیبکەو لە فەرموودەی دەرمەچۆ ، سا بەڵکو خوا ئاووڕێکت لێبداتەوە •

لە تەفسیری « في ظلال القران» دا ئەفەرموێ : (ذلول)بە وولاخێکی ڕامی نەرمو شل ئەڵێن کە هێنانو بردنی زۆر ئاسانبێ ، وە هەرگیز سەرکێشیو چەمووشیی نەکات ، جاران مەبەسیان لەم ڕامییە وا

لێ‌ئەدایەوە ، کـە خوا زەویی ڕاخستووە لەژێر پێ‌دا بۆ بەسەرا ڕۆین‌و کێـــڵان‌و داچـــاندن ، بەڵام ئەمڕۆ زانیین کـەلێ مـەبەستی‌تری لێ دەرخستووە ، وە نیشانمان ئەدات کـە ئـەم سیفەتە بەتایبەتی ناوبراوە بۆ زەویی تا گـەلێ مەبەستی‌تر بـگەیەنێ •

ئەم زەویی‌یە ــ کـە ئێمە بە وێستاوی ئەزانین ــ ووڵاخێـکی زۆر زرێوە ، لە یەك هەناسەدا بە سێ لادا ئەڕواو لنگ‌ئەدات ، کەچی لەگەڵ ئەمیشە ڕام‌و نەرم‌و شلە بۆ ئەو گیان‌لەبەرانەی کە بەسەر پشتی‌یەوەن ، نەسەغڵەتیان ئەکـات ، نە فڕێ یان‌ئەدات ، نـە ئەیان‌خاتە خوارەوە ، وەك ووڵاخێـکی‌هێمن بە گردی خۆیا ئەسوو ڕێتەوە ، وە لە ٢٤ سەعاتا ٢٤ هەزار میل ئەخولێتەوە ، لەگـەڵ ئەم خولانەوەیەدا لە هەموو سەعاتێکیشا ٦٥ هـەزار میل ئەڕوا بۆئەوەی بە گردی ڕۆژا بسووڕێتەوە ، لە پاشـــا زەویی لەگـەڵ ڕۆژو هەموو کۆمەڵەی ڕۆژیی‌ترا سەعاتی ٢٠ هـــەزار میل ئەڕوا کـە بە هـەر سێ ڕۆینەکەی سەعاتی ئەکاتە ٨٦ هەزار میل ، لەگـەڵ ئـەم سێ بڕتاوەدا ، مـەردوم بەسەر پشتیەوە ئەحەسێتەوە ، وە کەس ناجووڵێتەوە ، وە ئاگای لە جووڵانەوەی نی‌یە •

ئـەم ووڵاخـە نەرم‌و شلە کە لە یەك‌کاتا بە سێ لادا ئەم هـەموو ڕەوت‌و ڕۆینـــەی هـەیە ، ئـــەو بارەی کە لەسەریەتی بەم هـەموو سووڕانەوەیە ناگۆڕێ ، واتە کلایی تەوەرە «محور»کەی بەدرێژایی ساڵ ٢٣٫٥° ٪ ؛ چونـکە بەهۆی ئەم کلایی‌یەوە ، چوار وەرزە پەیدا ئەبێ لە سووڕانەوەی زەویی بەدەوری ڕۆژا ، ئنجا ئەگـەر ئەمە بـگۆڕێ چوار وەرزە نامێنێ ، ئەوکاتە دەغڵ‌ودان‌و گژوگیاش نابێ ، وە ژیانیش لەسەر زەویی تێك‌ئەچێ •

خوا زەویی ڕامکردووە بۆ ئادەمیی ، بەمڕەنگە بەهۆی هێزی کێشندەوە بەستوونیەوە بە زەوی‌یەوە ، هەروەك پەستانێکی کەشیی « ضغطێکی جوی » خستۆتە سەر زەویی بۆئەوەی بەئاسانیی هاتوچۆی بەسەرابکرێ ؛ چونکە ئەگەر ئەم پەستانە لەم ئەندازەیە قورستر بووایە ، هاتوچۆ نەئەگونجا ؛ چونکە ئەوکاتە یا مەردومی ئەپلیشانەوە ، یا لە جوولەی ئەخست ، وە ئەگەر لەم ئەندازەیەش کەمترو سووکتر بووایە ، مەردوم لەکاتی ڕۆینا هەنگاوەکانی بەیەکا ئەهات ، وە خوێنی ئەندامی لە بنکی مووەکانی‌یەوە بەر ئەبوو ، چونکە پەستانی خۆی لەپەستانی کەشیی زیاتر ئەبوو •

خوا زەویی ڕامکردووە ، بەمڕەنگە ئەم هەوایەی کە دەوری زەویی داوە بەشێکی تەواوی تیایە لەو توخمانەی کە پێویستن بۆ ژیان بە ڕێژەیەکی ووردی وا ، ئەگەر نەختێك زۆرتر یا کەمتر ببوایە ژیان نەئەبوو ، بەمڕەنگە ئۆکسجین لە هەوادا ٢١٪ ، ئازوت یا نتروجین ٧٨٪ ئەوانیکەی تر لە دووهەم ئوکسیدی کاربۆن لە دەهەزار بەشی سێ بەشی تیایە ، ئەم ڕێژەیەی کە باسکرا بە بێ‌زیادو کەم پێویستە بۆ پایەداریی ژیان لەسەر زەویی •

خوا زەویی ڕامکردووە بەهۆی هەزاران شتی‌ترەوە کە زۆر پێویستن بۆ پایەداریی ژیان ••• وەك قەبارەی زەوی‌و ، ئەندازەی گەرمیی ڕۆژو ، ئەستووری توێکڵی زەویی‌و ، خێرا ڕۆینی‌و کلایی تەوەرە «محور»ی‌و ، ڕێژەی ووشکانیی و ، ئاو لەسەر زەویی‌و ، خەستیی ئەو هەوایەی کە دەوری زەویی داوە ••• هتد • ئەمانە بە هەموویان

زەویی‌یان گێڕاوە بە ڕام ، وە پێ‌بژێوی لەسەر پەیدا ، وە ژیانی تیا بەرپا کردووە ، وە بەتایبەتی بووە بە مایەی ژیانی ئادەمیی .

ئەم ئایەتە ئەمانە هەمووی ئەگەیەنێ ، وە ئەگەیەنێ کە ئەمانە هەمووی بە دەست خوان ، وەك لە سەری سوورەتەکەوە فەرمووی « تبارك الذی بیده الملك » ئەگەر هەناسەیەك خوا دەست‌بەرداری ئەم بوونەوەرە ببێ تێك‌ئەچێ ، وە بەسەر یەکا ئەڕووخێ .

★ ★ ★

ئەم ئادەمیی‌یە ئێجگار ئاوات‌و ئارەزووی زۆرە ، هەردەمەی بەلایەکا ئەیڕەتێنێ ، تا لەلایەکەوە ئەیگرێت لە لایەکی‌ترەوە بەرئەبێ ، لە بەرئەوە قورئان بە هەزارو یەك زمان قسەی لەگەڵ ئەکات ، دەمێ بە هەڕەشەو دەمێ بە دڵخۆشیی دانەوە ، وە هەر جارەی بەجۆرێك ، وە هەر ساتەی بە ڕەنگێك ؛ بۆئەوەی کە بی‌ترسێنێ وە ناوبەناو ، کوتوپڕ دایچڵەکێنێ ، تا زۆر لە سنوور دەرنەچێ .

ئەوەبوو لە پێشەوە باسی نەرم‌و شلیی زەویی کرد ، کە خوا چۆن ڕامی‌کردووە بۆ ئادەمیی ، وەك ووڵاخێکی خۆش‌ڕەوت ، ئنجا بۆئەوەی کە ئادەمیی بەتەواویی بێ‌خەم نەبێ ، وە خوای لە بیر نەچێتەوە ، ویستی تێ‌ی‌بگەیەنێ کە ئەم ووڵاخە نەرم‌و شلە ، لەوانەیە کە ناوبەناو سەرکێش‌و چەمووش بێ ، وە ئازاری مەردوم بدات ، بە بوومەلەرزەو ڕۆچوونی لایەك لە زەویی ، تا ئەوانەی کە بێ‌ئاگان بێدار بنەوە ، وە سەرێك هەڵبڕن ڕووەو ئاسمان دەستێك بەرزبکەنەوە بۆ لای خوای میهرەبان ، وەکو ئەفەرموێ : «ءأمنتم» .

ءَأَمِنْتُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ أَنْ يَخْسِفَ بِكُمُ الأَرْضَ ، فَإِذَا هِيَ تَمُورُ ؟ (١٦)

ئایا دڵنیان لەو خوایەی‌کە (بەلاتانەوە) لەئاسمانە کە بتانباتە خوارەوە بە ناخی زەوییدا ، لەکاتێکا کە زەویی (وەك دەریا) گێژ بخوات ؟ (١٦)

لەبەرئەوەی کە لە زۆر کۆنەوە ئادەمیی هەرچەند پاڕابێتەوەو داوای شتێکی کردبێ لە خوا ، ڕووی‌کردۆتە ئاسمان ، وە هەمیشە ئاسمانی بە ڕووگە «قبلە»ی نزاو محرابی پاڕانەوە زانیوە ؛ لەبەرئەوە عەرەبەکانی‌سەردەمی پێغەمبەریش بەلایانەوە وابووە کە خوا لە ئاسمانە ، ئنجا لەسەر بیروباوەڕەکەی خۆیان پێیان ئەڵێ ( «أمنتم من في السماء»ئایا دڵنیان ئەیٚ بێبڕواینە لەو خوایەی کە بەلاتانەوە وایە لەئاسمانە ( ان یخسف بکم الارض ) کە بتانباتە خوارەوە بە ناخی زەوییدا ( فاذا هي تمور ) ئنجا ئەوکاتە زەویی گێژ بخواتو قووتتان بدات ، وە خاكو خۆڵو بەردو گڵێکی زۆرتان لەسەر کەڵەکە بکات ، بە ڕەنگێکیوا کە ڕزگاربوونتان نەبێ ، هەروەك لەناو چەند ساڵێکا ئەمە ڕووئەدات ، وە هەموو ئەیزانین •

زۆر جار قورئان لەسەر بیروباوەڕی ئەوانەی کە قسەیان لەگەڵ ئەکات هێندێ شت ئەفەرموێ ، بەڵام لەلایەکی‌ترەوە خێرا ئەو بیروباوەڕەیان بۆ ڕاست‌ئەکاتەوە ، وەك لێرەدا کە لەسەر بیروباوەڕی عەرەبەکان فەرمووی : « «أمنتم من في السماء •• » بەڵام لە سوورەی

أم أَمِنْتُمْ مَنْ في السَّماءِ اَنْ يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حاصِباً ؟!

یا دڵنیان لەوکەسەی کە ( بەلاتانەوە ) لە ئاسمانە کــە بای توندتان بنێرێتە سەر بەووردە زیخەوە ؟!

« انعام »دا ئەمەی بۆ ڕاستکردوونەتەوە وە پێی فەرموون « وهو الله في السماوات وفي الارض ، يعلم سركم وجهركم ، ويعلم ما تكسبون»(١) واتە خوا بە زانینو دەسەڵات لە هەموو شوێنێکە وە ئاگـای لەهــەموو شتێــکە •

• لەبەر ئەوەی کــە بوومەلەرزە لە عەرەبستانا کەمە ، وە ئەگونجێ ئەم هەڕەشەیە زۆر کــاریان تێنەکات ، هـــات بە شتێــکی تری وا هــەڕەشەی لێ کردن ـ وەك بای گـــەرەی بەهێز بێ لەگـــەڵ لەو وردەزیخا ـ کە زۆر جار ڕوویداوە لە عەرەبستانا وە دەغـڵو دانو شـینایی داپۆشیوە ، فـەرمووی : ( أم أمنتم مـــن فـــي السماء )

ئایا دڵنیان لــەو خوایەی کــە بەلاتانەوە وایە لــە ئاسمانە ( ان يرســـل عليكم ) کــە بنێرێتە ســەرتان ( حاصبا ) بای بەهێـــز ، لەگەڵ لەو خۆڵو وردە زیخـا ، هەروەك ناردی بۆسەر گــەلی «لووت» ، وە لــە زۆر شوێنی تریش ڕوویداوە •

لەبەرئەوەی کــە ئەگونجێ بەم هەڕەشانەش نەگەڕێنەوە ، ئنجـا

(١) واتە هەر ئەوە خوا ، لە ئاسمانەکانو زەوییدا ، کــە ئاگـــای لە هەموو نهێنیو ئاشکرایەکتانە ، وە ئاگای لەوەیەکە ئەیکەن •

فَسَتَعْلَمُونَ كَيْفَ نَذِيرِ ؟! (١٧)

ئەودەمە تێئەگەن کە هەڕەشەی ئێمە چۆنە ؟ (١٧)

هات حەواڵەی کردن بە پاشەڕۆژ ، کە بەڕاستی هەر پاشەڕۆژە حاکمی دادپرس ، وە هەر لە پاشەڕۆژا دەرئەکەوێ ئایا ئەم هەڕەشانە ڕاستن یانا ، وەك دەرئەکەوێ لەم فەرموودەیەوە کە ئەفەرموێ ( فستعلمون كيف نذير ) لەمەولا تێئەگەن کە هەڕەشەی ئێمە چۆنە ؟ واتە ئەگەر بمێننەوە لەسەر ئەم گومڕایی‌یە ، ئەوکاتە لە پاشەڕۆژی خۆتانو ڕاستیی ئەم هەڕەشانە ئەگەن •

هەرچەند زانایانی زانینی سروشتیی « علمی طبیعی » هۆی بوومەلەرزەو ڕۆچوونی زەویی‌و گێژەڵووکەیان دۆزیی‌وەتەوە ، بەڵام ئەمە بەرهەڵستی ئەوە ناکات کە خوا تۆڵەیان پێ‌بستێنێ لە گەلێك ، کە بێ‌فەرمانیی خوا بکەن ، وە بچن بەگژ پێغەمبەرەکەیاناو قسەکانی بەدرۆ بزانن ، هەردەمێك بە بوومەلەرزە ، گەلێکی بێ‌بڕوا لەناوچوو ، ئەڵێین خوا لەناوی‌بردن ، چونکە خراپ بوون ، با ئەو بوومەلەرزەیەش پەیدا بووبێ لە تەقینی گازو هەڵمێك کە کۆبووبێتەوە لەناو بۆشایی‌و کونو قوژبن‌و دووتوێی زەوی‌دا ، یا پەیدابووبێ لە ڕۆچوونی توێیەکی ژێرووی سستەك کە بووبێ بە مایەی ڕۆچوونی توێی سەرەوە •

ئەگەر ئەتەوێ ئەمەت زۆر جوان بۆ ڕوون‌بێتەوە ، ئەم داستانە بخوێنەرەوە : کە مەنصوری عەباسی ڕقی هەستا لە عبداللەی مامی

ویستی بی‌کوژێ ، بەڵام نەك بەڕەنگێکیوا کە کەس‌و‌کارو خزم‌و خوێشی پێ‌ی‌بزانن ، هات کۆشکێکی بۆ دروست کرد بناغەکەی لە کوڵۆ خوێ بوو ، وە لەوێدا بەندی‌کرد ، لەپاش چەند شەوێك بەدزی‌یەوە ئاوی کردە ژێر کۆشکەکەی‌و تەپی بەسەر ماميا ، وە بڵاوبووەوە کە مردنی مامی بەهۆی تەپینی بەندیخانەکە بووە بەسەریا ، دیارە ئەوی ئەم کابرایەی کوشت مەنصوری عەباسیی بوو ، بەڵام بەم‌ڕەنگەی کە ووتمان ، ئنجا لێرەدا ئەگەر بڵێین کابرا مرد لەبەر هۆیەکی سرووشتیی کە لە بناغەی کۆشکەکەدا پەیدابووە ڕاست‌ئەکەین ، وە ئەگەر بڵێین مەنصور کوشتی هەر ڕاست‌ئەکەین ، هەر بەم‌ڕەنگە لەم‌جۆرە شتانەی کە لە قورئانا هەیە کە ئەفەرموێ خوا فلان گەلی لەناوبرد بە بوومەلەرزە ، یا بە گێژەڵووکە ، یا بە شتێکی‌تری وا ، بەڵێ ئەمانە لەبەر هۆیەکی زانیارین ، بەڵام هەڵگرتنی ئەو بوومەلەرزەیە یا ئەو گێژەڵووکەیە ، یا ئەو لافاوە ، یا ئەو هەورە تریشقەیە ساڵەهای ساڵ بۆ ئەو گەلە ، لەوکاتەدا خۆڕایی نی‌یە .

بەڵێ ئەم زەوی‌یە ڕام‌و نەرم‌و شلە ، هێندی‌جار سەرکێش‌و چەمووش ئەبێ ، وە ئەکەوێتە تەکان خواردن ، بەڕەنگێك ئەگەر یەك دەقیقە بەوجۆرە بمێنێتەوە ، هەرچی کۆشك‌و خانوو هەیە هەمووی ئەڕووخێ ، وە هەرچی ئاوەدانی هەیە هەمووی ئەکا بە کەلاوە . وەیا گەردەلوول‌و گێژەڵووکە هەڵ‌ئەکات ، وە لە هەموو لایەکەوە تۆزو خاك‌و خۆڵ ئەهێنێ‌و ئەیدا بەسەر ئاوەدانی‌و کشت‌وکاڵا ، بەڕەنگێك ئەگەر بەوجۆرە چەند ڕۆژێك بمێنێتەوە هەرچی هەیە دای‌ئەپۆشێ ، لەم‌کاتانەدا ئادەمیی دەستەوسان دائەمێنێ

وَلَقَدْ كَذَّبَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ ، فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ؟(١٨)

بەڕاستیی ئەو (گەل)انەی کە لەپێش ئەمانا (پێغەمبەرانی ئێمەیان) بە درۆ ئەزانی ، چۆن بوو تۆڵەسەندنی ئێمە (لەوان) (١٨)

وەك جرجێك کـە لەناو قەفەسێکی پڕ لـــە ترس‌و بیمـا بێ ، هـــەر هەڵئەقونێ ، وە نازانێ چی بـکات •

بەڵێ ئادەمیی بۆ هێندێ شت بەدەسەڵاتە ، وە زاناو دانایە ، لەکاتی دڵنیـایی‌و حـــەسانەوەدا ، بیروباوەڕی خـۆی دەرئەبڕێ ، وە بـە هەریەکێك لـە بوومەلەرزە ، یا گێژەڵووکە ، یاهەورە تریشقە ، هۆیەك ئەدۆزێتەوە ، بەڵام ناتوانێ یەکێك لەمانە بێنێتەڕوو ، یا ئەگەر ڕوویدا جڵەوگیریی لێ بـکات ، یا بە لای کەمەوە خۆی لێ بپارێزێ ، بەڵـکو هەرچی بزانێ لـەم جۆرە شتانە لەوکـاتانەدا لەبیری ئەچێتەوە ، بەڵێ دەستەجڵەوی ئەم بوونەوەرە گەورەیە هـەر بەدەست خوایە ، هەرچەند شتێك ڕووبدات لەمانە ، چاك وایە بۆئادەمیی کـە ڕووبکاتە ئاسمان‌و لە خوا بپاڕێتـەوە ، وە بڵێ : « تبارك الذی بیدە الملك وهو علی کـل شیء قـــدیر » •

ئنجـا نموونەیەك ئەهێنێتەوە ، لـە سەرەنجامی گەلانی بێ‌بڕوای ڕابوردوو ، ئەفەرموێ ( ولقد كذب الذين من قبلهم ) بێ‌گومان ئـــەو گەلانەی کـە لەپێش ئەمانیشا بوون ، پێغەمبەرەکانی خـــۆیانیان بـــە درۆزن ئەزانی ، وەلەســەر بێ‌بڕوایی خۆیان مانەوە ، تا خوا گرتنی ، هەریەکەی بەجۆرێك ، وەکو ئەفەرموێ ( فكيف كان نكير ) چۆن بوو

أَوَلَمْ يَرَوْا إِلى الطَّيْرِ فَوْقَهُمْ صافّاتٍ وَيَقْبِضْنَ ،

ئایا تەماشای باڵندەناکەن بە ژوورسەریانەوە بە باڵ کراوەیی‌و هێنانەوەیەك ،

تۆڵەی سەختو سزای قورس‌و گرانی ئێمە بۆئەوان ؟ واتە ئەوەبوو کە هێندێکیان بە بەردەبارانو ، هێندێکیان بە بوومەلەرزەو ، هێندیکیان بە هەورەتریشقەو ، هێندێکیان بە خنکان لەئاوا لەناووم‌بردن وە کردمن بە واتەی ڕۆزگار ، وەك هەموولا ئەیزانن ، کەواتە دڵگیرو نائومێد مەبە ئەی پێغەمبەری خوا لە سەرکێشیی گەلەکەت ، چونکە ئەگەر هەروا بمێننەوە ئەمانیش لەناو ئەبەم .

★ ★ ★

ئاێستا بە شێوەی هەڕەشەو ترساندن قسەی لەگەڵ بێ‌بڕوایانا کرد ئنجا داوای ووردبوونەوەو بیرکردنەوەیان لێ ئەکات لە هێندێك دروست‌کراوی خوا ، ئەفەرموێ ( اولم یروا الی الطیر فوقهم ) ئایا تەماشای باڵندەی ژوورسەری خۆیانیان نەکردووە ( صافات ) بە باڵ کراوەیی (ویقبضن) وەگاگا ئەیهێننەوە یەك ، لەگەڵ ئەمیشە کە ئەم باڵندانە قورسن ، وە بەپێی دەستووری باوی جیهان هەرچیش قورس بێ ئەبێ بکەوێتە خوارەوە بۆسەر زەویی ، بەڵام خوا بەمیهرەبانیی

ما يُمْسِكُهُنَّ الاَّ الرَّحْمانُ اِنَّهُ بِكُلِّ شَيءٍ بَصير (١٩)

ڕای‌نەگرتوون (بەو ئاسمانەوە) خوا نەبێ ، کە ئەو بە هەموو شتێك بینایە (١٩)

خـوّی دەستوورو باوێـکی‌تری داناوە بۆ باڵندە کـە بەپێی ئـەو دەستوورە بفرێ‌و بکەوێتە حـەوا ، بە بێ کەوتنە خوارەوە ، وە ماوەی زۆر ببڕن بۆ پاسی ژیان‌و مانەوەی گیـانی خۆیان‌و هاوتەحریان ، وەکو ئەفەرموێ ( ما یمسکهن الا الرحمان ) کەس ئەمانەی ڕانەگرتووە لـە حەوادا خوای میهرەبان نەبێ ، بۆئەوەی کـە بتوانن بەئاسانیی هاتوچۆ بـکەن‌و پێ‌بژیوی خۆیان پەیدا بـکەن ، ئەمەش بۆ خوا دوور نی‌یە ، چونکە ( انه بکل شیء بصیر ) ئەو خوایە بە هەمووشتێك داناو بینایە ، وە هەموو شتێکی‌وا دروست کردووە کە بمێنێ ، وە ئاگاداریی مانەوەی خۆی‌و هاوتەحری خۆی بـکات .

ئەگونجێ هێندێ تێ‌نەگەیشتوو بڵێ : لەپاش فڕۆك دروست‌کردن‌و فڕینی ئادەمیی ، ئیتر فڕینی باڵندە نرخی نەمـا ، بەڵام ئەگـەر وورد بنـەوە تێ‌ئەگەن کـە ئەمیش هـەر لە فڕینی باڵندەوە دۆزراوەتەوە ، وە ئەمیش هـەر نیشانەی گەورەیی خوایە ، کـە ئەم دەستوورو باوانەی داناوە ، کـە هەروەخت دۆزرانەوەو لەیەك‌دران ، فڕۆکـێکی دە پانزە بیست تەنی بفڕێ ، کەوابوو دەستوورو باوی فڕینەکە هەر هی خوایە ، بەڵام ئەوەندە هەیە ئادەمیی بەزیرەکیی خۆی لـە قوتابخانەی باڵنـدەدا

أم مَّنْ هذا الَّذی هُوَ جُنْدٌ لَکُمْ یَنْصُرُکُمْ مِنْ دُونِ الرَّحْمان !؟

ئایا ئەوەی کە لەشکرو یارمەتیدەری ئێوە بێ بە بێخوا کێ بێ ؟!

دەستوورەکەی دۆزیوەتەوە ، وە لەبەر ئەم سەرمەشقە فرۆکی دروست کردووە .

لەپاش ئەوەی کە بێبڕواکانی ترساند لەپێشەوە بە بوومەلەرزەو گەردەلوول ، کە بە یەکەمیان ئەگونجێ بە ناخی زەویدا بچنە خوارەوەو بە دووهەمیان هەرچی دەغڵودانو شینایییان هەیە ووشك بێ ، وە بە بێڕۆزیی بمێننەوە ، ئنجا هات باسێکی گەورەیی و دەسەڵاتی خۆی کرد بە دانانی دەستوورو باوی فڕینی باڵندە ، وە فەرمانیدا بە لێووردبوونەوەی ، ئنجا گەڕایەوە سەر هەڕەشەکانی پێشووی فەرمووی ( ام من هـذا الذی هو جند لکم ) ئایا ئەوە کێ بێ ئەوکەسەی کە بە پشتیوانو لەشکری خۆتانی ئەزانن ( ینصرکم من دون الرحمان ) یارمەتیتان ئەدات بە بێخوا ، لە کاتی بوومەلەرزەو ڕۆچوونتان بە زەوییدا ؟ واتە ئەم گوێ نەدانەتان وائەگەیەنێ کە لەشکرێکی پشتیوانو یارمەتیدەرتان لەپشتەوە بێ ، ڕزگارتان بکات لەوجۆرە تەنگانانە ، لەگەڵ ئەمیشە کە کەسیواتان نییە کە بتوانێ ڕزگارتان بکات ، بەڵام مەردومی بێبڕوا

اِنِ الْکافِرونَ اِلاّ في غُرورٍ (٢٠) أم مَّنْ هذا الَّذی یَرْزُقُکُمْ اِنْ اَمْسَكَ رِزْقَهُ !؟ بَلْ لَجُّوا في عُتوٍّ وَنُفُورٍ (٢١)

بێبڕواَیان هــەر لە فریبخواردنان (٢٠)ئایا ئەوە کێ بێ ئەگــەر خــوا ڕۆزیی خــۆی بــگرێتەوە لێتان ئەو بتوانێ ڕۆزیتان بداتێ ؟ بەڵــکو (بەئارەزوو) درێژەیان دا بە سەرکێشیی‌و دوورکەوتنەوە ( لــە ڕێی ڕاست ) (٢١)

شەیتان هەڵی‌ئەفریوێنێ ، وەکو ئەفەرموێ ( ان الکافرون الا في غرور ) بێبڕوایان هەمیشە لــە فریبخواردنان ، وە زووبەزوو خوایان لــەبیر ئەچێتەوە •

( ام من هذا الذی یرزقــکم ان أمسك رزقه ) ئایا ئەمــە کێیە ئەو کەسەی کــە ڕۆزیتان ئەدات ، ئەگــەر خوا ڕۆزیی خۆیتان لێ بگرێتەوە بە ووشــك‌کردنی دەغڵ‌ودانتـــان ، بەهۆی بێ بارانیی ، یا گەرمـــاو تەپوتۆزەوە ؟ واتــە خوا نەبێ کەسی‌تر نی‌یە کــە ڕۆزیتان بدات ، بەڵام بێبڕوا لاســارو بەدەمارە ، وەکو ئەفەرموێ ( بل لجوا في عتو ونفور ) بەڵــکو درێژەیان دا بە سەرکێشیی‌و دوورکەوتنەوە لە ڕێی ڕاست •

★ ★ ★

ئنجـــا نموونەیەکمــان بۆ ئەهێنێتەوە بۆ جیــاکردنەوەی حــاڵی خواپەرستی بەڕاستیی ، لەگــەڵ ئەوانەی کــە هاوبەشی بۆ پەیدا ئەکەن ، وە ســەرگوزشتەی شتی نەبینراومــان بۆ ئەکــات لــە پەردەی بینراوا ،

اَفَمَنْ یَمْشی مُکِبّاً عَلی وَجْهِهِ أَهْدی ؟! أم مَنْ یَمْشی سَوِیّاً عَلی صِراطٍ مُسْتَقیمٍ ؟ (٢٢)

ئایا ئەوکەسەی بڕواو بەدەما بکەوێ باشتر ڕێدەرئەکات ؟ یا یەکێك کە قنجو قیت بڕوا بەسەر ڕێگایەکی ڕاستو ڕەوانا ؟ (٢٢)

ئەفەرموێ ( أفمن یمشی مکبا علی وجهه اهدی ) ئایا یەکێك بە کۆمیی‌و دەمەونوخونیی بڕوا ، وە هەمیشە هەڵەنگوێ‌و سەرسم بدات لەبەر تاریکی یا چاڵو چۆڵیی ڕێگا ، ئایا ئەمە چاکترو باشترە لە ڕۆینا ( أم من یمشی سویا علی صراط مستقیم )یا ئەو کەسەی کە بڕوا بە ڕێك‌وپێکیی لەسەر ڕێگایەکی ڕووناکی ڕاستو ڕەوان ، واتە ئەوانەی کە بتپەرستن ، وە هاوبەش بۆ خوا پەیدا ئەکەن ، وە ژیریی‌و تێگەیشتنی خۆیان بەکار ناهێنن بۆ دۆزینەوەی ڕێی ڕاست ، وەك ئەو کەسانەی کە بە ڕێگایەکی خوارو خێچو چاڵوچۆڵا بڕۆن ، وە هەمیشە نووچبەرنو ، لەپەوڕوو بکەوون ، وە ئەوانەی کە خواپەرستن ، وە بە ڕووناکیی ژیریی‌و بیر ، ڕێی ڕاست ئەدۆزنەوە ، وە لە دەستوورو باوی خوا لانادەن ، وەك ئەوکەسانە وان کە ڕاست‌وڕەوان بە ڕێگایەکی بێقۆرتو گرێدا بڕۆن ، دیارە هەموو کەس ئەزانێ کە ئەم دوانە هەرگیز نابن بە یەك .

★ ★ ★

لەپاش ئەوەی کە خوا منەتی نا بەسەر بەندەگانی خۆیا کە ئاسمانی بە ئەستێرە بۆ جوان ، وە زەویی بۆ ڕام‌کردوون ، ئنجا

قُلْ : هوَ الَّذى اَنْشأكُمْ وَجَعَلَ لكُمُ السَّمْعَ وَالاَبْصارَ وَالاَفْئدةَ قَليلاً ما تَشكُرونَ (٢٣)

بلّێ : هەر خوایە کـە دروستی‌کردوون ، وە گوێ‌و چـاوو دڵی پێ‌داوون ، کـەم سوپاس (ی ئەم ئەندامانە) ئەکەن (٢٣)

منەتیان ئەنێ بەسەرا کـە دروستی کردوون‌و هێناونی‌یە جیهانەوە ، وە هـەرچی مایەی ڕێ‌دۆزینەوە بێ پێ‌ی‌داوون ، لە چاوو دڵو گوێ ، نـە بەهرەیان لێ وەرگرتن ، وە نە سوپاسی خـوایان لەسەر کـردن ، ئەفەرموێ (قل) بلّێ ئەی محمـد لـە دەمکوتکردنی ئـەو بێ‌بڕوایانەی کـەوا هەرمانەوە لەسـەر بێ‌بڕوایی : ئایا نازانن ئـەو خوایەی کـە بانـگتان ئەکـات بۆ بڕواهێنان ( هو الذی انشأکم ) هەر ئەو خوایەیە کە دروستی کردوون و هێناونی‌یە جیهـانەوە ( وجعـل لـکم السمـع ) وە گوێ‌ی بۆ دروست کردوون ، تا ئامۆژگاریی‌و قسـەی ڕاستی پێ ببیەن ( والابصار ) وە چـاوی پێ داوون ، تا تەماشای دروست‌کراوانی خوای پێ بـکەن ( والافئدة ) وە دڵی پێ‌داوون تا پێ‌ی ووردبینەوە لـە هـەموو شتێك ، بەڵام ئـەم بەهرانەتان هەموو کوێر کردەوە ، نـە ئەوی ئەی‌بێن وەری‌ئەگرن ، وە نـــە ئـەوی ئەی‌بیستن پەندی لێ وەرئـەگرن ، وە نە ووردئەبنەوە لـەو شتانەی کـە تێ‌ی‌ئەگەن ، وەکو ئەفەرموێ ( قلیلا مـا تشکرون ) زۆر بەدەگمەن سوپاسی ئەم بەهرانە ئەکەن ، وە چاوو گوێ‌و ژیریی‌و بیر لەو شتانەدا بەکاردێنن کە خوا فەرمانی پێ‌داوە •

★ ★ ★

قُلْ : هوَ الَّذی ذَرَأَکُمْ فِي الْاَرْضِ ، وَاِلَیْهِ تُحْشَرونَ (٢٤)

هەر خوایە کە ئێوەی بڵاوکردۆتەوە لە زەوییدا ، وە هەر بۆلای ئەو ئەگەڕێنەوە (٢٤)

بەڕاستی ئادەمیی بەرزترو زاناترو بەدەسەڵاتترین گیاندارە کە هاتۆتە سەر زەویی ، دیارە کە ئادەمیی خۆی خۆی دروست نەکردووە ، وە ئەبێ یەکێك دروستی کردبێ کە گەلێ گەلێ لە خۆی بەرزترو زاناترو بەدەسەڵاتتر بێ ، کە ئەویش خوایە ، وەکو ئەفەرموێ (قل) بڵێ : ئەو خوایەی کە بانگتان ئەکات بۆ بڕواهێنان ( هو الذی ذرأکم في الارض ) هەر ئەو خوایەیە کە دروستی کردوون بەزۆریی ، وە بڵاوی کردوونەتەوە بەسەر زەوییدا ، تا بە دەردو نەخۆشیی‌و جەنگ‌و گرانیی قڕنەبن •

لێرەدا ئەگونجێ بە دڵی مەردوما بێ بڵێ : ئەم هەموو ئادەمیی‌یەی کەوا بەسەر زەوییدا بڵاوبوونەتەوە ، ئایا خوا بتوانێ لە ڕۆژی دواییدا هەموویان کۆبکاتەوە ، ئنجا لە وەڵاما ئەفەرموێ ( والیە تحشرون )هەر بۆ لای ئەو خوایە ئەگەڕێنەوە لە ڕۆژی دواییدا ، تا پاداشی گوفتارو کرداری خۆتان بەتەواویی وەرگرن •

لەپاش ئەوەی کە فەرمووی هەموو کەسێك لە ڕۆژی دواییدا ئەگەڕێتەوە بۆلای خوا ، ئنجا قسەی بێ‌بڕواکان ئەگێڕێتەوە دەربارەی

وَيَقُولُونَ : مَتَى هذا الْوَعْدُ انْ كُنْتُمْ صادِقِينَ ؟ (٢٥) قُلْ : اِنَّمَا الْعِلْمُ عِنْدَ اللهِ ، وانمَّا اَنَا نَذِيرٌ مُبِينٌ (٢٦)

( بێبڕواكان بەگاڵتەوە ) ئەڵێن : ئـەم بەڵێنە ( بـە هاتنی ڕۆژی دوایی ) كەی ئەبێ ئەگەر ڕاست ئەكەن (٢٥) بڵێ : زانینی ئەوڕۆژە هـەر لای خوایە ، وە من هەر ترسێنەرێكی ئاشكرام (٢٦)

ئەوڕۆژە ، ئەفەرموێ ( ويقولون متى هذا الوعد ) بێبڕواكان بەگاڵتـەوە ئەڵێن : ئەوە كەیە ئەوڕۆژی زیندوو بوونەوەیەی كە بەڵێنی پێئەدەن ؟ ( ان كنتم صادقين ) ئەگـەر ڕاست ئەكـەن ، ئنجـا خوا بـە پێغەمبـەر ئەفەرموێ ( قل ) پێیان بڵێ ( انما العلم عند الله ) زانینی ئەوڕۆژە هـەر لای خوایە ، وە كەس نازانێ كەی ئەبێ (وانما انا نذير مبين ) وە مـــن هەر ترسێنەرێكی ئاشكرام ، واتە ئەتانترسێنم بە هاتنی ئەوڕۆژە ، ئیتر نە من ئەزانم كەی دێو نە یەكێكیتر ، هەروەك پێویستیش نییە بـە زانینی ، بەڵـكو هـەر ئەوەندە پێویستە مـەردوم كـە بزانێ ئەگـــەر گوناهێك بـكات ، دووچاری سزاو لێپرسینەوە ئەبێ لەوڕۆژەدا ، وە هەر ئەوەندەش بەسە بۆ گەڕانەوەی مەردوم لە گوناه •

ئنجـا باسی ئەو چۆنێتییەمان بۆ ئەكات كـە بەسەر بێبڕوایانا دێ

فَلَمَّا رَأَوْهُ زُلْفَةً سِيئَتْ وُجُوهُ الَّذِينَ كَفَرُوا ، وَقِيلَ : هذا الَّذى كُنْتُمْ بِهِ تَدَّعُونَ (٢٧)

کاتێك کە بێبڕوایان ئەو سزایەیان بەدیی‌کرد لەنزیك خۆیانەوە ، ڕوخساریان تاڵ‌ئەبێ ، وە (پێیان) ئەووترێ : ئەمەیە ئەو (ڕۆژە)ی کە داواتان ئەکرد (٢٧)

لەوکاتەدا کە چاویان بە ڕۆژی دوایی ئەکەوێ ، ئەفەرموێ : ( فلما رأوه زلفة ) ئنجا کاتێك کە ئەو سزایەیان بەدیی‌کرد لەنزیك خۆیانەوە ( سیئت وجوه الذین کفروا ) تاڵ‌ئەبێ ڕوخساری ئەوانەی کە بێبڕوا بوون ، واتە هاتنی ئەوڕۆژە بە خۆیو تۆڵەو سزایەوە ، خەمبارو خەفەتباریان ئەکات ، وە ڕەنگی دەموچاویان ئەپەڕێ بەوێنەی ئەو پیاوکوژانەی کە ئەبرێنە بەر سێدارە بۆ هەڵواسین ( وقیل هذا الذی کنتم به تدعون ) وە پێیان ئەووترێ ئەمەیە ئەو ڕۆژەی کە بەگاڵتەوە داواتان ئەکرد لە پێغەمبەرکەتیشانتان بدات .

★ ★ ★

پێغەمبەر هەمیشە ئامۆژگاریی بێبڕواکانی ئەکرد ، وە ئەی‌ترساندن بە سزای ڕۆژی دوایی ، هەروەك هێندێ‌جاریش ئەی‌ترساندن بە تۆڵەو سزا لە جیهاندا ، ئەوانیش هێندێ جار گاڵتەیان پێ ئەکرد ، وە هێندێ جاریش بە قرەقرِ قسەکانیان پێ ئەبڕی ، بەڵام پێغەمبەر هەر دەستی هەڵ‌نەئەگرت‌و کۆڵی‌نەئەدا ، بەمە بێبڕواکان

قُلْ : أَرَأَيْتُمْ إِنْ أَهْلَكَنِيَ اللهُ وَمَنْ مَعِيَ أَوْ رَحِمَنَا ، فَمَنْ يُجِيرُ الْكَافِرِينَ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ؟ (٢٨)

بڵێ : ئا پێم بڵێن ئەگەر خوا ، من و ئەوانەی لەگەڵمان لەناومان ببات یا میهرەبانیمان لەگەڵ بکات ، کێ پەنای بێ‌بڕوایان ئەدات لە سزای سەخت ؟ (٢٨)

وەڕس بووبوون ، هیچیان بۆ نەمابووەوە ئەوە نەبێ ، نزایان لە پێغەمبەر ئەکرد کە زوو بمرێ ، یا بەیەکتریی‌یان ئەووت دان بەخۆتانا بگرن تا ئەمرێ ، ئەوکاتە ڕزگارمان ئەبێ لە دەستی ، ئنجا خوا پێی ئەفەرموێ (قل) پێ‌یان بڵێ ( أرأيتم ) ئا پێم‌بڵێن ئەی بێ‌بڕواینە ( ان اهلكني الله ومن معي ) ئەگەر خوا من و ئەو موسلمانانەی کە لەگەڵمان ، لەناومان ببات ( أو رحمنا )یا میهرەبانیمان لەگەڵ بکات‌و بمان‌هێڵێتەوە ، ئێوە لەکوێ ڕزگارتان ئەبێ لە سزای ڕۆژی دوایی ، واتە با ئێمەش بمرین ، کە پیاوی بێ‌بڕوا لەسەر بێ‌بڕوایی خۆی مایەوە ( فمن يجير الكافرين من عذاب اليم )کێ ڕزگاری ئەکات لە سزای سەختی خوا ، واتە ئەی بێ‌بڕواینە ، خوا منی بۆ پێ‌نیشاندانی ئێوە ناردووە ، کە دەستوورو باوی جیهانتان تێ‌بگەیەنم ، وە باسی ڕۆژی دوایی‌تان بۆ بکەم ، کەوابوو چۆن نزای ئێوە گیرا ئەکات لە من‌و لە هاوڕێکانم ، وە چۆن لەناومان ئەبات بۆ ئێوە ؟ لەپێش ئەوەی کە ئایینی ڕاست‌و دروستی خۆی سەربخات‌و بڵاوبکاتەوە ، نەخوازەلا کە ئێمە بڕوامان

قُلْ : هوَ الرَّحْمانُ آمَنَّا بِهِ ، وَعَلَيْهِ تَوَكَّلْنا ، فَسَتَعْلَمُون مَنْ هُوَ فِي ضَلالٍ مُبِينٍ ؟ (٢٩)

بڵێ : هەرئەوە خوای بەخشندە کە بڕوامان پێهێناوە ، وە هەر بەو پشتمان بەستووە،لەمەولا ئەزانن کە کێ لە گومڕاییەکی ئاشکرادایە(٢٩)

پێهێناوە ، وە هاوبەشی بۆ پەیدا ناکەین ، وە پەئامان هەر بەوە ، وە پشتیوانمان هەر ئەوە ، وەکو ئەفەرموێ (قل) بڵێ ( هو الرحمان ) هەر ئەوە بەخشندە (آمنا به) بڕوامان پێهێناوە ( وعليه توكلنا ) وە هەر بەو پشتمان بەستووەو ئەنجامی کاری خۆمان سپاردووە ، کەوابوو چۆن ئێمە بۆ ئێوە لەناوئەبات ؟ وە چۆن ڕاستئەداتە دەست درۆ ؟ بەڵکو خوا دینی خۆی زاڵئەکاتو سەرئەخات ، وەکو ئەفەرموێ ( فستعلمون من هو في ضلال مبين ) ئنجا بەمزووانە ئەزانن کام لە ئێمەو لە ئێوە لە ڕێی ڕاست لایداوە ، وە گومڕاو سەرگەردانە ، وە کامیشمان لەسەر ڕێیڕاستین ، وە زووبەزوو ئەگەینە قۆناغ ، واتە بەمزووانە ئێوە ئەڕووخێن ، وە ئێمە زاڵ ئەبین بەسەرتانا ، وە دەستووری ئیسلام بڵاو ئەبێتەوە .

★ ★ ★

لەدوای ئەم هەموو هەڕەشانەی کە کردیی ئنجا بەهرەیەکی خواییان بیرئەخاتەوە کە مایەی ژیانە ، کە ئەویش ئەو ئاوەیە کە

قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ أَصْبَحَ مَاؤُكُمْ غَوْراً ، فَمَنْ يَأْتِيكُمْ بِمَاءٍ مَعِينٍ ؟ (٣٠)

بڵێ : ئا پێم‌بڵێن ئەگەر ئاو (ی‌خواردنـــەوە)تان ڕۆبچێ ، کێ ئاوی زوڵاڵتان بۆ ئەهێنێ ؟ (٣٠)

لەژێر زەوی‌یەوە بۆیان دەردێنێ بەهۆی کانی‌و کارێزەوە ئەفەرموێ (قل) بڵێ ( أرأیتم) ئا پێم‌بڵێن ئەی بێ‌بڕواینە (ان اصبح ماؤکم غورا ) ئەگەر ئاوی خواردنەوەتان ڕۆبچێ بە ناخی زەویی‌دا ( فمن یأتیکم بماء معین ) کێ‌ی‌تر هەیە بێجگە لە خوا کە ئاوی زوڵاڵتان بۆ بنێرێ ؟ دیارە هەموو ئەڵێن خوا نەبێ کەسی‌ترمان نی‌یە ، کەوابوو هاوبەشی بۆ پەیدا مەکەن ، وە هەر ئەو بناسن‌و بی‌پەرستن ٠

# سورة القلم

بسم الله الرحمن الرحيم

## سو ورەی ( قەڵەم )ە

**بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

## سوورەی (قەڵەم)ە

**مەککی‌یە ، ٥٢ ئایەتە ، ٣٠٠ ووتەیە ، ١٢٥٦ پیتە**

بسم الله الرحمن الرحيم

**بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

وەك لــە سەرەتای سوورەی «اقرأ»ەوە باسمان کردووە ، پێغەمبــەر یەکــەم جار لــە ئەشــکەوتی حــراء سرووشی بۆ هــات ، وە فریشتــەی سرووشی دیی ، زۆر ترسی لێ نیشت ، وە بەدەم لەرزەوە گەڕایەوە بۆ ماڵــەوە ، دایان‌پۆشی ، تا هێواش بۆوە ، لەپاشا چی دیی‌بوو گێڕایەوە بۆ خەدیجە خاتوونی خێزانی ، وە پێ‌ی‌فەرموو زۆر ئەترسم ، خەدیجە زۆر دڵخۆشی دایەوە ، وە هــەڵی‌گرت‌و بردی بــۆلای «وەرەقە»ی کــوڕی «نەوفەل» ـ کــە قەشەیەکی زۆر پیرو شارەزا وە ئامۆزای خەدیجە بووە پێ‌ی ووت : ئامۆزا گوێ‌بـــگرە لــەم برازای خۆتە بزانـــە چی‌ئەڵێ ، پێغەمبــەریش قسەکــەی بۆ گێڕایەوە ، ئەویش ووتی : مەترســەو دان بەخۆتا بــگرە ئەوی قسەی لەگەڵ کردوویت ئەو جبریلە بووە کــە

ن

---

ن

---

لەپێش تۆدا سرووشی بردووە بۆ پێغەمبەرەکانی‌تر ، بەم ڕەنگە قسەکە بڵاوبووەوە ، وە بێ‌بڕواکانی مەککە بڵاویان کردەوە کە محمد شێت بووە ، ئنجا خوا دڵخۆشی پێغەمبەر ئەداتەوە بە سەرەتای ئەم سوورەتە ، وە سوێندی بۆ ئەخوات بە قەڵەم‌و نووسین کە تۆ شێت نیت ، بەڵکو زۆر زیر ، وە خاوەنی ڕەووشت‌وخوویەکی تێجگار بەرزیت ، وە لەم ڕێگایەدا هەر ڕەنجێك بدەیت پاداش ئەدرێیتەوە ، بەجۆرێك کە هەرگیز لە بڕانەوە نەیەت ، ئەفەرموێ (ن) •

نوون ناوی پیتێکە لە بیست‌وهەشت پیتەی عەرەبی ، بیست‌ونۆ سوورەت لە قورئانا سەرەتاکەیان دامەزراوە بە پیتێك ، یا بە دوو ، یا بە سێ ، یا بە چوار ، یا بە پێنج پیت • لە سەرەتای سوورەی «بقرە»وە ـ کە بە «الم» دەست‌پێ‌ئەکات ـ باسی ئەم پیتانەمان کردووە ، وە مەبەسەکەیمان لێداوەتەوە ، ئیتر پێویست بە ووتنەوە نی‌یە لێرەدا ، بەڵام وادیارە «ن» لێرەدا سەرەڕای ئەو مەبەستەی کە لێمان داوەتەوە لەم جۆرە پیتانە بەتێکڕایی ، خۆشی مەبەستێکی تایبەتیی تیایە ، وەك ئەبومسلمی ئەیسابووریی ئەڵێ : مەبەس لە «ن» مەرەکەبێکی زۆر ڕەشە کە زانایانی کیمیا لە جۆرە ئەهەنگێك دەری‌ئەهێنن ، ئنجا کە مەبەس لە «ن» مەرەکەب بوو ، دروستە مەبەس لە مەرەکەبیش دوێت بێ ، وەك شێخ حسنی بەصری ئەفەرموێ ، ئنجا ئەوکاتە دوێت‌و مەرەکەب‌و قەڵەم‌و نووووسین کۆئەبنەوە لە سەرەتای ئەم سوورەتەوە •

لە پێ‌ناسەکان «تعریفات»ی سیددا ئەڵێ : «پیتی نووسین وێنەی زانینە (واتە زانین لە کاڵای پیتا خۆی نیشان‌ئەدات) وە هەرچی پیتیش

وَالْقَلَمِ

سوێندبە قەڵەم

هـەیە بەکورتی لە مەرەکەبا هەیە ، واتە هەروەك وێنەی دارگوێزێـکی گـەورە بە خۆیو لقوپۆپو بەرو ڕەگو ڕیشەیەوە ، لـەناو توێکڵە گوێزێـکا هەیە ، هەرچی زانینو زانیاریش هەیە بەوجۆرە هـەمووی لەناو مەرەکەبا هـەیە ، کـەواتە مەبەس لە «ن» سەرچاوەی زانین ، وە پوختەو پاڵاوتەی هەموو جۆرە زانستیەکە •

( والقلم ) وە سوێند بە قەڵەم •

لە زۆر جێگە لە قورئانا خوا سوێند ئەخوات بە کات ، یا بە شوێن ، یا بە هێندێ شتی‌تر ، بەپێی باو سوێند کـە بخورێ بۆ بەهێزکردنەوەی سوێند لەسـەر خوراوە ، بەڵام بەشی زۆری سوێند لە قورئانا بۆ بێـدار کردنەوەی مەردومە لەسەر کەڵكو ڕێزو نرخی سوێند پێ خوراوەکە ، وەك لـە سـوورەی «عصر»دا کـە سوێند ئەخوات بە کات ، بۆئـەوەی نیشانبدات کـە کـات ، لـە هەمووشت بەنرخترە ، وە نابێ مەردوم بە بێهوودە لە دەستی بدات •

شێخ محمد عبده لە تەفسیری سوورەی «نازعـات»دا ئەفـەرموێ : ئەو شتانەی کە خوا سوێندیان پێ ئەخوات :

١ ـ یا شتێکن کـە هێندێ کەس بڕوایان پێ نی‌یە ، وەك ڕۆژی

دوایی‌و قورئان ، کـه بەو سوێند پێخواردنە نیشان‌ئەدات کە یەکەمیان بێ‌گومانەو ئەبێ ، وە دووهـەمیان فەرموودەی خوایە ، لەگـەڵ ئەمیشە کـە گـــەورەیی‌یان نیشان ئەدات بەم ڕەنـگە کــە یەکەمیان ڕۆژی خۆشبەختی یا بەدبەختی ئادەمی‌یە ، وە دووهەمیان پەندو ئامۆژگاری‌یە ؛ وە هەر پەندێـکی دەرمانی دەردێـکە .

٢ ـ یا شتێکن کـە مەردوم بە بێ‌نرخیـان ئـەزانن وەك قـەڵەم‌و مەرەکـەب‌و نووسین لـەم سـوورەتەدا ، وە شـەوو ڕۆژو مانـگ‌و ئەستێرەو زەویی‌و گەلێ شتی‌تر لـە سوورەتەکانی‌ترا ، ئنجا بەو سوێنـد پێخواردنە ، بێدارمان ئەکـاتەوە ، کـە لێ‌یان ووردبینەوە ، وە لـــە قازانج‌و سوودیان بـگەین ، تا بـە چـاوی سووك‌و بێ‌نموود تەماشایان نەکەین ، وە بەهرەیان لێ وەرگرین .

٣ ـ یا شتێکن وەك ئەستێرە کە هێندێ کەس بە خوایان ئەزانن ، وە بەلایانەوە وایە کـە هەموو شتێك هــەر ئەوان ئەیکەن لەم جیهانەدا ، ئنجا خوا لەکاتی سوێند پێخواردنیانا جۆرە سیفەتێکیان پێوە ئەنێ کـــە نیشان‌ئەدەن کە خوا نین ، بەڵـکو دروست‌کراوێکی ئەوون ، وەك لـە سوورەی «نازعات»و «تکویر»دا .

بەڕاستیی سوێنـد خواردن بـە قەڵەم ، سوێندە بـە گەورەترین بەهرەی خوا بەسـەر ئادەمی‌یەوە ، لەدوای بەهرەی زبان‌و قسە کردن ، چونـکە ئادەمیی بـە زبان لـە هـەموو گیاندارێـکی‌تر جیـائەبێتـەوە ، بە قەڵەمیش هەرچی زانین‌و زانیاریی‌و دەستوورو یاساو شەریعەت هەیە

وَ ما يَسْطُرُون (١)

وە بە نووسینی دێڕ (١)

هــەمووی بڵاوئەبێتەوە ، کەوابوو ئەگــەر قــەڵەم نەبوایە ، هیچ شتێك لەمانە نەئەبوو •

هەروەخت بتەوێ لە گەورەیی‌و بەرزیی گەلێك بگەیت ، وەرە تەماشای نووسین‌و شتی نوسراوی ئەو گەلە بــکە ، تا ئەمانەی زۆرتر بێ ، ئەوە نیشانەی بەرزی‌یەتی ، وە تا ئەمانەی کەمتر بێ ، ئەوە نیشانەی پەستیی‌و نزمی‌یەتی ، چونــکە بەڕاستیی هــەر نووسین‌و نوســراوە ، ترازووی قورسیی‌و سووکیی‌و بەرزیی‌و نزمیی گــەلان ، وە هــەر نووسین‌و نوســراوە ، کــە پایەی گــەلان بەرزئەکــاتەوە ، وە هــەر نووسین‌و نوسراوە ، کــە گەلان ئەباتە ڕیزی پێشەوە ، وە لەگــەڵ گەلانی زیندووی خواپێداوا ، ڕاستیان ئەکاتەوە •

مەبەست لە قەڵەم ، ئەو پارچەدارە ، یا ئەو تەنەکەیە نی‌یە ، کــە پێ‌ی ئەنوسرێ ، بەڵــکو مــەبەس قەڵەمــە لــەمڕووەوە کــە مەبەست‌و بیــروباوەڕ لــە دڵی یەکــێکەوە ئەگــەیەنێ بە دڵی یەکــێکی‌تر ، وەك دەرئەکەوێ لــە سوێندی سێهەمەوە ، کــە ئەفەرموێ ( ومــا یسطــرون ) سوێند بەو دێڕانەی کــە نووسەر ئەیان‌نووسێ •

خوا سوێند ئەخوات بە پیشەی نووسین بە هەموو جۆرێکی‌یەوە ، بە قەڵەم بێ ، بە چــاپ بێ ، بە «تایپرایتەر» بێ ، یا بە هــەر شتێــکی‌تر بێ ، کە لەمەولا دادێ ، بەڕاستی ئەم ئاوەدانیی‌و شارستانی‌یەی کە ئیمڕۆ

ما اَنْتَ بِنِعْمَةِ رَبِكَ بِمَجْنونٍ (٢)

تۆ لەسایی بەخشش خواوە شێت نیت(٢)

مـەردومی سەرسام کردووە ، بەرێـکە لـە بەرەکانی پیشەی چـاپو مەکینەی چاپ لە گورجیو جوانییو ڕێكو پێکیدا .

خوای گـەورە سوێندی خـوارد بە قەڵەمو مەرەکەبو نووسین بۆئەوەی دەرگای خوێندنو خوێندەوارییو نووسین بکاتەوە لە ئادەمی ، وە هانەهانەیان بدات لەسەری ، وە نیشانیان بدات کە ئەمانە مایەی ژیانی گەلن ، وە پەیژەی سەرکەوتنن بۆ سەر لوتکەی خۆشییو کامـەرانیی . ئەم سوێندخواردنی خوایە بەمانە ، لەجێی سەدهەزار لاپەڕە دائەنیشێ ، کـە ڕەش بکرێتەوە لەبابەت قازانجو سوودی قەڵەمو مەرەکەبو کاغەزو نووسینو چاپەوە ، ئەگینا ئەگـەر مەبەس ئەمە نەبێ کە خوای گەورە بەمشێوەیە بێدارمان بـکاتەوە ، وە ئەمانەمان بدا بە گوێچکەدا ، کـــە تا چـەندە بەکەڵكو بەهرەو پیرۆزن ـ ئەبێ قەڵەمو نووسین چی بێ کـە خـوای گـەورە سوێنـدیان پێ بخوات ، بەڵام ئـەم دەستوورە قورئان دایهێنـاوە ، هـەر شتێك کـە زۆر زۆر بەکـەڵكو بەقازانج بێ بۆ ئادەمیی ، خوا سوێندی پێ ئەخـوات ، تا بەو سوێنـدە وەك سیخورمـە دامان بچڵەکێنێو ئاگادارمان بکاتەوە ، تا لێی ووردبیینەوە ، وە بە چاوی ڕێز تەماشای بـکەین ، وە لە مەبەستەکەی خـوا بـگەین ، بەڵام داخی گرانم هێندێ کەس تێ ناگەن لە مەبەستەکەی قورئان ، وە بەم سوێندانە پێکەنینیان دێ ، واتە سوێند بەمانە ( ما انت بنعمة ربك بمجنون )تۆ لـە

وَاِنَّ لَكَ لأَجراً غَيْرَ مَمْنونٍ (٣)

وە بێ‌گومان پاداشی بێ‌بڕانەوە هەیە بۆ تۆ (٣)

سایەی بەخششی خواوە شێت نیت ، واتە پێغەمبەرێك دەرگـای زانین‌و خوێندەواریی بـکاتەوە لەکۆمەڵی ئادەمیی ، وە قورئانەکەی لە یەکـەم سـرووشیا ـ کـە سـەرەتای سـوورەی «اقرأ» ـ باسی خوێنـدن‌و خوێندەواریی‌و زانین‌و قەڵەم بـکات ، وە لە دووهەم سرووشیا ـ کـە سەرەتای ئـەم سوورەتەیە ـ باسی قەڵەم‌و دوێت‌و مەرەکـەب‌و نووسین بـکات ـ چۆن شێت ئەبێ ؟

واتە ئەی پێغەمبەری خوا ، بەم جۆرە قسانە دڵت سارد نەبێتەوە ، چونـکە هەموو پێغەمبەرێك ، وە هەموو پیاوێـکی گەورەی هەڵکەوتوو لـەناو گەلێـکی پەست‌و نەخوێنـدەوارو بێ‌ڕەووشت‌و خـوودا ، وەك تۆ ئازارو سزا ئەدرێ ، وە بوختـان‌و قسـەی درۆی بۆ هەڵئەبەسترێ ، وە هـەزار شتی ناشرینی بۆ ئەدۆزرێتەوە ، کەوابوو سـارد مـەبەرەوە ، وە هـەوڵ‌و تەقەلای خۆت بدە تا ئاینی پاکی ئیسلام بلاوئەکەیتەوە ، وە بەتەواویی دەرگای زانین‌و زانستی ئەخەیتە سەر گازی پشت ، وە لـەم ڕێـگایەدا هەموو ئازارو سزایەك هەڵبگرە ، چونـکە لەپاش ئەوەی کە بناغەی ئیسلامەتیت دامەزراندو کۆمەڵی ئادەمیت کرد بە برا ، وە خوات پێ‌ناسین‌و خستنە سـەر ڕێی ڕاست‌و دروست لە هەردو جیهانا ، ئیتر هـەر بڕوایـەك بهێنرێ بـە خوا ، وە هـەر چاکـەو خواپەرستی‌یەك بکرێ ، بەشێکی تۆی تیایە تا ڕۆژی دوایی ، جگە لـەو پاداشە کـە خواش ئەیڕێژێ بەسـەرتا ، وەکو ئەفەرموێ ( وان لك لأجـرا غیر ممنون ) بۆ تۆ هـەیە لـە لای خـواوە پاداشی بێ‌بڕانـەوە ، وە

وَ إِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ (٤)

وە بەڕاستیی تۆ لەسەر ڕەووشتو خوویەکی ئێجگار گەورەیت (٤)

هەرکەسێکیش کە شایستەی پاداش بێ لە ڕۆژی دواییدا بەرامبەر بەکردەوەی چاكو ، هەوڵو تەقەلای پاك ، دیارە کە شێت نییە ، چونکە شێت شایستەی هیچ جۆرە پاداشێك نییە •

توخوا یەکێك بە ناشتنی درەختێك کە مەردوم لەژێر سێبەرەکەیا دانیشێ ، یا بە لێدانی کارێزێك کە گیانداریك ئاوی لێ بخواتەوە - خێری بگات ، ئەبێ خێری پێغەمبەر لای خوا چەند بێ ، وە چۆن بێ بەرانبەر بەم هەموو هەوڵو تەقەلایەی کە داویتێ ، وە بەم ئاینە پاكو تەمیزەی کە هێناویتی ؟ وە بەرامبەر بەمەی کە ئەمە هەزارو چوارسەد ساڵە ، هەزاران ملیۆن مەردومی لە خراپە گێڕاوەتەوە ، وە هێناونییە سەر ڕێی چاکەو خواپەرستیی ؟ وە هەمووی کردوون بە برای یەك ، وە جیاوازیی هەڵگرت لەناویانا ، وە خوای پێناسین ، وە دەرگای زانینو نووسینی لێ کردنەوە ، وە بە هەزاران زانستگای کردەوە لە جیهانا ، وە بە ملیۆنەها خوێندەوارو زاناو فەیلەسووفو پیشەوای تیا هەڵکەوت •

واتە کەسێك وابێ چۆن پێی ئەڵێن شێت ، لەگەڵ ئەمیشە کە بە شەهادەتی دۆستو دوژمن ، ژیرترینی مەردوم ، وە خاوەنی ڕەووشتو خوویەکی ئێجگار بەرزیش بێ ، وەکو ئەفەرموێ ( وانك لعلی خلق عظیم ) تۆ بەڕاستیی لەسەر ڕەووشتو خوویەکی ئێجگار

گـەورەو بەرزیت ، بەڕەنـگێك کـە لەپێش پێغەمبەرێتی‌یەوە ناوی دەرکرد بە محمدامین ، وە لـــە شـاری مەککەدا هـــەرچی پارەو نەختینەیەکی ببوایە ئەیبرد بۆلای ئەو کە بۆی هەڵگرێ ، تا ئەوشەوەی کـە کۆچی کرد بۆ مدینە ، امامی علي بەجێ‌هێشت لـە جێـگاکەی خـۆی ، تا ئـەو سپاردانە « أمانتـــانە »ی کـــە لەلایەتی بیانداتەوە بە خاوەنەکانی ، وە بەوکەسانەی کە پێ‌یان ئەووت : شێت •

لێرەدا قسەیەکی زۆر گرنگ هـەیە ئەویش ئەمەیە کە پێغەمبەر خۆی نەخوێندەوار بووە ، نەیتوانیوە نـە بنووسێ‌و نە بخوێنێتەوە ، وە ئەمـە شتێکی ئاشکرا بووە لای هەموو دانیشتووانی مەککە ، لەپاشا کە بوو بە پێغەمبـەر ، یەکـەم سرووش «وحی» کـە بۆی هـات ئایەتی « اقرأ وربك الاکرم الـذی علم بالقلم » بوو ، لەپاش ئـەو ئایەتی « ن والقلم وما یسطرون » بوو ، کـە هەردووکیان لەڕووی منەتنانەوەیە بەسـەر ئادەمیی‌دا ، بە بەهرەی نووسین‌و قەڵەم ، وە هەردوو ئایەتەکە نەنـگی ئەوکەسانە ئەگەیەنێ کە نووسین‌و قەڵەمیان نی‌یە ، وە نیشـان ئەدات کـە ئەوانە ، ناتەواوو بێ‌بەهرەن لـەمڕووەوە ، ئنجـا توخـوا ئەگـەر ئەم پێغەمبەرە لـە خـواوە نەبێ ، ئەگونجێ یەکەم سرووش‌و دووهەم سرووشی بە تەعریفی شتێك بێ کـە لەخۆیا نەبێ ، کـە وابوو دەرکەوت کـە ئەمـە لـە خواوەیە ، وە ئەم پێغەمبەرە پێغەمبەرێـکی ڕاستەقینەیە کـە نەیتوانیوە دەستکاریی سرووش بـکات ، ئەگینا ئـەم دوو سرووشەی وون‌ئەکرد ، لەگـەڵ ئەمیشە ئەبێ ئەوە بزانن کـــە نەخوێنـدەواریی‌و نەزانینی نووسین ئەگـەر بۆ یەکـێکی‌تر نەنـگ بێ ، بۆ پێغەمبەر گـەورەیی‌و بەرزی‌یە ، وە گـەورەترین معجزەیە لەسـەر پێغەمبەرێتی‌یەکەی ، هەروەك قورئان لـە لایەکی‌ترەوە ئەمـە ئەگەیەنێ ، کـە ئەفەرموێ « وما کنت تتلو مـن قبله من کتـاب ، ولا

فَسَتُبصرُ وَيُبْصِرونَ (٥) بِايِّكُمُ الْمَفْتونُ (٦) انَّ رَبَّكَ هو اَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبيلِهِ ، وَهوَ اَعْلَمُ بِالْمُهْتَدينَ (٧)

بەم‌زووانە تۆش‌و ئەوانیش ئەبینن (٥) کە کامتان شێتن (٦) بێ‌گومان پەروەردگاری تۆ ، لە هەمووکەس داناترە بەوەی کە لایدابێ لە ڕێی ڕاستی ئەو ، وە زاناترە بەوانەی کە ڕێی ڕاستیان گرتبێ (٧)

تخطه بيمينك اذاً لارتاب المبطلون »(١) .

واتە ئەی محمد کاتێك کە بە ئاواتی خۆت گەیشتییت ، وە ئاینی ئیسلامت بلاوکردەوە ، ئەوکاتە تۆش‌و ئەوانیش تێ‌ئەگەن کە کێ شێتە ، وەکو ئەفەرموێ ( فستبصر ويبصرون ، بايكم المفتون )بەم زووانە ئەبینیت ئەی پێغەمبەر ئامانجی کاری خۆت ، هەروەك ئەوانیش بە چاوی خۆیان ئامانجی کاری خۆیان ئەبینن ، وە هەر دوولا ئەوکاتە تێ‌ئەگەن کە کامتان شێتن ، واتە ئەوڕۆژە دەرئەکەوێ کە پێغەمبەر ژیر ، وە بێ برواکان بێ‌ژیرن .

لێرەدا مزگێنی هەیە بۆ پێغەمبەر ، کە بەم‌زووانە بە ئاواتی خۆی ئەگات ، هەروەك هەڕەشەی تیایە بۆ بێ‌برواکان ، کە بەم‌زووانە چاویان بە خۆیان ئەکەوێ ، هەر بەم ڕەنگە ئەم ئایەتەش هەر هەڕەشەیە لەوان ، کە ئەفەرموێ ( ان ربك هو اعلم بمن ضل عن سبيله ) بێ‌گومان پەروەردگاری تۆ لە هەموو کەس زاناترە بەوکەسەی کە ڕێی ڕاستی خوای وون‌کردبێ ( وهو اعلم بالمهتدين )وە ئەو

(١) واتە لەمەپێش لەوانە نەبوویت کە هیچ جۆرە نامەیەك

فَلا تُطِعِ الْمُكَذِّبِينَ (٨)

فەرمانبەریی ئەوانە مەکە ، کە قسەکانت بە درۆ ئەزانن (٨)

زاناترە بەوکەسانەی کـە ڕێی ڕاستیان گرتبێ ، واتە خوا خۆی ئەزانێ کـە ڕێی پێغەمبـــەر ڕاستـــە ، یا ڕێی بێبڕواکـــان ؟ وە پاداشی هەردولایەکیان ئەداتەوە بەو پاداشەی کە شایستەی بن •

★ ★ ★

وەك لەپێشەوە باسمان کرد ئەم سوورەتە لە سەرەتای ئیسلامەتی‌یەوە هاتۆتە خوارەوە ، لەوکاتەدا پێغەمبەر هەرچەند هەر خۆی بووە بەتەنها ، وە خـــوا نەبێ کەسی‌تری لەگـــەڵ نەبووە ، وە گەورەکانی قورەیش نەخوازەلا «ولیـد»ی کوڕی «مغیرە» هـەموو دەولـەمەندو دەست‌دارو زۆردار بوون ، بەڵام چونـکە درۆ بەرانبەر بەڕاست ناتوانێ بوێستێ ، وە خاوەنەکـەی هەمیشە هـەر ئەترسێ ، گـەورەکانی قورەیش ، بـەدڵ حەزیان ئەکرد ، ئەگـەر پێغەمبەر ئەوەندە ناوی بتەکانیان نەبات بە خراپە وە جڵەوگیریان نەکات لە پەرستنی بتەکانیان ـ ئەوانیش ئەوەندە ئازاری خـۆی‌و هاوڕێـکانی نەدەن ، بەڵـکو هێنـدێ ئادابی ئیسلامەتیشیان لێ وەربگرن ، لەم ڕووەوە گەلێك هاتوچۆیان کرد ، دەمێ بۆ لای پێغەمبەرو دەمێ بۆ لای ئەبوتالیبی مامی ، ئیتر نازانین ، لەمدەمــەدا چی بــە دلی پێغەمبەردا هاتووە ، تاوەکو ئەم ئایەتانەی دوایی بۆ بێتە خوارەوە ، کـە پێی ئەفەرموێ ( فلا تطع المكذبين ) فەرمـانبەریی ئەوانە مەکـــە کـــە

بخوێنییتەوە ، وە هیچ شتێك بنووسییت بە دەستت ( ئەگینـا بەدکاران ئەوکـــاتە لێت ئەکەوتنە گومـــانو دوودڵی‌یەوە ( وە قورئانیان بە دەست‌کردی تۆ ئەزانی ) •

وَدّوا لَوْ تُدْهِنُ فَيُدْهِنُونَ (٩)

حەزیان ئەکرد کە تۆ نەرمیی نیشان‌بدەیت ، (ئەوان) نەرمیی ( لە گـەڵ تۆدا ) ئەکەن (تا تۆش نەرمیی لەگەڵ ئەوانا بکەیت) (٩) •

قسەکانت بە درۆ ئەزانن ، وە درۆت ئەدەنە پاڵ لە دانیشتووەکانی مەککە ( ودوا لو تدهن ) ئەوان حەزیان‌ئەکرد کـە تۆ نەرمیی بکەیت لەگەڵیانا وە ئەوەندە بانگیان نەکـــەیت بۆ ئادابی ئیسلامـــەتی‌و جڵەوگیری‌یان نەکەیت لـە هێندێ کردەوەی ئاینی خۆیان ، ئەوحەلە ئەوانیش نـەرم‌و شلیت لەگـەڵ ئەکـەن لە هێندێ لەوشتانەی کـە داوای کردنیـان لێ ئەکەیت ( فیدهنون ) ئەوان لـە ئێستاوە ئامادەن لەسـەر نەرمیی کردن لەگەڵ تۆدا ، تا تۆش نەرمیی بـکەیت لەگـەڵ ئـەوانا ، واتـە ـ وەك لەپێشەوە باسمان‌کرد ـ ئەوان بە تۆ ئەڵێن شێت ، وە قسەکانت بە درۆ ئەزانن ، کەوابوو تۆ چۆن بڕوایان پێ ئەکەیت ؟ وە چـۆن پشت بـە بەڵێنیان ئەبەستیت کـە گۆیا بڕوا بێنن بە هێندێك شت لە ئاینی ئیسلام ؟ وە ئەگـــەر تۆزێك دەستەجڵەویان بۆ شل‌کـــەیت ئەوکـــاتە پەلپی شتی‌تریشت لێ ئەگرن ، وە هەر ڕۆژەی جۆرە شتێکت داوا لێ‌ئەکەن ، تا ســـەرت لێ تێك‌ئـەدەن ، وە نرخـی قسەکـانت ناهێڵن ، واتـــە ئەوان بێ‌بڕوان ، وە خاوەنی بیروباوەڕ نین ، ئەوان ئەتوانن ســەودا لەگـەڵ تۆدا بکەن ، وە دەست لـە هێنـدێ شتی خۆیان هەڵـگرن ، بەڵام تۆ خـاوەنی بیروباوەڕیت ، ناتوانیت دەست لـە هیـچ شتێك هەڵگریت لـە ئاینەکەت با بچووکیش بێ •

ئەم ئامۆژگاری‌یەی قورئان لە جوانترین‌و بەرزترین ئامۆژگاری‌یە بۆ سەرۆکی گەلان ، کە بە قسەی کەس هەڵنەخەڵەتێن ، وە لـە مافی خۆیان‌و گەلیان یەك تۆز نەیەنە خوارەوە ، لەسەر بەڵێنی ئەم‌و ئەو .

★ ★ ★

لەپاش ئەوەی کـە خـوا بـە پێغەمبەری فەرموو بـە شێوەیەکی تێکرایی کـە فەرمانبەریی درۆزنەکانی مەککە مەکە ، ئنجا ئەفەرموێ بەتایبەتیی فەرمانبەریی تاقە یەکـێکیان هـەیە مەیکە ، کـە ئەویش دە خووی زۆر پیسی تیا کۆبۆتەوە ، کە لەمەولا یەك‌بەیەك باسیان ئەکات ، کـە زۆر بەدەگمەن لـە یەکـێکی‌ترا کۆئەبێتەوە ، کـە ئەویەکـەش «ولید»ی کوڕی «مغیرە»یە ، کـە یەکێك بووە لە سەرۆك‌و گەورەکانی قورەیش ، وە زۆر دەوڵەمەندو زۆردارو دەستدرێژو یاخی‌و بێ‌شەرم‌و دووزبان‌و دەم‌پیس‌و دڵ‌پیس‌و دڵ‌ڕەق بووە ، بە ئاشکراو بە پەنهـانیی ناوی پێغەمبـەری بردووە بە ناشرینی ، وە کوڕو خـزمی زۆری بووە ، هەرچەند یەکێکیان بی‌ویستایە مسڵمان ببێ ، خێرا هەڕەشەی لێ ئەکرد کـە ئەگەر مسڵمان ببێ ، بێ‌بەشی ئەکـات لـە ماڵ‌و لە دارایی‌یەکەی ، بەڵام‌لەگەڵ ئەمەی کـە مەبەس لـەم درۆزنە تاقە یەکێکە کەچی هـــەر وتەی «کل» ـ کە بۆ تێکڕایی‌یە ـ خستی‌یە سەری بۆئەوەی هـەرچی کەسێ وا بێ ، بەربکەوێ فەرمووی :

وَلا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَهِينٍ (١٠) هَمَّازٍ مَشَّاءٍ بِنَمِيمٍ (١١)

فەرمانبەریی مەکــە بۆ هیچ سوێندخۆرێــکی ڕیسوا (یدرۆزن) (١٠)
نەنگ‌گری ئامشۆکەر بۆ قسەهێنانو بردن (١١)

١ ـ ( ولا تطع كل حلاف ) فەرمانبەریی هیچ کەسێك مەکـە کـە سوێند بە درۆ ئەخۆن ، وە هەموو شتێ هەر بە سوێندی درۆ ئەبەنەسەر •

سوێندخواردنی درۆ بە ناوی خوا ، گاڵتەکردنە بە خواءیەکێك نرخی خوای خــۆی بزانێ سوێندی بێناخوات ، نە بە ڕاستو نــە بە درۆ ، کەسێك زۆر سوێند ئەخوات ، کە خۆی بە درۆزن بزانێ ، وە بزانێ کە مەردوم پێی باوەڕ ناکەن ، وە قسەی نرخی نییە لە گوێچکەیانا •

٢ ـ (مهين) پەستو ڕیسواو بێنمــوودە ، چلای خــۆیو چلای مەردوم ، بۆیە لەســەر هەموو شتێك سوێند ئەخوات تا بڕوای پێبکەن ، ئنجا لەمە پەستترو بێنرختر ئەبێ کێ بێ ؟

٣ ـ (هماز) زۆر نەنگ‌گرە ، لـــە مەردوم ، واتە بــە سووکیو ناشرینی ناویان ئەبات ، یا ناوو نەتۆرەیان لێ دادێنێ ، یا بە سەرو چاو ، یا بە دەستو زبان گاڵتەیان پێئەکات •

٤ ـ ( مشاء بنميم ) ئامشۆکەرە لەناو مەردوما بە قسە هێنانو قســە بردن ، واتە قسەی ئــەم بۆ ئەوو قسەی ئەو بۆ ئــەم ئەگێڕێتەوە بۆ تێك دانیان ، کەسێك تۆزێك نرخی ببێ ، نابێ ئەم خووەی ببێ •

مَنَّاعٍ لِلْخَيْرِ مُعْتَدٍ اَثِيمٍ (١٢) عُتُلٍّ بَعْدَ ذلِكَ زَنِيمٍ (١٣) اَنْ كانَ ذا مالٍ وَبَنِينَ (١٤)

زۆر جڵەوگیر لە چاکە ، ستەمکاری گوناهکار (٢) دڵڕەقی کەللەشەق دوای ئەوە زۆڵ (١٣) ( فەرمـــانبەریی مەردومی وانەکـەیت هـەر ) لەبەرئەوەی کە خاوەنی دارایی‌و کوڕی زۆرە (١٤)

٥ ـ ( مناع للخير ) زۆر جڵەوگیرە لە چاکە ، نەخوازەلا لـــە بڕواهێنان بە خوا ، وە زۆر ڕژدو چرووکە لەگەڵ هەژارانا •

٦ ـ ( معتد ) زۆردارو ستەمکارو دەستدرێژە لەگەڵ مەردوما •

٧ ـ ( اثیم ) زۆر گوناهبارە ، لە هیچ شتێك ناسڵەمێتەوە •

٨ ـ ( عتل ) زۆر خۆرێـکی ، چاوبرسیی ، تووڕەی ، زبـری ، کەللەشەقی ، خرابی ، ناپاکی ، دڵڕەقی ، یاخی ، بێڕەووشت‌و خووە •

ئەم ووتەیە ئەم هـــەموو مەبەستەی تیایە ، وابزانم لـــە هـــەموو ووتەیەکی عەرەبی زۆرتر ڕەووشت‌و خووی ناشرین ئەگەیەنێ •

٩ ـ ( بعد ذلك زنیم ) لەدوای ئەمانە هەمووی ، ئنجا زۆڵیشە •

ئەگێڕنەوە کـە «ولیـد» باوکی شەرعی نەبووە ، وە لە تەمـــەنی هەژدە ساڵیدا باوکی ووتوویەتی ئەمـە لە منە ، واتـــە فەرمانبـــەریی مەردومی‌وا پیس‌و بۆگەن مەکە ، هەر لەبەرئەوەی ( ان كان ذا مـــال وبنين ) کە دەوڵەمەندو کوڕی زۆری هەیە •

اذا تُتلى عَلَيْهِ آياتُنا قالَ : أساطيرُ الأوَّلينَ (١٥) سَنَسِمُهُ عَلَى الْخُرْطُومِ ( ١٦ )

که ئایەتانی ئێمەی بەسەرا بخوێنرێتەوە ئەڵێ : (ئەمانە) **قسەی پڕوپووچی** پێشینانە (١٥) زوو پۆزەی داخ ئەکەین (١٦)

١٠ ـ ( اذا تلى عليه آياتنا ) کە ئایەتانی ئێمەی بەسەرا بخوێنرایەتەوە ( قال اساطير الأولين ) ئەڵێ : ئەمە قسەی پڕوپووچی پێشینانە •

لەپاش باسی ئەم دە پیشە پیسەی «ولید» لە پەردەیەکی تێکڕایی‌دا ئنجا ئەفەرموێ ( سنسمه على الخرطوم ) زوو ئەدەین بە پۆزەیاو داخی ئەکەین ، واتە ئەیکەین بە پەندی ڕۆزگار ، وەك یەکێك کە سەری لووتی داخ کرێ بۆ ڕیسواکردنی ، واتە یەکێك ئەمەندە خراپ بێ لەگەڵ پێغەمبەرەکەیا ، وە ئەمەندە خاوەنی ڕەووشت‌و خووی پیس‌و ناشرین بێ لەناو مەردوما ، شایستەی ڕیسواکردنە تا ڕۆژی دوایی ، بەڕاستی وابوو وەك قورئان فەرمووی ، دوای دە دوانزە ساڵ ، لە جەنگی «بدر»دا شیرێك بەر سەری لووتی کەوت ، تا ما ئەو نیشانەیە بەسەر لووتی‌یەوە بوو ، وە بۆی بووبوو بە نەنگیکی گەورە[١] وە

(١) وەرگیراوە لە کتێبی ( النبأ العظيم )ی دوکتۆر محمد عبدالله دراز•

اِنَّا بَلَوْنَاهُمْ كَمَا بَلَوْنَا اَصْحَابَ الْجَنَّةِ

ئێمە تاقیمان کردنەوە هەروەك لەمەپێش خاوەنانی ئەو باخەمان تاقی کردەوە ،

نەفرینێکی تێجگاریی بەسەر شانا دادروو ، وە تا قورئان بخوێنرێتەوە ، ئەم نەفرینەش ئەووترێتەوە •

مەبەس لەم ئایەتە دڵخۆشی دانەوەی پێغەمبەرە ، وە تێ گەیاندنێتی کە بەتەمای موسڵمانبوونی ئەم جۆرە کەسانە نەبێ ، وە خۆیان پێوە خەریك نەکات ، وە هەووڵنەدا بۆ ڕازیی کردنیان •

★ ★ ★

ئنجا بەبۆنەی باسی ماڵو منالی زۆری «ولید»و یاخیبوونییەوە ، سەرگوزوشتەیەکمان بۆ ئەگێڕێتەوە کە ئەویش سەرەنجامەکەی هەر یاخی بوون بووە ، ئنجا وامان بۆ ئەگێڕێتەوە هەروەك خۆمان لەگەڵیان بووبیین وایە ، ئەفەرموێ ( انا بلوناهم ) ئێمە بێبڕواکانی مەککەمان تاقی کردەوە بە گرانییو برسێتی ( كما بلونا اصحاب الجنة ) هەروەك لەمەپێش خاوەنانی باخەکەمان تاقی کردەوە ، کە مەککەییەکان خۆیان ئەیزانن ، وە هەمیشە داستانەکەیان گێڕاوەتەوەو ئەیگێڕنەوە : کە پیاوێکی باش بووە باخێکی دار خورمای بووە ، هەموو ساڵێك لە کاتی ڕنینیا ، هەژارانی دێیەکەی کۆکردۆتەوە وە هەریەکە بەشێکی باشی داونەتێ ، لەپاشا کە کابرا ئەمرێ ، کوڕەکانی نایانەوێ بەشی

اذْ أقْسَموا : لَیَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحینَ (١٧) وَلا یَسْتَثْنونَ ( ١٨ )
فَطافَ عَلَیْها طائِفٌ مِنْ رَبِّكَ وَهُمْ نائِمونَ (١٩)

کە (بە شەو) سوێندیان خوارد کە لە بەیانا (بەرەکەی) بڕنن (١٧)
(تا هەژاران ئاگایان لێ نەبێ) بێ ئەوەی کە بەشی هەژاری لێ دەرکەن
(١٨) ئنجا گرەیەك لە خوای تۆوە سووڕایەوە بەسەر کێڵگەدا (لەکاتێکا)
کە ئەوان نوستبوون (١٩)

هەژارەکانی لێ دەرکەن ، لەبەرئەوە لەناو خۆیانا بڕیار ئەدەن کە بەیانیی لەگەڵ شەبەقا ـ کە هەژاران نوستوون ـ بچن باخەکەیان بڕنن ، وەکو ئەفەرموێ ( اذ اقسموا ) کاتێك کە لە شەوا سوێندیان خوارد ( لیصرمنها مصبحین )کە لە دەمی بەیانا بەرەکەی بڕنن ، تا هەژارەکان ئاگایان لێ نەبێ ( ولا یستثنون ) وە بەشی هەژارەکانیان لێ دەرنەکرد ، واتە بڕیاریان نەدا کە بەشی هەژارانی لێ بدەن .

ئنجا با لێرەدا خاوەنەکانی باخەکە بەجێ بێڵین ، وە بزانین خوای هەژارەکان چی لەم دڵڕەقانە ئەکات ، لە تاریکی شەوا کە ئەوان نوستوون و خوا بێدارە ، بێ گومان هەزاران هەزار شتی کوتوپڕی لە خەزێنەی غەیبی خوادا هەیە ، کە لە تاریکی شەوا ، ئەیانێرێ ، وە دەست ئەکەن بە هاتوچۆ ، وەکو ئەفەرموێ ( فطاف علیها طائف من ربك وهم نائمون ) ئنجا وەشومەیەك لەخواوە سووڕایەوە بەسەر

فَأَصْبَحَتْ كَالصَّرِيمِ (٢٠) فَتَنَادَوْا مُصْبِحِينَ (٢١) أَنِ اغْدُوا عَلَى حَرْثِكُمْ إِنْ كُنْتُمْ صَارِمِينَ (٢٢)

ئەوسا وەك باخێكی ڕنراوی لێ هات (٢٠) لە شەبەقدا بانگی یەكتری‌یان كرد (٢١) كە هەستن بچن بۆسەر باخەكەتان ، ئەگەر ئەتانەوێ بیڕنن (٢٢)

باخەكەدا ، لەكاتێكا كە خاوەنەكانی نوستبون ( فاصبحت كالصريم ) ئەوسا وەك باخێكی ڕنراوی لێ هات ، واتە هەرچی بەرێكی بوو هەمووی سووتاو كەوتە خوارەوە .

ئنجا با باخەكە بەجێ‌بێڵین بە سووتاویی ، وە بچین بەلای خاوەنە نوستووەكانیانەوە ، بزانین چی‌ئەڵێن‌و چی‌ئەكەن .

ئا ئەوە ئەوانن وا خەبەریان بووەوە لەتاریك‌و ڕوونی بەیانا ، وە بانگی یەكتریی ئەكەن بۆئەوەی پیلانەكەیان بەجێ‌بێنن ، وەكو ئەفەرموێ ( فتنادوا مصبحين ) لە شەبەقدا بانگی یەكتری‌یان كرد ( ان اغدوا على حرثكم ) كە هەستن تا بەیانی زووە بچن بۆسەر باخەكەتان ( ان كنتم صارمين ) ئەگەر ئەتانەوێ بیڕنن بەدزی هەژارەكانەوە .

ئیتر لێرەدا وەك خوا گاڵتەیان پێ بكات وایە كە ئەفەرموێ

فَانْطَلَقوا وَهُمْ يَتَخافَتونَ : ( ٢٣ ) اَنْ لا يَدْخُلَنَّها الْيَوْمَ عَلَيْكُمْ مِسْكينٌ (٢٤) وَغَدَوْا عَلى حَرْدٍ قادِرينَ (٢٥)

ئنجا کەوتنەڕێ ، وە ئەوان بە چرپە ئەیانووت : (٢٣) ئەمڕۆ هیچ هەژارێك نەیێ بەسەرتانا لەناو باخەکەدا (٢٤) دەمەوبەیان ڕۆین وایانئەزانی کە ئەتوانن بێبەشیان بکەن (٢٥)

( فانطلقوا ) ئنجا هەموو کەوتنەڕێ بۆسەر باخەکەیان بە خۆشی خۆشی ( وهم يتخافتون ) وە ئەوان بە چرپە بەیەکیان ئەووت ( ان لا يدخلنها اليوم عليكم مسكين ) کە ئاگادار بن نابێ ئەمڕۆ هیچ هەژارێك بێتە ناو باخەکەتانەوە •

ئێمە کە دەوری قورئانەکە ئەکەینەوە ، ئاگامان لە بەسەرهاتی باخەکەیە بەجۆرێك کە خاوەنەکانی ئاگایان لێ نی‌یە ••• بەڵێ ئەزانین کە خوا لە کاری خۆی بۆتەوە ، وە شەو گڕەی‌ناردووەو باخەکەی سووتاندووە ، کەواتە با خۆمان ماتبدەین بزانین ئەم دڵڕەقانە چی‌ئەکەن ؟ ئەفەرموێ ( وغدوا على حرد قادرين ) دوای ئەوەی کە ووتیانو ملی ڕێیان گرت ، وایانئەزانی کە ئەتوانن بەشی کەسی لێ نەدەن •

فَلَمَّا رَأَوْها قالُوا : انّا لَضالّون َ (٢٦) بَلْ نَحْنُ مَحْرومونَ ( ٢٧ ) قالَ أوْسَطُهُمْ :اَلَمْ اَقُلْ لكُمْ لَوْلا تُسَبِّحونَ (٢٨)

که باخەکەیان دیی (بەگڕە لێدراو) ووتیان : ئێمە ڕێمان وون‌کردووە ( وە ئەمــە باخەکــەی ئێمە نی‌یە ) (٢٦) نــەء بەڵــکو بەش‌بڕاوکراویین (٢٧) برا ناووونجی‌یەکەیان ووتی : مەگــەر پێم‌نەووتن ؟ بۆچ ســوپاسی خوا ناکەن ! (٢٨)

بەڵێ وا نزیکی باخەکە کەوتنەوە با بزانیین ئەڵێن چی ( فلمــا رأوها ) کاتێك کــە چاویان بە باخەکــە کــەوت کە هیچ بەری پێــوە نەمـــاوە ، وە هەمووی بــە گڕە گــەوتبووە خوارەوە ، باخەکـــەیان نەناسی‌یەوە ، وە ( قالوا انا لضالون ) ووتیان : ئێمە ڕێمان وون‌کردووە ، وە ئەمە باخەکەی ئێمــە نی‌یە ، لەپاشا کــە ووردبوونەوەو ناسی‌یانەوە ، ئنجا ووتیان ( بل نحن محرومون ) نەخێر ڕێمان وون‌نەکردووە بەڵـکو ئێمە بە سزای خوا بەش‌بڕاو کراین لە بەروبوومی باخەکەمان ٠

ئنجا لەم‌کاتەدا کــە بە بەری‌کردەوەی خۆیان گەیشتن ( قــال اوسطهم ) برا ناوونجێ‌کەیان ووتی ( الم اقل لــکم لولا تسبحون ) من لەپێشەوە پێم نەووتن بۆچ یادی خــواو سوپاسی ناکـــەن ، وە بــەشی هــەژارانی لێ دەرناکەن ؟ تا خواش پیت‌و بەرەکەتی تێ‌بخات ٠

ئێستا ، وە هــەر ئێستا ، ئەم ئامۆژگاری‌یە کــاریان تێ‌ئەکات ، کە

قالُوا : سُبْحانَ رَبِنَا ! انَّا کُنَّا ظالمِینَ (٢٩) فَاَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلى بَعْضٍ یَتَلاوَمونَ (٣٠) قالُوا یا وَیْلَنا ! انَّا کُنَّا طاغِینَ (٣١)

هەموو ووتیان : خـــوای ئێمـە خۆمان ستەمکار بووین (٢٩) ئنجـــا ڕوویان‌کردە یەکتریی بە سەرزەنشت (٣٠) ووتیان : ئەی وای بۆ خۆمان کە لە خوا یاخی بووین (٣١)

کار لە کار ترازاوە ، وەکو ئەفەرموێ (قالوا) هەموو بە پەشیمانی‌یەوە ووتیـان ( سبحان ربنا ) خوای ئێمـە دوورە لە ستەم ، بەڵام ( انا کنـا ظالمین ) ئێمـە خۆمان ستەمـمان لە خۆمان کرد ، کـە هـەژارەکانمان بێ‌بەش کرد خوای ئێمە دوورە لە ستەم ئێمە خۆمان بووینە

لەپاش ئەوەی کـە تێ‌گەیشتن ، وە دانیـان نا بە گوناهەکەیانا ، ئنجا دەستیان‌کرد بـە سەرزەنشتی یەکتریی ، وەکو ئەفەرموێ ( فاقبل بعضهم علی بعض یتلاومون ) ئنجا ڕوویان‌کردە یەکتریی بە سەرزەنشت ، ئەمیان ئەی‌ووت : ئەمـە بیروڕای تۆ بوو ، ئەویان ئەی‌ووت : نەخێـر تۆ ئەت‌ووت بەروبوومی باخەکەمـان کـەمەو بەشی خۆمـــان ناکـات ، سێهەمەکەیان پێ‌ی ئەووتن : ئێوە بە قسەکەی منتان نەکرد کە پێم‌ووتن : با وەك باوکمان بەشی هەژارانی لێ دەرکەین ، هەر بەمەش وازیان نەهێنا بەڵکو لێوی خۆشیان‌گەست ، وەکو ئەفەرموێ ( قالوا یاویلنا ) ووتیان : ئەی وای بۆخۆمـــان ( انا کنا طاغین ) بەڕاستیی ئێمە لـە خـوا یاخی بووین : بەم‌ڕەنـگە زۆر پەشیمان بوونەوە لـە کردەوەکەی خـۆیان

عَسى رَبُّنا أنْ يُبْدِلَنا خَيْراً مِنْها ، اِنّا اِلى رَبِّنا راغبونَ (٣٢) كَذلِكَ الْعَذابُ وَلَعَذابُ الاخِرةِ اَكْبَرُ ، لَوْ كانوا يَعْلَمونَ (٣٣)

ئومێدەوارین کە خوا لەجیاتی ئەو باخە باشترەمان بداتێ ، ئێمە (لەمەولا) هەر لە خوای خۆمان ئەپاڕێینەوە (٣٢) ئاوایە سزا (ی خوا لە جیهانا)وە سزای دوایی گەلێ گەورەترە ، خۆزگە بیانزانیایە (٣٣)

وە تۆبەیان کردو ووتیان ( عسى ربنا ) ئومێدەوارین کە پەروەردگارمان ( أن یبدلنا خیرا منها ) شتێکی باشترمان بداتێ لەجیاتی باخەکە ( انا الی ربنا راغبون ) بەڕاستیی ئێمە لەمەولا هەموو هیوایەکمان هەر بە خوای خۆمانە ، وە هەر لەو ئەپاڕێینەوە ، کە ئاووڕێکی باشمان لێ بداتەوە •

لەپێش ئەوەی پەردە دابداتەوە بەسەر سەرگوزەشتەکەدا ئەم هەڕەشەیە ئەکات ، ئەفەرموێ ( کذلك العذاب ) ئاوایە سزای خوا لە جیهانا بۆ ئەوکەسانەی کە لە فەرمانی دەرچن ( ولعذاب الاخرة اکبر )وە سزای ڕۆژی دوایی گەلێ سەختترە ( لو کانوا یعلمون ) خۆزگە یاخییان ئەمەیان بزانیایە ، تا بگەڕانایەتەوە لە یاخیتیی •

واتە لەلایەك خوا سزای خاوەنانی ئەو باخە بەوڕەنگە بدات لەسەر ئەو گوناهە بچووکەی کە کردیان ، ئەبێ سزای بێبڕوایانی مەککە چۆن بداتەوە کەوا لەسەر ئەم هەموو نازو خۆشییو دارایییەی کە

خوا بێ‌یداوون ، کەچی پێغەمبەرەکەیان بە درۆزن دابنێن ، وە ئازارو سزای بدەن ، وە لەسەر بێ‌بڕوایی خۆیان هەر بمێننەوە •

تەفسیرنووسەکان ئەڵێن ولیدی کوڕی موغەیرە ـ کە ئەم ئایەتانەی دەرحەق هاتوونەتە خوارەوە ـ زۆر دەوڵەمەندو دەستدار بووە ، تەنانەت باخاتێکی زۆری بووە ، بەدرێژایی لە مەککەوە تا «طائف» وە لەناو ئەو باخاتەدا باخێکی تایبەتی گەورەی بووە ، خێرو بێری لە هاوین‌و لە زستانا بووە ، بەڵام ئەمانە هەمووی لەناوچوون بەهۆی بێ‌بڕوایی ولیدەوە •

دانیشتووانی مەککەش ئەوەبوو کە حەوت ساڵ لەسەر یەك خوا تووشی گرانیی‌و برسێتی کردن ، بە ڕەنگێکی‌وا کە دەستیان‌کرد بە خواردنی لاکی تۆپیو ، لەپاشا لە غەزای «بدر»یشا هەرچی گەورەو سەرکۆمارەکانیان بوو کوژران یا بەدیل گیران •

لەم داستانەدا هەروەك هەڕەشەی تیایە بۆ بێ‌بڕواکانی مەککە کە ئەمەندە بێ‌بڕوا وە لەگەڵ پێغەمبەرەکەیانا خراپ نەبن ، هەروا هەڕەشەشی تیایە بۆ هەموو دەوڵەمەندێکی دەستداریی پارەدار ، کە لەگەڵ هەژارانا دڵڕەق نەبن ، وە هەموو ساڵێك لە داراییەکەیان بەشی خوای لێ‌بدەن •

★ ★ ★

بێ‌بڕواکانی مەککە هەموو دەوڵەمەندو پارەدار ، وە مسڵمانەکانیش هەموو هەژارو دەستکورت بوون ، ئنجا بەم‌بۆنەیەوە بێ‌بڕواکان هێندێ جارێ‌گاڵتەوە بە مسڵمانەکانیان ئەووت : ئەو ڕۆژی دواییەی کە

انَّ لِلْمُتَّقِينَ عِنْدَ رَبِّهِمْ جَنَّاتِ النَّعِيمِ (٣٤) اَفَنَجْعَلُ الْمُسْلِمِينَ كَالْمُجْرِمِينَ ؟ (٣٥) مالكم كَيْفَ تَحْكُمونَ ؟(٣٦)

بۆ پارێزگـــاران هـــەیە لای پەروەردگاریان باخاتی ( بەهـەشتی ) بەهرەدار (٣٤) ئایا ئێمــە مسلمانو بەدکاران وەك یەك لێ ئەكەین ؟ (٣٥) ئەوە چیتـــانە چۆن بڕیارێك ئەدەن ؟ (٣٦)

تیوە ئەیلێن ، ئەگەر ڕاست بێ ، لەوڕۆژەشا هەر ئێمە بەڕێزتر ئەبین لـە ئێوە ، چونکە هەر ئەو خوایەی کە ئێمەی لە جیهانا دەوڵەمەند کردووە ، لە ڕۆژی دوایشا جێـگا خۆشەکان هەر بە ئێمە ئەدات ، ئنجا خوا لـە وەڵاما ئەفەرموێ ( ان للمتقین ) بێ گومان ئەوانەی کـە لە ترسی خـوا خـــۆیان ئەپارێزن لە هەموو گوناهێك ، وە هـــەموو فەرموودەیەکی بەجێ دێنن ، بۆ ئەوان هەیە ( عند ربهم ) لای خوای خۆیان ( جنـــات النعیم ) باخاتی بەهەشتی پڕ لە بەهرەو خۆشیی ، وە ئـەم بەهـەشتە بۆ بەدکاران نیی یە ، چونـکە ئـەم دوانە لای خـوا وەك یەك نین ، وەکو فەرموێ ( افنجعل المسلمین کالمجرمین ) ئایا ئێمە مسڵمانانو بەدکـاران وەك یەك ڕائەگرین ، واتە مسڵمانێك کـە بڕوای بە خواو پێغەمبەر بێ ، وە خۆی بپـارێزێ لـە گوناه لـە ترسی خـــوا ، چـــۆن وەك بێ بڕوایەك تەماشای ئەکـەین ؟ وە دادی خوا چـۆن مـەیدانی شتیوا ئەدات ، کـە دۆستو دوژمنی خوا لە ڕۆژی دوایی دا وەك یەك وابن ( مالکم کیف تحکمون ) ئەوە چیتانە ! چۆن بڕیاری شتیوا ئەدەن کـە

أَمْ لَكُمْ كِتَابٌ فِيهِ تَدْرُسُونَ ؟ (٣٧) إِنَّ لَكُمْ فِيهِ لَمَا تَخَيَّرُونَ ! (٣٨) أَمْ لَكُمْ أَيْمَانٌ عَلَيْنَا بَالِغَةٌ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ إِنَّ لَكُمْ لَمَا تَحْكُمُونَ ؟ (٣٩)

---

یاخۆ نامەیەکی (ئاسمانی)تان بە دەستەوەیە ئەمەی تیا ئەخوێننەوە ؟ ( ٣٧ ) وە لەو نامەیەدا ڕێتان بۆدراوە چیتان بوێ ئەوە هەڵبژێرن بۆ خۆتان ؟ (٣٨) یا پەیمانی بەهێزتان هەیە لەگەڵمان تا ڕۆژی دوایی : کە هەرچی ئێوە بتانەوێ بتاندرێتێ (٣٩)

---

لە هەموو زیریی‌و بیریکەوە دوورە ؟ واتە ئایا شێت بوون کە قسەی‌وا ئەکەن ؟ کەوابوو هەرچی دەلیلی هۆش‌و بیر بێ بەدەستیانەوە نی‌یە •

ماوەتە دەلیلی نەقلی ، ئنجا ئەمیش ئەباتە دواوە ئەفەرموێ ( ام لکم کتاب فیه تدرسون ) ئایا نامەیەکی ئاسمانییتان بەدەستەوەیە دەرسی تیا ئەخوێنن ( ان لکم فیه لما تخیرون ) کە چیتان بوێ لە ڕۆژی دوایی‌دا ئەتوانن بۆ خۆتانی هەلبژێرن ، کە شتی‌واش نی‌یە •

کاتێك کە دەلیلی عەقلی‌و نەقلی نەبوو ، ئەمێنێتەوە دەلیلی ظنی واتە ئەوی بەدەستتانەوە مابێتەوە ، هەر گۆترەو گومانێکە ، کە گۆیا خوا بەڵێنی پێ‌دابن کە لە ڕۆژی دوایی‌دا بتانێرێتە بەهەشت لەگەڵ چاکان ، وە سوێندی بۆ خواردبن‌و دڵنیای کردبن ، کە ئەمەش نەبووە ، وەکو ئەفەرموێ ( ام لکم أیمان علینا بالغة الی یوم القیامة ) یاخۆ پەیمانی بەهێزتان هەیە لەگەڵمان کە ئەو پەیمانەش ڕەوابێ تا ڕۆژی دوایی ، بەمڕەنگە ( ان لکم لما تحکمون ) کە هەرچی ئێوە بتانەوێ

سَلْهُمْ : اَيُّهُمْ بِذلِكَ زَعِيمٌ ؟ (٤٠) اَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ ؟ فَلْيَأْتُوا بِشُرَكائِهِمْ

---

بپرسە لێیان (بزانە) کامیان زامنی ئەم قسەیەن (٤٠) یا ئەگەر هاوبیریان هەیە ( لەم قسەیەدا ) باهاوبیرەکانیان بێنن

---

بتاندرێتێ ، لەگەڵ ئەمیشە کە لەم ڕووەوە نە بەڵێن هەیەو نە پەیمان ، کەواتە ئەم قسانەتان لە چی‌یە ؟!

ئنجا ئەگەر هەر ئەڵێن ئەم پەیمانە هەیە (سلهم) لێیان بپرسە ئەی محمد ، بزانە ( أيهم بذلك زعيم ) کام لە سەرۆك و گەورەکانیان ئەم پەیمانەی بەستووە لەگەڵمانا .

ئنجا هیچ نەماوەتەوە بۆیان ئەوە نەبێ کە بڵێن : پێشینانمان وایان وتوە ، کە ئەمەش نی‌یە ، وەکو ئەفەرموێ ( ام لهم شركاء ) یا بێجگە لە خۆیان کەسی‌تری‌وا شك‌ئەبەن کە وەك ئەمان لەسەر ئەم‌بیرو باوەڕە بن ، وە بەلایانەوە وابێ کە لە ڕۆژی دوایی‌دا بڕوادارو بێ‌بڕوا وەك یەك ئەبن ، واتە ووردبنەوە بزانن ئایا لە زانایان‌و خوێندەوارانی بەرز کە لە فەلسەفەی ئاینەکانا شارەزان کەسی‌وا هەیە کە پشتیوانی‌تان بکات لەم بیروباوەڕەدا ، ئەگەر هەیە ( فليأتوا بشركائهم )با هاوبەش‌و هاوبیرەکانیان بێنن لەو ڕۆژەی کە لەمەولا

اِنْ كانوا صادِقينَ (٤١)

ئەگەر ڕاست ئەکەن (٤١)

باسی ئەکات بە ئایەتی «یوم یکشف عن ساق» (ان کانوا صادقین) ئەگەر ڕاست ئەکەن(١) .

(١) خولاسە هەرچی لەوانەبێ کە ئەو بێبڕوایانە لێرەدا دەستی پێ بکرن هەمووی بردەدواوە ، بەمڕەنگە بە ئایەتی « افنجعل المسلمین کالمجرمین »دلیلی عقلی بردە دواوە ، دیارە کە عەقل باوەڕ ناکا بەمە کە مسلمانو نامسلمان وەك یەك وابن ، وە چاكو خراپ لای خوا لە ترازوویەکا بن ·
به ئایەتی « ام لکم کتاب فیه تدرسون »دلیلی نقلی بردە دواوە، واتە هیچ نامەیەکی ئاسمانیتان بەدەستەوە نییە کـە بلێ : کوێ خۆشە لە بەهەشتا بۆ ئێوەیە ·
که دلیلی عقلیو نقلی نەبوو ، مایەوە دلیلی ظنی ، کە گوایا خوا سوێندی بۆ خواردبێ کـە چییان بوێ ، لـە ڕۆژی دواییدا بییانداتێ ، وەك ئایەتی « أم لکم ایمان علینا بالغة » گـەیاندی کە ئەمەش نەبووە ، چونکە خوا خۆی ئەفەرموێ شتیوا نییە ، ئەگەر هەر ئەشلێن هەیە ، کێیە ئەو دەمڕاستەی کەوا ئەڵێ با بێ بیچەسپێنێ ·
هیچ نەمـایەوە ئەوە نەبێ کـە بلێن : خوێندەوارانی ئادەمیی لەوانەی کە شارەزای فەلسەفەی دینەکانن پشتیوانیی ئـەم قسەیەیان ئەکەن : کە گۆیا جێگای تایبەتییان بۆ هـەیە لـە بەهەشتا · ئنجا بە ئایەتی « ام لهم شرکاء ··· » ئەمەشی بردە دواوە · واتـە ئەگەر خوێندەوارانیوا شك ئەبەن کـە ئـەم شهادەتەتان بۆ بدەن با بیانهێنن ئەگەر ڕاست ئەکەن ·

یَوْمَ یُکْشَفُ عَنْ سَاقٍ وَیُدْعَوْنَ اِلَی السُّجُودِ فَلا یَسْتَطِیعونَ (٤٢)

لەڕۆژێکا کە داوێنی لێ‌ئەکرێ بەلادا ، وە (بەتەوسەوە) بانگ ئەکرێن بۆسجدە بردنو ناتوانن (بی‌بەن) (٤٢)

ئنجا ئەفەرموێ : با هاوبیرەکانی خۆیان بێنن ( یوم یکشف عن ساق ) لە ڕۆژێکا کە داوێنی تیا ئەکرێ بەلادا وەك ڕۆژی دوایی بێ •

ئەم دەربڕینە «تعبیر» لە کوردیو عەرەبی‌دا ، بریتی‌یە لە کاتی تەنگو چەڵەمە ، نابینیت کە لەگەڵ بەلایەکی زل ڕوویدا وەك بومەلەرزەیەکی بەهێز ، یا ئاگرێکی گەورە ، یا لافاوێکی زۆر ، ئەوانەی کە لەوێدان ، باڵی لێ هەڵئەماڵنو داوێنی لێ ئەکەن بەلادا بۆ مەردوم ڕزگار کردن ، کەواتە داوێن هەڵکردن بریتی‌یە لە کاتی تەنگو چەڵەمە ، ئنجا ئەبێ لە تەنگو چەڵەمەی ڕۆژی دوایی گەورەتر چی بێ ؟

بەڵێ لە ڕۆژی دواییدا بێ‌بڕوا خەمو خەفەت دای‌ئەگرێ ، وە لە هەموولایەکەوە سزای خوا دەوری ئەداو ڕووی تێ‌ئەکات ، وە هیوا لە دڵیا نامێنێ ، ئنجا لەوڕۆژەدا بانگ ئەکرین بۆ سجدەبردن لە ڕووی تەوسو سەرکۆنەوە کە لە دنیادا نوێژیان نەئەکرد وە سجدەیان نەئەبرد ، وەکو ئەفەرموێ ( ویدعون الی السجود فلا یستطیعون )بانگ ئەکرێن بۆ سجدەبردنو ناتوانن ، چونکە لەترسانا ئەژنۆیان بەیەکا

خاشِعَةً اَبْصارُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ، وَقَدْ كانوا يُدْعَوْنَ اِلى السُّجودِ وَهُمْ سالِمونَ (٤٣)

چاویان شۆڕو ڕیسوایی دایانئەگرێ ، بەڕاستی جاران کە ساغ بوون بانگئەکران بۆ سجدە (و نەیانئەبرد) (٤٣)

ئەداو دڵیان هەڵئەپەڕێ • لەوکاتەدا هیچیان لەدەست نایەت تەماشاکردن نەبێت بـە چاوێـکی شۆڕو پڕ لەترسەوە ، وەکو ئەفـەرموێ ( خاشعة أبصارهم ) چـاویان سەربەرەوژێرو ترسناك ( ترهقهم ذلة ) ڕیسوایی‌و شـەرمەزاریی دایـگرتوون ، چونکە لەوڕۆژەدا بیریان ئەکەوێتەوە کـە ( وقد کانوا یدعون الی السجود وهم سالمون ) بێگومان لە دنیادا بانگ ئەکران بۆ نوێژکردن‌و سەجدە بردن ، لەکاتێکا کـە ئـەوان سـاغ‌و تەندروست بوون ، وە ئەیانتـوانی نوێژ بـکەن‌و سـەجدە بەرن ، بەڵام نەیانئەکرد لەبەر دەعیەو دەمار •

لێرەدا ئەبومسلمی اصفهانی ئەڵێ : مـەبەس لـەم ڕۆژە ڕۆژی دنیایە ، چونـکە لـە ڕۆژی دواییدا کـەس بانگناکرێ بۆ سەجـدە بردن‌و خواپەرستیی ، کەواتە ئەبێ ئەو ڕۆژانە بێ کـە بێبڕوا ئەکەونە گیانەڵاوە‌وە وە کـەس‌وکاریان دەستئەکەن بـە گریان‌و لەخۆدان ، وە بە چاوی خۆیان مردن ئەبینن‌و پەشیمان ئەبنەوە بە ڕەنگێك ئەگــەر گوێیان لـە دەنـگی بانگ بێ ئەیانەوێ بچن بـە دەنـگی‌یەوە ، بەڵام ناتوانن ، وە لەودەمـەدا چـاویان سەر بەرەو ژێر ، وە شەرمـەزاریی دایانئەگرێ ، چونـکە بیریان ئەکەوێتەوە کـە لـە کاتی ساغی‌و

فَذَرْنی وَمَنْ یُکَذِّبُ بِهذا الْحَدیثِ ،

---

وازبێنە لــە مــنو ئەوانەی کــە ئــەم قورئانە بەدرۆئەزانن ،

---

تەندروستیدا هــەموو جارێك بانــگ ئەکران بــە دەنــگی بانــگ بۆ نوێژو خواپەرستی ، کەچی بێزیان نەئەهات نوێژ بــکەن .

زۆر جــار پێغەمبەر خەمبارو خەفەتبار ئەبوو بەهۆی لاســاریی‌و سەرپێچی ئەم بێ‌بڕوایانەوە ، کــە بە هەموو هێزو تەوانایی خۆیانەوە بەرانبەری ئەوێستان ، وە گاڵتەیان بە خۆی‌و قورئانەکەی ئەکرد ، وە جڵەوگیریی مەردومیان ئەکرد لە مسڵمان بوون ، وە هەمووجارێکیش خــوا دڵخۆشی ئەدایەوە کــە دان بەخــۆیا بــگرێ ، وە نموونەی بۆ ئەهێنایەوە بە پێغەمبەرەکانی پێش خۆی کە هەموو لەم ڕێــگایەدا دوو چــاری ئازارو سزاو ناخۆشیی بوون ، تا لەدواییدا سەرکــەوتوون ، ئنجا لەســەر ئاهەنــگی قســەو گوفتوگۆی ئادەمیی‌و شێوەی هەڕەشە کردنیان ، خــوا بە پێغەمبەر ئەفەرموێ ( فذرنی ومن یــکذب بهــذا الحدیث )ئەوانەی کــە ئەم قورئانە بە درۆ ئەزانن ، وە بە هۆی کوڕی زۆرو دارایی زۆرەوە یاخی‌بوون ، بەجێ‌یان بێڵە بۆ من ، وە تۆ وازیان لێ بێنە ، وە خۆتیان پێوە خەریك مەکــە ، هــەر مــن ئەزانم چــۆن تۆڵەیان لێ ئەسێنم ، وە چۆن بەرەبەرە بەپێی دەستووری باوێك کــە داماوە لــە جیهانا لەناویان ئەبەم ، ئنجا باسی دەستوورو لەناوبردنەکەیان

سَنَسْتَدْرِجُهُمْ مِنْ حَيْثُ لا يَعْلَمُونَ (٤٤) وَأُمْلِي لَهُمْ ، اِنَّ كَيْدِي مَتِينٌ (٤٥)

بەرەبەرە ئەیانگرم بە ڕەنگێك کە پێ نەزانن (٤٤)وە مۆڵەتیان ئەدەم ، بەڕاستی فێڵی مـن بەهێـزە (٤٥)

ئەکـات ، ئەفەرموێ ( سنستدرجهم مـن حیث لا یعلمون ) ڕۆژبەڕۆژ زەبوونیان ئەکـەم ، وە بەرەبەرە کزو بێنرخیان ئەکەم ، بە ڕەنـگێکیوا کە ئاگایان لێ نەبێ ، وە وایزانن کـە مۆڵەت دراوون ، وەکو ئەفەرموێ ( واملی لهم )مۆڵەتیان ئەدەم ، بەمڕەنگە ماوەیەك ئەیانهێڵمەوە بە لەشی ساغو دارایی زۆرەوە ، تا لـەپڕ ئەیانڕووخێنم وە لەناویان ئـەبەم ( ان کیدی متین ) بەڕاستی فێڵی من بەهێزە •

فێڵ بـە کردنی کارێك ئەڵێن کـە بەدزییەوە بـکرێ ، بۆ زیان گەیاندن بە یەکێك ، یا بە گەلێك کـە نەوێریت بەئاشکرا ئەو کـارە بکەیت ، ئنجا لەبەرئەوەی کـە دەستوورو باوی خوا لە جیهانا لەسـەر ئەوەیە کە هۆی لەناوچوونی یەکێك یا گەلێك بەرەبەرە ، وە بەپەنهانییو لـە ماوەیەکی دوورو درێژا پەیدا ببێ ، تا دواڕۆژ لـەپڕ ئەڕووخێنو لەناو ئەچن ، ناوی ئەم دەستوورو باوەی برد بە فێڵ ، ئەگینا خوا لەکوێو فێڵ لەکوێ ؟•

بەڕاستی ئەم بێبڕوایانە سەیریان هەیە ، زۆر چاك ئەزانن کە تۆ پێغەمبەرێـکی بەڕاستییت ، کەچی بڕوات پێ ناهێنن ، وەك بەرانبەر بـەم

أمْ تَسْألُهُمْ أجْراً فَهُمْ مِنْ مَغْرَمٍ مُثْقَلونَ ؟ ( ٤٦ ) أمْ عِنْدَهُمُ الْغَيْبُ فَهُمْ يَكْتُبونَ ؟ ( ٤٧ )

ئایا تۆ (ئەی پێغەمبەر) داوای مز(ی پێغەمبەریەتی)یان لێ ئەکەیت وە (بەمبۆنەیەوە) ئەوان لە بژاردنی گرانبارن ؟ (٤٦) یا ڕوویەڕەی غەیبیان لەلایە ، وە ئەوان لەبەری ئەنووسنەوە ؟ (٤٧)

ئامۆژگاریی‌و هەووڵدانەت بۆ مسڵمان بوونیان ، داوای کرێیەکی وا زۆریان لێ بکەیت کە نەتوانن بیدەن ، وە بەمبۆنەیەوە بیانووت پێبگرن وایە ، وەکو ئەفەرموێ ( ام تسألهم اجرا ) ئایا تۆ لە بێبڕوایان داوای کرێی کۆششی پێغەمبەریەتی ئەکەیت ( فهم من مغرم مثقلون ) ئنجا بەمبۆنەیەوە ئەوان لە دانی ئەو کرێیەو بژاردنی ، گرانبارن ، وە ناتوانن بیدەن ، بۆیە توخنت ناکەوون‌و بڕوات پێ ناهێنن ، لەگەڵ ئەمیشمە کە تۆ هەر ڕێگایەکیان نیشان بدەیت ، وە هەر ئامۆژگاریی‌یەکیان بکەیت هەر بۆ خوایە ، وە چاوتان لە هیچ قازانجێکەوە نی‌یە تەنها ڕێنموونیی ئەوان نەبێ بۆ ڕێی ڕاست ، ئنجا کە خۆیان ئەمە ئەزانن ، ئیتر ئەم سەرپێچی‌یەیان لەچی‌یە ؟ ئایا پەردەی غەیبیان هەڵداوەتەوە ، وە نامەی غەیبیان خوێندۆتەوە ، وە ڕێی بەهەشتیان لە لایەکی‌ترەوە دۆزیوەتەوە ، وەکو ئەفەرموێ ( ام عندهم الغيب فهم يكتبون )یا ڕوویەڕەی غەیبیان لەلایە ، وە ئەوان

فَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ ، وَلَا تَكُنْ كَصَاحِبِ الْحُوتِ ،

دان بەخۆتا بگرەو چاوەڕوانیی فەرمانیی خوات بکە ، وەك هاوڕێی نەهەنگەکە مەبە (کە یونس پێغەمبەر)ە ٠

لەبەری ئەنووسنەوە ، وە لەوانەدا شتی وایان دۆزیوەتەوە کە پشتیوانیی لە قسەکانی ئەوان بکات ٠

★ ★ ★

تا ئێرە باسی قسەکردن بوو لەگەڵ بێبڕواکانی قورەیش بە گەلێ ڕەنگ ، بۆئەوەی کە بڕوا بێنن ، ئنجا با ئەداتەوە سەر ئامۆژگاریی کردنی پێغەمبەر کە بێهیوا نەبێو دەست هەڵنەگرێ لەم پێویستە قورسو گرانەی کە دراوە بەسەریا ، وەك یونس پێغەمبەر کە تووڕە بوو لە گەلەکەی ، وە بەجێی‌هێشتن ، وەکو ئەفەرموێ ( فاصبر لحكم ربك ) دان بە خۆتا بگرەو چاوەڕوانیی فەرمانی پەروەردگارت بکە ( ولا تكن كصاحب الحوت )وە لە خۆڕانەگرتنو تەنگە تیلکەیی‌دا وەك هاودەمی نەهەنگەکە مەبە ، کە یونس پێغەمبەرە ٠

خوا باسی یونس پێغەمبەر ئەکات لەم سوورەتەدا زۆر بە کورتیی ، بەڵام لە چەند شوێنێکی‌تر لە قورئانا باسی ئەکات بەدرێژتر لێرە ، ئنجا وا ئێمە لێرەدا داستانەکەی یونس باس‌ئەکەین ، بە پێی فەرموودەکانی قورئانو فەرموودەی پێغەمبەر ٠

خوا یونس پێغەمبەری نارد بۆ «نەینەوا» لەتەنشت مووسڵەوە بۆ ئامۆژگاریی ئەو گەلە بتپەرستەی کە لەوێ بوون ، تا خوایان پێ بناسێو بڕوایان پێ بێنێ ، هەرچەند هەوڵیدا ، وە لەگەڵیانا خەریك بوو بڕوایان پێ نەهێنا ، لەمە یونس پێغەمبەر زۆر بێئومێد بوو ، وە بە تووڕەیی بەجێیهێشتن ، وە نزای خرابی لێ کردن ، نەیزانی کە خوا پێی ناخۆشە ، وە لەسەر ئەمە ئەیگرێو دووچاری سزای ئەکات ، هەروا ڕۆی تا گەیشتە کەناری دەریای سپی ، لەوێ سواری کەشتییەکی سەفەریی بوو ، کە پڕبوو لە زەلام ، لە تێرینەی ئاوەکەدا تەماشایان کرد کەشتییەکە زۆر قورس ، وە لە نوقوم بوونایە ، هەرچی کەلوپەلێکی تیابوو هەموویان فڕیدایە ناو ئاوەکەوە ، بەڵام بەمە چارە نەکرا ناچار هاتن تیرو پشکیان کرد «قورعەیان کێشا» لەناو زەلامەکانا ، وە یەکەم کەس یونس پێغەمبەر بەرکەوتو فڕێدرایە ناو دەریاکەوە ، کوتوپڕ نەهەنگێکی گەورە قووتیدا ، لەپاش ئەوەی کە یونس پێغەمبەر چووە ناو سکی نەهەنگەکەوە ، وە دەستی لە هەموو شتێك بڕا ، ئنجا تێگەیشت کە گوناهێکی زۆر زلی کردووە ، وە فەرمانی خوای شکاندووە ، ئیتر بە دڵ پەشیمان بووەوە ، وە تاتوانی هاواری کردە خوا فەرمووی : « لا اله الا انت سبحانك انی کنت من الظالمین ۲۱/۸۷ »(۱) لەبەرئەوەی کە پەشیمان بوونەوەکەی بە دڵ بوو ، خێرا خوا گیرای کرد ، وە بە فەرمانی خوا نەهەنگەکە لە قەراغ دەریاوە ئیقی کردەوەو یونسی فڕیدایە ووشکانی ، بەڵام پێستی لەشی

(۱) واتەهیچ خوایەکی بەڕاستی نییە تەنیا تۆ نەبییت ، پاکیی هەر بۆ تۆیە ، بەڕاستی من لە ستەمکاران بووم •

اِذْ نادی وَهوَ مكْظومٌ (٤٨) لَولا اَنْ تَدارَكَهُ نِعْمَةٌ مِنْ رَبِّهِ ، لَنُبِذَ بالْعَراءِ وَهوَ مَذْمومٌ (٤٩)

کاتێك کە بانگی (خوای) کرد ، وە ئەو پیشی خواردبۆوە ( لە بێبڕوایی گەلەکەی) (٤٨) ئەگەر میهرەبانی‌یەك لەلایەن خواوە فریای نەکەوتایە ، فڕێ ئەدرایە دەشتێکی ڕووت ، وە ئەو بەدناو ئەبوو (٤٩)

نەمابوو ، وە گۆشتی سووری دەرکەوتبو ، بۆئەوەی کە هەتاو گاز نەیێ ، خوا گیایەکی گەلآ پانی وەك کوولەکەی بۆ ڕوواند ، وە هەڵگەڕا بە چڵێکا ، تا لەژێر سێبەرەکەیا بحەسێتەوە ، لەپاشا خوا ناردی‌یەوە بۆسەر گەلەکەی نەینەوا ، وە ئامۆژگاریی کردن‌و هەموو بڕوایان پێ هێنا ، وەکو ئەفەرموێ ( اذ نادی وهو مکظوم ) کاتێك کە هاواری کرد لەناو سکی ماسی‌یەکەدا کە ئەو پیشی خواردبۆوە لە بێبڕوایی گەلەکەی .

لە ئایەتی سوورەی «صافات»دا کە ئەفەرموێ « فالتقمه الحوت وهو مليم »[١] دەرئەکەوێ کە یونس پێغەمبەر بە گوناهباریی چووە ناوسکی نەهەنگەکەوە ، بەڵام لێرە وادەرئەکەوێ بە پاکیی‌و لیخۆشبوویی لە سکی هاتە دەرەوە ، وەك ئەفەرموێ ( لولا ان تدارکه نعمة من ربه) ئەگەر میهرەبانی‌یەك لەلایەن پەروەردگاری‌یەوە فریای نەکەوتایە ( لنبذ بالعراء وهو مذموم ) فڕێ‌ئەدرایە دەشتێکی ڕووت ، وە ئەو بەدناو ئەبوو بەهۆی نارەزامەندیی خواوە لێی ، بەڵام بەهۆی میهرەبانیی خواوە ، یونس

(١) واتە نەهەنگەکە قووتی‌دا ، وە ئەو «گوناهبار»و لۆمەکراو بوو .

فَاجْتَبَاهُ رَبُّهُ فَجَعَلَهُ مِنَ الصَّالِحِينَ (٥٠)

ئنجا خوای ئەو هەڵیبژاردەوەو گێڕای (بە یەکێك) لە چاکان (٥٠)

پێغەمبەر گوناهەکەی خۆی بیرکەوتەوەو پەشیمان بووەوەو لە خوا پاڕایەوە ، وە خواش پەشیمانی‌یەکەی لێ گیرا کردو ڕزگاری‌کرد ، وە گوناهەکەی لەسەر هەڵگرت ، وە هەڵی‌بژاردەوە بەپێغەمبەریەتی خۆی ، وەکو ئەفەرموێ ( فاجتباه ربه ) ئنجا خوای خۆی هەڵی‌بژاردەوە ( فجعله من الصالحين ) وە کردی بە یەکێك لە چاکان ، کە ئیتر بە هیچ شتێك لێڵ نەبێ‌و تووڕە نەبێ ، وە لەبەر باری خوادا خۆی ڕابگرێ •

خوا ئەم داستانەی بۆ پێغەمبەر گێڕایەوە تا پەندی لێ وەربگرێ ، وە تێ‌بگات کە لەم ڕێگایەدا ، تووشی هەزاران ناخۆشیی ئەبێ ، کە ئەمانە بارێکی ئێجگار قورس‌و گرانن ، پیاوی ئەوێ کە وەڕس نەبێ ، وە لە هیچ کاتێکدا نەناڵێنێ ، وە پشتی بە خوای خۆی قایم بێ ، تا بەپێی دەستوورو باوی خۆی دێ بە دەنگی‌یەوە •

★ ★ ★

ئەوەبوو لەپێشەوە خوا فەرمانی‌دا بە پێغەمبەر کە دان‌بەخۆیا بگرێ ، وە چاوەڕوانیی بکات ، تا بزانێ خوا چی‌ئەکات بە دوژمنەکانی ، وە بەتایبەتی پێ‌ی‌فەرموو : وەك یونس پێغەمبەر تووڕەو بێ‌سەبر مەبە ، وە نزای خراپ لە کەس مەکە ، ئنجا کە هاتە سەر تەواو کردنی سوورەتەکە ، ویستی دوایی‌یەکەی بەستێتەوە بە سەرەتاکەیەوە ، وە چی

وَاِنْ يكادُ الَّذينَ كَفَروا لَيُزْلِقونَكَ بِاَبْصارِهِمْ لَمّا سَمِعوا الذِكْرَ وَيَقولونَ : اِنَّهُ لَمَجْنونٌ (٥١)

نزیك‌بوو بێ‌بڕواكان لەكاتێكا كە قورئانیان لێ بیستییت هەڵت‌خلیسكێنن بە چاو(ی پیس)یان وە ئەڵێن (ئەم پێغەمبەرە) شێتە (٥١)

باس‌كردووە لە سەرەتاوە ، لێرە بەكورتیی بی‌ئێتەوە ، وە دوایی سوورەتەكەی پێ‌بێنێ .

ئەوەبوو لە سەرەتای سوورەتەكەوە باسی بێ‌بڕواكانی مەككەی كرد ، كە بە پێغەمبەریان ئەووت شێت ، وە سوێندی بۆ خوارد بە قەڵەم‌و مەرەكەب‌و نووسین ، كە تۆ شێت نیت ، چونكە ئەگەر وابوایە ئەوەندە بەقین‌و كینەوە خێسەیان لێ نەئەكردییت ، وە چاوی پیسیان پێ هەڵ‌نەئەهێنایت ، وەكو ئەفەرموێ ( وان يكاد الذين كفروا ليزلقونك بابصارهم ) بەڕاستی نزیك‌بوو كە بێ‌بڕواكان هەڵت‌خلیسكێنن بە چاوی پڕ لە دوژمنایەتی‌یان ( لما سمعوا الذكر ) لەكاتێكا كە قورئانیان لێ ئەبیستییت ، وە بۆت ئەخوێندنەوە ، واتە لەوحەلانەدا ئەوەندەیان ڕق لێتە ، وەختە كوێر بن ، وە بە دڵێكی پیس‌و چاوێكی پیسی‌واوە ، لێت مۆڕ ئەبنەوە ، لەوانەن كە بت‌شڵەژێنن‌و تاچ‌و قولت بەیەكا بێنن ، لەگەڵ ئەمیشە ( ويقولون انه لمجنون ) كە ئەڵێن پێغەمبەر شێتە ، وە ئەم قورئانە قسەی هیچ‌وپووچە ، ئنجا ئەگەر وایە بۆچی ئەمەندە حەسەدت پێ ئەبەن ، وە لە هەرلایەكەوە بت‌بینین

وَمَا هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِلْعَالَمِينَ (٥٢)

لەکاتێکا کـە ئەم قورئانە هەر ئامۆژگاری‌یە بۆ هەموو ئادەمیی (٥٢)

کوێر ئـەبن ، وە بە چـاوێـکی پڕ لـە قین‌و کینـەو پیسی‌یەوە لێت ووردئەبنـەوە ، وە بووبێت بـە گرێی دڵو بەردی سـەر سـکیان ، ئەگـەر ئەوان ڕاست ئەکـەن تۆ بە شێت ئەزانن ، شێت چۆن حەسەدی پێ ئەبرێ ؟ وە چۆن بەقینەوە ئەمـــەندە خێسەی لێ ئەکـــرێ ، وە ئەوەندە بە گوفتارو کرداری خەمبارو خەفەتبار ئەبن ؟ دیارە درۆئەکەن ، وە بە دڵ ئەزانن کـە تۆ پێغەمبەری خوایت ، وە ئەم قورئانە سرووشێکی ئاسمانی‌یە بۆ هـــەموو جیهـانیان ، وەك ئەفـەرموێ ( وما هو الا ذكر للعالمين )ئەم قورئانە هـەر ئامۆژگاری‌یە بۆ هـەموو کۆمـەڵی ئادەمیی بەتێـــکڕایی ، نەك هـــەر بۆ تیرەیەك یا گـەلێك ، وە بۆ هـــەموو ئادەمیی‌یە تا جیهان جیهان بێ ، نەك بۆ سـەد ساڵ یا زیاتر یا کەمتر وەك پێغەمبەرانی پێشوو .

لێـرەدا قسەیەکی زۆر گرنگ هـەیە پێویستە بـکرێ ئـەویش ئەمەیە کـە خۆرشناس « مستشرق »ەکـان ئەڵێن پێغەمبەر لـە مەکـکە نەی‌ووتووە کە من پێغەمبەری هەموو ئادەمییم ، بەڵکو دوای ئەوەی کە کۆچی‌کرد بۆ مەدینە ، وە لـە غەزای بەدردا سەرکەوت ئنجا ئەمـەی ووتووە ، بەڵام ئێمـە کە لە قورئانی پیرۆز ووردئەبینەوە ، خـوای گـەورە لە حەوت سوورەتی مەککی کـە «انعام»و «یوسف»و «أنبیا»و «فرقان»و «جن»و «قەڵەم»و «تکویر»ن دان‌ئەنێ بەوەدا کـە ئەم قورئانە

ئامۆژگاری‌یە بۆ هەموو جیهانیان بەتێکرایی لە کاتی هاتنە خوارەوەیەوە تا ڕۆژی دوایی ، لە هەموویان گرنگتر ئـەم سوورەتەیە کەوا تەفسیری ئەکـەین ، چونـکە لـە بـەرە بـەیانی ئیسلامەتی‌دا هـاتۆتە خوارەوە کە مسڵمانەکان لە خێزانەکەی پێغەمبـەر بەدەرنەبوون ، وە ئیسلامەتی لە چوار دیواری ماڵی پێغەمبەر نەچوبووە دەرەوە ، ئەوانیش بریتی بوون لـە پێغەمبەرو خەدیجە خاتوونی خێزانی‌و امامی علی کە مناڵ بوو ، وە لەبەر هـەژاریی باوکی ، پێغەمبـەر هێنابوویە لای خۆی ، وە زەیدی کوڕی حارثە کـە بەندەی ئازادکراوی پێغەمبەر ، وە لە ماڵی پێغەمبەرا بوو •

هەزارو دووسەدو پەنجا سـاڵ پێش ئەوەی ئەم درۆیە بـکرێ‌و ئـەم خراپەیە بگیرێ ، خـوای ئاگـادار بـە هەموو شتێك بـەدرۆی خستوونەتەوە ، وە بە حەوت ئایەتی وەك «تبارك الذی نزل الفرقان علی عبده لیكون للعالمین نذیرا » داوێتی بەدەمیانا •

# سورة الحاقة

## بسم الله الرحمن الرحيم

اَلْحاقَّةُ (١) ما اَلْحاقَّةُ ؟ (٢)

# سوورەی ( حاقە )یە

**بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

ڕۆژی دوایی (١) چی بێ ئەوڕۆژە ؟ (٢)

## بسم الله الرحمن الرحيم

**مەککی‌یە ، ٥١ ئایەتە ، ٢٥٦ ووتەیە ، ١٠٨٤ پیتە**

## بسم الله الرحمن الرحيم

**بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

خـوا ویستی لـەم سوورەتـەدا باسێـکی ڕۆژی دوایی بدا بـە گوێچکەی بێ‌بڕواکـانی قورەیش‌دا ، کـــە پشتێنی دوژمنـــایەتی‌یان بەستبوو لەگـەڵ پێغەمبـــەرا ، وە بەرهەڵستی خـۆی‌و ئاینەکـــەی ویستابوون ، وە بیان‌ترسێنێ بە باسی لەناوبردنی ئەو گەلانەی کە لەپێش ئەمانا بوون ، وە بڕوایان بە خواو پێغەمبەرەکانیان نەهێناوە ، فەرمووی ( الحاقـة )ئەوکـاتەی ـ وەك ڕۆژی دوایی بێ ـ کـە بوونی ڕاستو بێ‌گومانە ( ما الحاقة ) چ‌کاتو دەمێکە ، واتە کاتێکی ئەمەندە سەختو

وَما اَدْراكَ ما الْحاقَّةُ ؟ (٣)

تۆ چووزانیت ئەوڕۆژە چی‌یە (٣)

بەسامە کەس نازانێ چۆنە •

مەبەس لـەم پرسیارە نیشاندانی سەختیی‌و سامی ئەوڕۆژەیە ، واتە ئەمـەندە بەلاٌیەکی گـەورەو ناخۆشە ، لەوانەیە کـە هـەموو کەسێك پرسیاری لێ بـکات‌و بڵێ : چی بێ ئەوڕۆژە ، وەك یەکێك کە تووشی بەلاٌیەکی کوتوپڕیی زۆر قورس‌و گـەورە ئەبێ ، ناوبەناو ئـەپرسێ لەوانەی کـە لەلایەوەن ئەڵێ : ئەمە چی‌یە ؟ لە کاتێکا کە خۆشی ئەزانێ چی‌یە •

ئنجا بۆ نیشان‌دانی سەختیی‌و سامی ئـەو ڕۆژە ، دووبارە پرسیار ئەکـاتەوە ئەفەرموێ ( وما ادراك مـا الحاقة ) تۆ چووزانیت ئەو ڕۆژە چ‌ڕۆژێکە ؟ کەس نازانێ چۆنە تا تێ‌ی‌نەکەوێ •

★ ★ ★

بەم سێ ئایەتە باسی ڕۆژی دوایی بۆ دامەزراندین ، ئنجا لەپێش ئەوەی کـە باسی ئەوڕۆژەمان بۆ تەواو بـکات ، وە باسی بەشی چاکان‌و خراپانمان بۆ بـکات لەوڕۆژەدا ، هـات زۆر بەکورتیی دەستی کرد بە باسێکی داستان‌و سەرەنجامی هێندێك لـە گەلانی ڕابوردوو ، لەوانەی کـە بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نەبووە ، وە پێغەمبەری خۆیانیان بەدرۆ

کَذَّبَتْ ثَمودُ وَعادٌ بِالْقارِعَةِ (٤)

گەلی عادو ثموود ، ئەو ڕۆژەیان بەدرۆ زانی (٤)

زانی‌وە ، بۆئەوەی کـە بت‌پەرستەکانی عـەرەب بترسن‌و بسڵەمێنەوە ، فەرمووی ( کذبت ثمود وعاد بالقارعة ) گەلی عادو ثمود ڕۆژی دوایی‌یان بە درۆ زانی ، ئەوڕۆژەی کە هەرچی ئەستێرەو ڕۆژو مانگ هـــەیە هەمووی بەجارێك ئەترازێن‌و بەیەکا ئەدەن ، وە گرمەو شاخەیەکی‌وای لێ پەیـــدا ئەبێ کە هەرچی دڵان هـــەیە دای‌ئەخورپێنێ‌و ئەیانخاتە گوربەگورپ •

«عاد»و «ثمود» دوو خێڵ بوون لـە عەرەب ، یەکەمیان لە وولاتی «حجر» لە ناوەندی «حجـاز» و «شام»و ، دووهەمیان لە «احقاف» لـە وولاتی «یمن» لـە ناوەندی «عمـان»و «حضـرموت» دائەنیشتن ، وەك قووثان ئەگێڕێتەوە لە چەند ئایەتێکی‌ترا ، خوا صالح پێغەمبەری نارد بۆ گـەلی «ثمود» کـە پیاوێـکی زۆر دەروێش بووە ، نە خانووی بووەو نە ماڵ ، تەنانەت پێلاوی لە پێ نەکردووە ، بەڵـکو هەر حوشترێـکی دۆشەنیی بووە ، هەرچەند هەوڵی‌دا لەگەڵیانا نە بڕوایان پێ هێناو نە لە خراپە گەڕانەوە ، بەڵـکو زۆر دەردی سەریی پێغەمبەرەکەیان دا ، وە

فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهْلِكُوا بِالطَّاغِيَةِ (٥) وَأَمَّا عادٌ

ئنجا (گەلی) ثموود لەناوبران بە بەلآیەکی گەورە (٥) وە (گەلی) عادیش

حوشترەکەیان کوشت ، تاخوا لەناوی بردن ، وەکو ئەفەرموێ ( فاما ثمود فاهلکوا بالطاغیة ) گەلی ثموود لەناوبران بە بەلآیەکی زۆر گەورە .

ئەمە گوناهو سزای گەلی «ثموود» ، ( واما عاد ) وە گەلی عاد ـ وەك قورئان لە چەند شوێنێکیترا ئەفەرموێ ـ خوا هوود پێغەمبەری بۆ ناردن ، هەرچەند بەسەریانا هات بڕوایان پێ نەهێنا ، سەرەڕای ئەوەش زۆر کاری ناشرینیان بوو ، وە لەسەر ڕێگاو شوێنی بەرزو بەرچاو کۆشکی بەرزیان دروستئەکرد بۆ دەعیەو دەمارو تەماشاکردنی ناو حەوشو ماڵی دراوسێ ، وە بۆئەوەی چاویان لەو ڕێبوارانە بێ کە هاتوچۆی پێغەمبەرەکەیان ئەکرد بۆ ئازارو سزا دانیان ، وەك هوود پێغەمبەر کە لە ئایەتێکیترا پێیانئەڵێ « أتبنون بکل ریع آیة تعبثون ؟ وتتخذون مصانع لعلکم تخلدون ٢٦/١٢٩ »(١) لە هەمووی خراپتر ئەوەبوو ، کە ڕقیان لە یەکێك هەڵبستایە زۆر بە بێبەزەیییانە دەستیان لێ ئەوەشاند،وەك پێغەمبەرەکەیان پێیان ئەڵێ لە ئایەتێکیترا « واذا بطشتم بطشتم جبارین ٢٦/١٣٠»(١)

(١) واتە ئایا لە هەموو شوێنێکی بەرز کۆشکێك دروستئەکەن بۆ یاریکردن (بە ڕێبواران) . وە عەماراوی زۆر دروستئەکەن شایەد کە هەر بمێنن هەتا هەتایە .

(١) واتە کاتێکیش کە دەستتان بوەشاندایە دەستی ستەمکارانەتان ئەوەشاند .

فَاُهْلِكوا بِريحٍ صَرْصَرٍ عاتِيَةٍ (٦) سَخَّرَها عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيالٍ وَثَمانِيَةَ اَيامٍ حسوماً، فَتَرى الْقَوْمَ فيها صَرْعى، كَأَنَّهُمْ اَعْجازُ نَخْلٍ خاوِيَةٍ (٧)

لەناوبران بـە بایەکی سـەختی بەتینی بەگرمـە (٦) (خـوا) زاڵی‌کرد بەسەریانا حەوت شەوو هەشت ڕۆژ بە بێووچان ، ئەو گـەلەت ئەبینی لــەو ماوەیەدا بێ‌گیـان کـەوتبوون ، وەك کۆتەرە داری خورمــای گەندەڵ (٧)

ئنجا گـەلی وا ئەبێ خوا لەناوی ببات ، وەکو ئەفەرموێ ( فاهلكو بريح صرصر عاتية ) لەناوبران بــە بایەکی ســاردی سەختی بەهێــزی بەتەووژمی بەگرمەو ناڵە ( سخرها عليهم سبع ليال وثمانية أيام حسوما ) خوا زاڵی‌کرد بەسەریانا حـەوت شەوو هەشت ڕۆژ(١) لەسەریەك بـە بێووچان ، بە ڕەنگێکیوا کـە هەمووی ڕەق‌کردنەوە وە هـەمووی وەك داری قەڵاش‌کـەریی کـەوتن بەسەر یەکـــا ، وەکو ئەفەرموێ ( فترى القوم فيها صرعى )ئەو گـەلەت ئەبینی لەو حـەلەدا بێ‌گیـان ( كانهم اعجاز نخل خـاوية ) وەك کۆتەرەی دارخۆارمـای گـەندەڵ

(١) واتـــە لـــە بەیانی چوارشەممەوە دەستی پێ‌کرد تا ئێواریێ چوارشەممەی ئاینده ، چواری لە کۆتایی «شوبات»و سیانی لـــە ســەرەتای «ئازار»ەوە کـە پێی‌ئەڵێن برجی پییرێژن ، چونـکە پییرێژنێك لە گەلی عاد خۆی ئەشارێتەوە لەژێر زەمینێکا ، تا لـە ڕۆژی هەشتەما ئەویش ڕەق‌ئەکاتەوە ٠

فَهَلْ تَرَى لَهُمْ مِنْ بَاقِيَةٍ ؟ (٨) وَجَاءَ فِرْعَوْنُ وَمَنْ قَبْلَهُ وَالْمُؤْتَفِكَاتُ بِالْخَاطِئَةِ (٩) فَعَصَوْا رَسُولَ رَبِّهِمْ ، فَأَخَذَهُمْ أَخْذَةً رَابِيَةً (١٠)

---

ئایا کەس ئەبینیت لەوان کە مابێتەوە ؟ (٨) فیرعەونو گەلانی پێش ئەوو ( دانیشتووانی دیهاتە ) ژێرو ژوور بووەکان هاتن بە گوناهو خراپەوە (٩) وە بێفەرمانیی پێغەمبەری خوای خۆیان کرد ، ئەوسا گرتنی بە گرتنێکی سەخت (١٠)

---

(فهل ترى لهم من باقية) ئایا کەس ئەبینیت لەوان کە مابێتەوە ؟ واتە دانەیان لێ دەرنەچوو ، وە هەموو بنەبڕ بوون •

( وجاء فرعون ومن قبله ) هەر بەوڕەنگە فیرعەونو گەلەکەی هاتن لەگەڵ گەلانی پێش ئەوانا (والمؤتفكات)وە لەگەڵ دانیشتووانی ئەو دیهاتانەی کە بوومەلەرزە سەرەوژێری کردن ـ وەك گەلی لووت بێ ـ ئەمانە هەموو هاتن ( بالخاطئة ) بە گوناهو کردەوەی خراپەوە •

ئنجا باسی گوناهەکەیان ئەکات ئەفەرموێ ( فعصوا رسول ربهم ) بێفەرمانیی پێغەمبەری خوای خۆیان کرد ( فاخذهم اخذة رابية )ئنجا لە تۆڵەی ئەوەدا خوا گرتنی بە گرتنێکی سەخت ، بەمڕەنگە فیرعەونو لەشکرەکەی لە دەریادا خنکان ، وە گەلی لووت ـ کە لە پێنج دێدا بوون لە شوێنی دەریاچەی «لووت»و «بحرى ميت» ـ ڕۆچوون ، وە ئاگرو کبریت لەژێریانەوە دەرچوو ، لەوسەرەوە وەك باران هاتە

انَّا لَمَّا طغى الْماءُ حَمَلْناكُمْ في الْجارِيةِ (١١) لِنَجْعَلَها لكُمْ تَذْكِرَةً ، وَتَعِيَها أُذُنٌ واعِيَةٌ (١٢)

ئێمە ـ کاتێك کە ئاو(ی تۆفان)سەرکەوت ـ (باپیرەکانی) ئێوەمان هەڵگرت لە کەشتیدا ( ئەی بێبڕوایانی مەککە ) (١١) تا ئەم کردەوەیە بکەین بە پەند بۆ ئێوە ، وە لە گوێی گرێ گوێگرێکی هۆشمەند (١٢)

خوارەوە بەسەریانا ، تا شوێنەکەیان بوو بەو دەریاچە بۆگەنەی کە ئێستاش ماوە •

( انا لما طغى الماء حملناكم في الجارية )ئێمە لەکاتێکا کە ئاو سەرکەوت وە بەرزبووەوە لە تۆفانی نووحا ، باپیرەکانی ئێوەمان هەڵگرت لە کەشتیدا ئەی بێبڕوایانی مەککە ، وە لە سایەی بڕوایانەوە ڕزگارمان کردن ، کە ئەوان بوون بە مایەی هاتنە جیهانی ئێوە ، واتە ئەگەر ئەوانمان ڕزگار نەکردایە ئێمڕۆ ئێوە نەئەبوون ، ئەمەشمان کە کرد بەمڕەنگە ، کەوا بڕوادارەکانمان ڕزگارکردو بێبڕواکانمان خنکان ( لنجعلها لكم تذكرة ) تا ئەم کردەوەیە بکەین بە پەندو ئامۆژگاریی بۆ ئێوە ، ئەی بێبڕوایانی مەککە ( وتعيها اذن واعية ) وە لەگوێی گرێ گوێگرێکی قسە وەرگری تێگەیشتوو ، واتە ئەم پەندانەمان بۆیە دادان ، تا هەموو وەچەو نەوەیەکتان یەکبەیەك لە باوو باپیری خۆیانەوە وەریبگرنو بیگرنە گوێ ، وە یەکتریی بۆ یەکتریی بگێڕنەوە •

★ ★ ★

فَإِذا نُفِخَ فِي الصُّورِ نَفْخَةٌ واحِدَةٌ (١٣)

ئنجـا کاتێك كە فووكرا بـە كەرەنادا بە تاقـە فووكردنێك (١٣)

خوا لـە سـەرەتای ئـەم سوورەتەوە باسی ڕۆژی دوایی دامەزراند بە سێ ئایەتی کورت ، دوای ئەوە خێرا باسی چەند گەلێکی کرد ، کە بەهۆی بێبڕواییانەوە بەو ڕۆژی دوایی‌یە ، خوا لەناوی‌بردن ، هەریەکەی بە بەڵایەکی تایبەتی ، ئنجا هاتەوە سەر باسی ڕۆژی دوایی کە بەڵایەکی تێکڕایی‌یە ، وە لەچاو ئەما هیچ بەڵایەکی‌تر نانوێنێ ، فەرمووی ( فـاذا نفخ في الصـور نفخة واحدة ) کاتێك کـە فووكرا بە كەرەنادا بە تاقە فووكردنێك •

مەبەس لەم فووکردنە بە کەرەنادا نیشاندانی گورجیی وێرانکردنی جیهانە لـە یەك دەما ، چونکە بەپێی باوی جیهان کـە بتەوێ هەرچی قوتابی قوتابخانەیەك هەیە كۆیان بـکەیتەوە ، زەنگیان بۆ لێئەدەیت ، یا ئەگەر بتـەوێ هەرچی سەربازی شوێنێك هەیە هەمووی کۆبکەیتەوە بۆرییەیان بۆ لێئەدەیت ، ئنجا خوا ئەیەوێ بەپێی ئەم دەستوورەی کـە دیبومانەو چاوو گوێمان پێی ڕاهاتووە ، گورجیی وێرانکردنی جیهانمان تێبگەیەنێ ، واتە لە یەك ساتا دەستووری ئاسمان تێكئەچێ ، وە هەرچی ئەستێرە هەیە بەجارێك هەڵئەوەرێ بە بێباش‌و پێش کەوتن ، هەروەك ئیشارەتێك بکرێ‌و کوتوبڕ وێران ببێ وایە •

وَحُمِلَتِ الْاَرْضُ وَالْجِبالُ ، فَدُكَّتا دَكَّةً واحِدَةً ( ١٤ ) فَيَوْمَئِذٍ وَقَعَتِ الْواقِعَةُ (١٥)

وە زەویی‌و شاخەکان هەڵگیران‌و بەجارێك دران بەیەکا (٤١) ئەوڕۆژە قەومانی گەورە ئەقەومێ (١٥)

لە ڕۆژی دوایی‌دا کـە جیهان وێران ئەبێ ، وە ڕۆژو مانـگ‌و ئەستێرە ئەپێچرێتەوە ، دیارە زەوییش لـە شوێنی خۆی ئەترازێ ، وە هـەرچی شـاخ‌و داخ‌و شوێنی بەرزی هـەیە هەمووی بەیەکا ئـەداو ئەڕووخێ ، وەکو ئەفەرموێ ( وحملت الارض والجبال فدكتا دكـة واحدة ) زەویی‌و شاخەکان هەڵـگیران‌و بەجارێك دران بەیەکا ، واتە بەرزیی‌و نزمیی نەما ، وە شاخەکان بوون بە تۆزو چوون بە حەوادا •

کاتێك کـە ئەمانە ڕوویدا ، ئنجـا نۆرەی ئـەو شتەیە کـە سوورەتەکە قسەی لێ ئەکات ، کە ئەویش ڕۆژی دوایی‌یە ، ئەفەرموێ ( فيومئذ وقعت الواقعة ) ئنجا لەوڕۆژەدا کە فووکرا بە کەڕەناداو شاخ‌و زەویی درا بەیەکا ، ئەقەومێ قەومانی گەورە ، واتە ئەو قیامەتەی کـە بڕواتان پێ نەئەکرد ، هەڵئەسێ •

وَانْشَقَّتِ السَّمَاءُ فَهِيَ يَوْمَئِذٍ وَاهِيَةٌ (١٦)

وە ئاسمان لەت ئەبێ ، وە ئەو لەورۆژەدا سست و (بێ کەڵک)ە (١٦)

لەورۆژەدا وانەزانیت ئەم وێرانی‌یە هەر بۆ زەوی‌یە ، بەڵکو بۆ ئاسمانیشە ، وەکو ئەفەرموێ ( وانشقت السماء )ئاسمان لەت ئەبێ ، واتە ئەم هێزی کیشندەیەی کە ئێستا هەیە ، وە ئەم هەموو ڕۆژو مانگ‌و ئەستێرانەی ڕاگرتووە نامێنێ ، وە ئەم دەستوورو ڕێك‌وپێکی‌یە تێك ئەچێ ، وەکو ئەفەرموێ ( فهي يومئذ واهية ) ئاسمان لەورۆژەدا سست‌و بێ کەڵکە ، واتە لە کەڕ ئەکەوێ •

ڕێکەوتێکی زۆر سەیرە ، کە زانایانی بوونەوەر ، ئەمڕۆ بێیان‌وایە کە ئەم بوونەوەرە گەورەیە ڕووەو نەمان ئەڕوات ، ئەمەش لەسەر سەرنجدانی تایبەتی خۆیانە کە بۆیان دەرکەوتووە •

شێخ عبدالقادری مغربی ئەفەرموێ : لەلایەك زەویی ئێمە ـ لەگەڵ ئەم هەموو بچوکیی‌و هیچ‌و پووچی‌یەیا لە چاو هەزاران هەزار ئەستێرەی ئاسمانا ـ ئەم هەموو گیان‌لەبەرانەی تیابێ ، کە بەرزترین‌یان ئادەمی‌یە ، چۆن ئەبێ ئەم هەموو ئەستێرانەی‌تر کە بەئاسمانەوەن گیانداریان تیا نەبێ ، کە ناوێکی خوا بەرن‌و نوێژێکی بۆ بکەن ، بەڵکو بێ‌گومان زۆریان پڕن لە گیانداری‌وا کە گەلێ لە ئادەمیی بەرزترو زاناترن ، کە قورئان ناویان ئەبات بەفریشتە ، ئنجا ئەبێ ئەم فریشتانە لە ڕۆژی دوایی‌دا ـ کە ئاسمان لەت ئەبێ ـ چی‌یان بەسەر بێ ؟

وَٱلْمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرْجَآئِهَا ،

وە فریشتەکان لـە کەناری ئاسمان ئەمێننەوە ،

دیارە خانوویەك کـە بوومەلەرزە بیهێنێتە شەقوشۆق ، ئەوکەسانەی کـە تیان هـەموو بەجارێك ڕاستئەبنەوە ، وە هـەر چـەند کەسەی لە گۆشەیەکەوە ڕائەوێستن تا بزانن چی بەسەر دێ ، هەر بەمڕەنـگەش فریشتە لـە هـەموو ئاسمانەکانا سـەریان لێ تێك ئەچێ ، وە هـەموو کۆمـەڵ کۆمـەڵ ، لەملاو لەولاوە ئەوێستن تا بزانن بوونەوەر چی لێ دێ ، وەکو ئەفەرموێ ( والملك علی ارجائها ) فریشتەکان لـە کەناری ئاسمان ئەمێننەوە ، وە چاوەڕوانی فەرمانی خوا ئەکەن .

مەردوم کە ئەگاتە ئەم شوێنە لە باسی ڕۆژی دوایی‌و وێرانبوونی جیهانا ، ئیتر بەتەواوی سامی لێ ئەنیشێ ، وە گەورەیی‌و دەسـەڵاتی خوای بۆ ئاشکرا ئەبێ ، وە تێئەگات کە هەر خوایە هـەر بووەو هەر ئەبێ ، وە هەرچی شتیتر هەیە لە جیهانا وەك بڵقێکی سەراو وایە ، تا هەیە پووچەو کە نەما ئەبێ بە هیچ ، وەکو ئەفەرموێ « ویحمل عرش ربك » .

ئادەمیی لـە جیهانا چـاوو گوێی پڕە لـە باسی گەورەیی‌و سامی پاشـایان ، لـە کـاتی دانیشتنیان لەسـەر تەختی پاشایی ، کە وەزیرو پیـاوانی گـەورەی سوپایی «عسکریی» دەوریان ئەدەن ، ئنجا بەمپێیە ، ئەگـەر یەکێك بیەوێ پەردەیەکی زۆر بەسـام ، یا ڕووبەڕەیـەکی گـەورەیی‌و دەسەڵات نیشان بدات ، ئەبێ لـە پەردەیەکی پاشایەتی‌و

وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَةٌ (١٧)

وە لەوڕۆژەدا هەشت (فریشتە) تەختی پەروەردگـاری تۆ هەڵئەگرێ لـەژوور هـەموو فریشتەکانی ترەوە (١٧)

تەخت و یاساوولا نیشانی بدات ، بۆیە خواش لێرەدا بە زبانی خۆمـان ، وە بەپێی ژیری و بیرمان قسەمان لەگـەڵ ئەکـات ، تا سامێك بخاتە دڵمانەوە ، وە تۆزێك دامانبچڵەکێنێ ، ئەفەرموێ ( ویحمل عرش ربك فوقهم یومئذ ثمانیة ) لەوڕۆژەدا تەختی پەروەردگاری تۆ هەشت فریشتـە هەڵی ئەگرێ ، لە ژوور هەموو فریشتەکانی ترەوە •

مەبەست لـە «عرش» گەورەیی و دەسـەڵات و دەست ڕۆینـە ، وە ئەم ئایەتە نموونە هێنان «تمثیل» بۆ باسی گەورەیی و دەسەڵاتی خوا لـە ڕۆژی دوایی‌دا • لـە جیهانا جیهـان جیهانی هۆیە ، هەمووشتێك وائەبینرێ ئەوەندەی کـە پەیوەندی هـەیە لەگـەڵ خوادا ، ئەوەندەش پەیوەستی هـەیە لەگـەڵ هۆدا ، بەڵـکو پـەیوەستی لەگـــەڵ هـۆدا ئاشکراترو نمایانترە بەلای ئەوکەسانەی کـە دیمەن‌پەرستن ، ئنجا لـە ڕۆژی دوایی‌دا چونـکە هۆکـــان نامێنێ ، وە هـــەرچی دەســەڵات و تەوانایی هـەیە هەمووی هەر بۆ خوایە ، لەبەرئەوە دەسەڵاتی خوا لـە جیهانا چەند دەرکەوتبێ لـە ڕۆژی دوایی‌دا گەلێ زیاتر دەرئەکەوێ ، وە ئەگـەر تەختی فەرمانڕانیی‌یەکەی جـاران لەسـەر شـانی چـوار فریشتە بووبێ ، ئـەمڕۆ لەسـەر شـانی هەشت فریشتە ئەبێ ، واتـە دەســەڵاتەکەی دووچەندانەی جـاران دەرئەکـەوێ ، ئـەگینا خـــوای

گــەورە نە تەن‌و قەبارە « جسم‌و حجم »ی، تا لەســەر تەخت دانیشێ ، وە نە ئادەمیی‌یە ، تا لە شوێنێك بێ‌و لە شوێنێك نەبێ ، بەڵــکو خوا بــە زانین لە هەموو شوێنێکە ، وە ئاگای لــە هەموو شتێکە ، یەك شت نی‌یە لــە هەموو بوونەوەرا کــە خــوا ئاگــای لێ نەبێ چــاوی تێــوە نەبێ .

لــە تەفسیری قاسمی‌دا ئەفەرموێ : هێندێك لــە زانایانی ئاسمان ، بەلایانەوە وایە کــە مەبەس لە «عرش» خاوەنداریی خوایە بۆ ئاسمان‌و زەویی ، وە مەبەس لــە «ثمانیة» حــەوت ئاسمانە لەگەڵ زەویی‌دا کــە ئەکــاتە هەشت ، وە لــە تەفسیری ئایەتی « ویحمل عرش ربك فوقهم یومئذ ثمانیة »دا ئەڵێ : لە ڕۆژی دوایی‌دا زەویی‌یەك‌و حەوت ئاسمان تەختی خوای تۆ هەڵئەگرێ لەژوور ســەری فریشتەکانەوە ، واتــە چۆن لــە جیهانا فەرمانڕانیی بەســەر زەویی‌یەك‌و حەوت ئاسمانا بووە ، لــە ڕۆژی دوایشا هــەر وایە ، بەڵام ئەو زەویی‌و ئاسمانانە گــەلێ گەلێ گەورەترن .

ئەگــەر ڕاستت ئەوێ ئەم ووتەو ووتارانە کــە بــە کوردیی یا عــەرەبی یا بە هــەر زبانێــکی‌تر دانراوون ، بۆ تەعبیردانەوەیە لــە مەبەسان «معانی»ی جیهانی ، مەبەسانی ڕۆژی دوایی لە جیهانا ووتەیان بۆ دانەنراوە ، کــەوابوو تەعبیردانەوە لــە مەبەسانی ڕۆژی دوایی بــە ووتەی جیهانی ، وەك باسی فەلسەفەو نهێنی سروشت «طبیعت» وایــە ، کــە بەئاماژە «اشارە»ی دەست‌و چاوو سەر بی‌کەیت ، یا وەك باسی تامی شیرینی یا سوێریی یا باسی ترس یا برسێتی وایــە کــە بی‌کــەیت بۆ

یَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ ، لا تَخْفَى مِنْكُمْ خافِيَةٌ (١٨)

لەوڕۆژەدا ئەنوێنرێن (بە بەردەمی خوادا) هیچ (گوفتارو کردارێکی) پەنهانیتان بەنهێنی نامێنێتەوە (١٨)

یەکێك کە خۆی نەزانێ ئەمانە چین ، بەڵکو وەك باسی جۆرە خۆشی‌یەك وایە کە بکرێ بۆ مناڵێك کە هێشتا خۆی نەناسی‌بێ .

مسڵمان کە ئەم ئایەتانەی بیست هەر ئەمەندەی دێتە بیر کە لەوڕۆژەدا گەورەیی‌و دەسەڵات هەر بۆ خوایە ، وە هیچ کەسێك نانوێنێ تەنیا خوا نەبێ ، وە دەسەڵات‌و گەورەیی خوا بە دوو چەندانەو دە چەندانەی جیهان دێتە پێش چاو ، لەوڕۆژەی کە هەرچی ئادەمیی هەیە لە بەردەمی گەورەیی خوادا ڕائەگیرێن ، وە هەرچی کرابێ لە جیهانا لە گوفتارو کرداری خراپ ئەخوێنرێتەوە ، وە هیچی وون‌نابێ ، وەکو ئەفەرموێ ( یومئذ تعرضون ) لەوڕۆژەدا هەموو لایەکتان ـ ئەی ئادەمیی ـ بە بەردەمی خوادا ئەبرێن‌و نیشان ئەدرێن ، بە خۆتان‌و بیرو باوەڕو کردەوەو ڕەووشت‌و خووتانەوە بە بێ‌پەردە ، واتە لەو ڕۆژەدا هەروەك لەشتان ڕووت‌و قووت ئەبێ ، هەرچیش بەدڵتانا هاتبێ لە جیهانا ، وە هەر کردەوەیەکتان کردبێ جوان یا ناشرین ، بەئاشکرا یا پەنهان ، هەمووی بێ‌پەردە دێتەڕوو ، وەکو ئەفەرموێ ( لا تخفی منکم خافیة )هیچ کردەوەیەکی پەنهانیتان بەنهێنی نامێنێتەوە ، واتە ئەو شتانەی کە لە جیهاندا بەدزی‌یەوە کردووتانە ، وە نەتان هێشتووە کەس بزانێ ، ئەمڕۆ لە بەرچاوی خواو بەندەگان ئاشکرا ئەبن ، ئنجا خۆزگە بەوانەی کە

هەرچی گوفتارو کرداریان هەیە هەمووی جوانە ، وە شەرمەزاریش بۆ ئەوانەی کـە شتی ناشرینیان لێ قەوماوە ، وە لەوڕۆژەدا لـە بەردەمی خواو بەندەگانا دێنەڕوو ، بە ڕەنگێکیوا کـە مەردومی شەرمەزار لـە عەرەقی شەرمـەزاریی خـۆیا نوقوم ئەبێ ، لەپاشا پاداشی هـەموو کردەوەیەك ئەدرێتەوە ، چاکە بە چاکەو خراپە بە خراپە ، وەك لە ئایەتی دواییدا باسی ئەکات .

★ ★ ★

ئەمـە دەستوورو باوی جیهانە ، هـەرکەسێك کـە نامـەیەکی مزگێنی بدرێتێ خێـرا ڕووی تێئەکات ، وە بە هەموو هۆشو گۆشو هەستو وورپایییەکەوە ، بە دەستی ڕاستی وەریئەگرێ ، نەوەك لـە دەستی بکەوێتە خوارەوە ، وە ئـەو نامـەیە لەخۆشیانا نیشانی هـەموو دۆستو برادەرێـکی ئەدات کـە بیخوێننەوە ، بەڵام ئەگـەر نامـەیەکی ناخۆشی بدرێتێ ، وەك فەرمانی هەڵواسین یا شتێکیتری وا ، ئەوکـاتە نایەوێ وەری گرێ ، وە ئەگـەر هـەر ناچاریش بوو بە وەرگرتنی ، بـە ساردییەکەوە بە دەستی چـەپی وەریئەگرێ ، سا بەڵـکو لـە دەستی بـکەوێتە خوارەوە ، کەوابوو نامـە وەرگرتن بە دەستی ڕاست ، یا بـە دەستی چـەپ ، یا لەپشتەوە ، نموونەهێنانەوە «تمثیل»ی حاڵی کەسێکە کـە لەوڕۆژەدا تێبگات لـە کردەوەی خۆی کـە پاکە یا پیسە ، ئنجا هیوا هـەیە لەوڕۆژەدا بـە کردەوەی خـۆی کەیفخۆش ئـەبێو ئەگەشێتەوە ، کـە ئەمە ناوبراوە بە وەرگرتنی نامـە بە دەستی ڕاست ،

فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ ، فَيَقُولُ : هَاؤُمُ اقْرَأُوا كِتَابِيَهْ (١٩) إِنِّي ظَنَنْتُ أَنِّي مُلَاقٍ حِسَابِيَهْ (٢٠) فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَاضِيَةٍ (٢١)

ئنجا ئەوکەسەی کە نامەی (کردەوەی) درایە دەستی ڕاستی ، ئەڵێ : ها نامەکەم بگرنو بیخوێننەوە (١٩) من خۆم ئەمزانی کە تووشی ئەم لێپرسینەوەیە ئەبم (٢٠) ئەوکەسە لە زیندەگانییەکی پەسەندا ئەبێ (٢١)

وە هیواش هەیە گرژ نەبێو ناوچەوان ئەدا بەیەکا ، یا ڕووی لێ وەرئەگێڕێو پشتیتێ ئەکات کە ئەمەش ناوبراوە بە وەرگرتنی نامە بە دەستی چەپ یا لەپشتەوە ، وەکو ئەفەرموێ ( فاما من اوتی کتابه بیمینه ) ئنجا ئەوکەسەی کە نامەی کردەوەی درایە دەستی ڕاستی ، ئەوەندە کەیفخۆش ئەبێ لەخۆشیانا بانگی ئەو خەڵقە ئەکات ( فیقول هاؤم )و ئەڵێ : بگرن ( اقرءوا کتابیه ) نامەکەم بخوێننەوە ( انی ظننت انی ملاق حسابیه ) من لە جیهانا ئەمزانی کە تووشی ئەم لێپرسینەوەیە ئەبم ، لەبەرئەوە هەمیشە خۆم ئامادە ئەکرد بۆ ئەمڕۆژە ، بە کردەوەی چاکو گوفتاری پاك ، ئنجا ئەمجۆرە کەسانە بە بەری کردەوەو تەقەلای پاکو تەمیزی خۆیان ، وە بە پلەی هەرە بەرزی شادمانیی ئەگەن ، وەکو ئەفەرموێ ( فهو في عیشة راضیة ) ئەوکەسەی کە نامەکەی بدرێتە دەستی ڕاستی ، لە زیندەگانییەکی پەسەندو هەڵبژێرراوا

فِي جَنَّـةٍ عالِيَـةٍ (٢٢) قُطُوفُهـا دانِيَـةٌ ( ٢٣ ) كُلُوا وَاشْـرَبُوا هَنيئاً بِما أَسْلَفْتُمْ فِي الْأَيامِ الْخالِيَـةِ (٢٤)

له بەهەشتێکی بەرزا (٢٢) کـــە میوەی نزیـکە دەستە (٢٣) ( پێیان ئەووترێ : ) بخۆن‌و بخۆنەوە نۆشتان‌بێ بەهۆی ئەو چاکانەوە کــە لە ڕۆژی ڕابوردوودا کردووتانە (٢٤)

ئەژیی ( في جنة عالية ) له بەهەشتێکی بەرزو خۆشیی‌وادا ، کە ( قطوفها دانیــة ) میوەی نزیکە دەستە ، ئنجا پێیان ئەووترێ ( کلوا واشربوا ) بخۆن‌و بخۆنەوە لــە خواردەمەنیی خۆشیی بەهەشت ( هنیئا ) بــە نۆشی گیانتان بێ ( بما اسلفتم في الايام الخالية ) بەهۆی ئەو کردەوە باشــانەی کە کردووتانە لە ڕۆژانی ڕابوردووی جیهانا •

نازو خۆشیی مسلمان لــە بەهەشتا زۆرتر گیانی‌یە ، واتــە هەر بە گیــان خۆشیی وەرئەگرن ، وە لە دەریای خۆشەویستی خوای گەورەدا نوقوم ئەبن ، ئەو خۆشەویستی‌یەی کــە هەرچی خۆشیی‌و ڕابواردنی تر هــەیە لەچــاو ئــەوا ، نانوێنێ ، کــەوابوو مەبەس لــەم ئایەتە هــەر خواردن‌و خواردنەوە نی‌یە ، بەڵــکو وەرگرتنی هەموو جۆرە بەهرەو خۆشی‌یەکی بەهەشتی‌یە ، کــە هەرە گەورەکەی نزیک‌کەوتنەوەیە لــە بارەگای خواو نوقوم‌بوونە لــە دەریای خۆشیی‌و خۆشەویستی ئــەوا ، وە هــەرە بچووکەکەشی خواردن‌و خواردنەوەیە ، کە زۆرترینی ئادەمیی هــەر ئەمەیان ئەزانن •

وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِشِمَالِهِ فَيَقُولُ : يَا لَيْتَنِي لَمْ أُوتَ كِتَابِيَهْ ( ٢٥ ) وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيَهْ (٢٦) يَا لَيْتَهَا كَانَتِ الْقَاضِيَةَ ( ٢٧ ) مَا أَغْنَى عَنِّي مَالِيَهْ ( ٢٨ ) هَلَكَ عَنِّي سُلْطَانِيَهْ (٢٩)

---

وە ئەوكەسەی کە نامە درایە دەستی چەپی ئەڵێ : خۆزگە نامەم هەر نەدرایەتێ (٢٥) وە نەمزانیایە چی‌یە ( سەرەنجامی ) لێ‌پرسینەوەم (٢٦) خۆزگە بە مردنی جیهان ڕزگارم بوایە (٢٧) هیچ قازانجێکی پێ‌نەدام ماڵەکەم (٢٨)لە دەستم چوو دەستڕۆینەکەم (٢٩)

---

لەدوای باسی کەیف‌خۆشیی چاکان بە وەرگرتنی نامە بە دەستی ڕاستیان‌و خۆش ڕابواردنیان لە بەهەشتا ، ئنجا باسی دڵتەنگیی بێ‌بڕوایان ئەکات ، بە وەرگرتنی نامە بە دەستی چەپیان ، لەگەڵ باسی ئازارو سزایان لە دۆزەخا ، ئەفەرموێ ( واما من أوتی کتابه بشماله ) ئەوکەسەی کە نامەی کردەوەی بدرێتە دەستی چەپی ( فیقول : یالیتنی لم أوت کتابیه ) ئەڵێ خۆزگە نامەم هەر نەدرایەتێ ( ولم ادر ما حسابیه )وە نەمزانیایە کە سەرەنجامی لێ‌پرسینەوەم چی‌یە ( یالیتها کانت القاضیة ) خۆزگە هەر بە مردنی جیهان ڕزگارم بوایە ، واتە جارێکی‌تر زیندوو نەکرامایەوە ، تا ئەمڕۆژە ببینم ــ کە هەر هەناسەیەکی مردنێکە ــ ( ما أغنی عنه مالیه ) ئەو دارایی‌یەی کە لە جیهانا بووم ئەمڕۆ هیچ قازانجێکی پێ نەدام ( هلك عنی سلطانیه ) لە دەستم چوو

خُذُوهُ فَغُلُّوهُ (٣٠) ثُمَّ الْجَحِيمَ صَلُّوهُ (٣١) ثُمَّ فِي سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعاً فَاسْلُكُوهُ (٣٢)

(ئنجا به دەرگەوانی دۆزەخ ئەووترێ) بیگرەو زنجیر بخەرە دەست‌و گەردنی (٣٠) لەپاشا بی‌سووتێنە لـە دۆزەخا (٣١) ئنجا بە زنجیرێـکی حەفتاگەزیی بی‌بەستەوە (٣٢)

دەست‌ڕۆینەکـــەم ، واتـــە نـــە قازانجی پێ گـەیاندم‌و نە زیانی لێ دوورخستمەوە •

هــەروەك لەپێشەوە قسەیەکی خۆش درا بە گوێچکەی چاکانا ، وە پێیان ووترا : « کلوا واشربوا هنیئا بمـــا اسلفتم في الأيام الخاليـــة » بۆئەوەی کـە هەرچی ناخۆشیی هەیە لـە دڵیانا نەمێنێ ، لێرەشا پێشەکی قسەیەکی تێجگار ناخۆش ئەدرێ بە گوێچکەی خراپانا بۆئەوەی کە ئیتر هیچ هیوایەکیان نەمێنێ • بەم‌ڕەنـگە بە دەرگەوانی دۆزەخ ئەووترێ بۆ هــەموو دۆزەخی‌یەك (خــذوه) بیگرن (فغلوه)و کۆت‌و زنجیر بـکەنە گـەردن‌و دەستی ( ثم الجحيم صلوه ) لەپاشا بی‌سووتێنن لـە دۆزەخـا ( ثم في سلسلة ذرعها سبعون ذراعا فاسلكوه )ئنجا بە زنجیرێکی حـــەفتا گەزیی بی‌بەستنەوە •

ئـەم ژمارانە لە قورئانا بەڵـکو لە هەموو زبانێـکا بریتی «کنایة»یە لـە زۆریی ، وەك لـە ئایەتێـکی‌ترا کـە خوا بە پێغەمبەر ئەفەرموێ دان

اِنَّهُ كانَ لا يُؤْمِنُ بِاللهِ الْعَظِيمِ (٣٣) وَلا يَحُضُّ عَلى طَعامِ الْمِسْكِينِ (٣٤)

(چونکە) ئەو بڕوای بە خوای گەورە نەئەکرد (٣٣)وە هانە هانەی کەسی نەئەدا لەسەر بەخێوکردنی هەژاران (٣٤)

تستغفر لهم سبعين مرة فلن يغفر الله لهم /التوبه/٨٠»[1] ئەمە مانای وا نی‌یە ئەگەر پێغەمبەر حەفتاویەك جار بۆیان بپاڕێتەوە خوا لێیان خۆش ئەبێ ، بەڵکو مانای وایە کە هەرگیز خوا لێیان خۆش نابێ ، با هەزاران جاریش پێغەمبەر بۆیان بپاڕێتەوە ، ئنجا هەر بەمڕەنگە ئەم ئایەتەی تێرەش مانای وایە کە بە زنجیری درێژ بی‌یان‌بەستەوە هەر بۆئەوەی کە دڵیان تەنگ ببێ‌و خەفەتبار بن ٠

ئنجا باسی مایەی ئەم سزایەمان بۆ ئەکات ئەفەرموێ : ئەم سزایە کە ئەدرێن ، لەبەر دوو گوناهی زۆر گەورەیە :

١ ـ ( انه كان لا يؤمن بالله العظيم )ئەوکەسە لە جیهانا بڕوای بە خوای گەورە نەئەکرد ٠

٢ ـ ( ولا يحض على طعام المسكين ) هانەهانەی مەردومی نەئەدا لەسەر ناندانی هەژاران‌و یارمەتیی‌و دەست‌گرتنیان ٠

(١) واتە ئەگەر حەفتا جار داوای لێخۆشبوون بکەیت بۆ ئەو ناپاکانە خوا لێیان خۆش نابێ ٠

بەڕاستی بڕوا بە خوا سەرچاوەی بیرو باوەڕی باشە ، هـەروەك بەزەیی هاتنـەوە بە هـەژارانو لێقەوماوانا ، سەرچـاوەی ڕەووشتو خووی بەرزە ، لەبەرئەوە خـوا لێرەدا هـەردووکیانی کۆکردەوە ، وە فەرمووی مـایەی سزایان ، بێبڕوایی‌یانە بـە خـواو ، دڵڕەقی‌یانە دەربارەی هەژاران .

خوا بـەم ئایەتـەو گـەلێ ئایەتی‌تر پێویستی کردووە لەسـەر مسڵمانان کـە بە هەموو هێزو تەوانایی خۆیانەوە یارمەتی هەژاران بدەن ، وە هانەهانەی مـەردوم بدەن لەسـەر دەستگرتنو یارمەتی دانیـان ، کـە ئەمـەش شێوەی کۆمەڵانی چاکـە « جمعیاتی خیری » ، کەوابوو قورئان بـەم ئایەتە ، وە بـە ئایەتی سوورەی «فجر» کـە ئەفەرموێ ، «کلا بل لا تکرمون الیتیم ولا تحاضون علی طعام المسکین »[1] وە ئایەتی سوورەی «ماعون» کە ئەفەرموێ « ارایت الذی یـکذب بالـدین ، فذلك الذی یدع الیتیم ولا یحض علی طعـام المسکین »[2] پێویستی کردووە لەسـەر مسڵمانان کـە لە هەموو شارێك کۆمەڵانی چاك ڕێكبخـەن ، وە هـەووڵبدەن بۆ یارمـەتیو دەستگرتنی هـەژاران ، وە بۆ ڕزگارکردنی خۆیانو مـاڵو مناڵیان لەدەست هـەژارییو نەخۆشییو نەخوێندەواریی .

---

(١) واتە نە وانی‌یە ، بەڵـکو ئێوە ڕێزی هەتیوان ناگرن ، وە هـانە هانەی یەکتریی نادەن لەسەر بەخێوکردنی هەژاران .

(٢) واتە ئایا دییت ئەوکەسەی کـە بڕوا ناکـات بە ئایین ، ئەوە کەسێکە کە هەتیو دەرئەکاتو هانە هانەی مەردوم نادات لەسەر بەخێوکردنی هەژاران .

فَلَيْسَ لَهُ الْيَوْمَ هَا هُنَا حَمِيمٌ ( ٣٥ )

ئەمرۆ ئەویش لێرە نە دڵسۆزێـکی هەیە (یارمەتی بدات) (٣٥)

- تەماشاکــە ئاینی پاکی ئیسلام هـەر بەمـەندە وازناهێنێ لــە مسڵمانان کــە لـە دەمی خۆیانو مـاڵو ماڵیان بـگرنەوە بۆ یارمـــەتی هـەژاران ، بەڵـکو پێویستیشی کردووە لەگـەڵ ئەوەدا ، هانەهـانەی مەردومان بە دەست گرتنو یارمەتی‌یان •

یەکێك تۆزێ بڕوای بە خـوا بێ ، بەم ئایەتە موچڕکی پیادێو سامی لێ ئەنیشێ ، چونـکە ڕێك‌نەخستنی کۆمـــەڵانی چـــاكو پارە کۆنەکردنەوە لەناو مسڵمانانا بۆ هـــەنیوانو هـــەژارانی کردووە بـــە هاوشانی بڕوا نەهێنان بە خوای گـەورە ، زۆر جێی داخو خەفەتە ، قورئانەکەی ئێمــە کــە پڕە لەم جۆرە فەرموودەو فەرمانانە کـــاری پێ‌ناکەین ، وە انجیلی گاورەکان کــە شتی‌وای تیـا نی‌یە ، کەچی لــە هەموو کڵیسەیەکا سندووقێك هەڵواسراوە بۆ هەژاران •

ئنجـا ئـەم جۆرە کەسانەی کە بەزەیی‌یان بە کەسا نایەتەوە ، وە ئاگایان لە هەژارانی وولاتەکەیان نی‌یە ، خواش لە ڕۆژی دوایی‌دا بــە وێنەی کردەوەکـەی خـۆیان ، پاداشیان ئەداتەوە ، وەکو ئەفـەرموێ ( فلیس له الیوم ها هنا حمیم ) ئەمرۆ ئەویش لێرەدا کەسێکی دڵسۆزی نی‌یە کــە یارمــەتی بدات ، هەروەك ئەو لە جیهانا یارمەتی کەسی نەداوە

وَلا طَعامٌ اِلاّ مِنْ غِسْلِينٍ (٣٦) لا يَأكُلُهُ اِلاّ الْخاطِئُونَ (٣٧)

وە نە خۆراکێك مەگەر لە کێم و زووخی جەستەی دۆزەخییان (٣٦) کە (کەس) نایخوا گوناهباران نەبێ (٣٧)

( ولا طعـام ) وە نییە بۆ ئەوکەسـانە لـەوڕۆژەدا هیچ جـۆرە خواردەمەنییەك ( الا من غسلين ) مەگـەر لە کێم و زووخی جەسـتەی دۆزەخییان ، کە ئەوەش ( لا يأكله الا الخاطئون ) نایخوات گوناهبارانی دڵڕەقی دڵڕەش نەبێ ، کـە هـەرگیز لـە جیهانا خواردنێـکی پاك و تەمیـزیان نەداوە بە هەژاران ، مەگـەر پاشماوەی کۆن و بۆگـەنی وانەبێ کـە وەختی ڕشتنی هاتبێ ، واتە دۆزەخیی کە برسیان بوو بـە برسێتییەك کـە شایستەی ئەوە دنیـا بێ ، شتی زۆرپیس و بۆگـەنیان ئەدرێتێ بەرانبـەر بەو خواردنە پیسانەی کـە ئەوان لـە جیهانا ئەیاندا بە هەژاران .

★ ★ ★

لەدوای باسی بڕوایان بە ئایەتی « وأما من أوتي كتابه بشماله » وە باسی حکمدانیان بە ئایەتی « خذوه فغلوه » ، وە باسی مایەی سزاکـەیان بە ئایەتی « انه كان لا يؤمن » ، ئنجا هـاتە سـەر باسی سەرکۆنەی بێبڕواکانی مەککە ، کـە دەمێ بە پێغەمبەریان ئەووت شاعیرو دەمێك پێیان ئەووت جووکیی ، وە سوێند ئەخوات بە ئایەتی دوایی کـە ئەمـە وانییە .

فَلا اُقْسِمُ بِما تُبْصِرُونَ (٣٨) وَما لا تُبْصِرُونَ (٣٩)

سوێند بەوانەی کە ئەیانبینن (٣٨) وە بەوانەی کە نایانبینن (٣٩)

باوبووە لەناو عەرەبا ، ئەگەر جارێك یەکێك بیویستایە سوێند بخوات لەسەر شتێکی ئاشکرا کە پێویست نەبووایە بە سوێند ، ئەیووت « لا اقسم » سوێند ناخۆم کە ئەم شتە وایە ، واتە ئەوەندە ئاشکرایە پێویستی بە سوێند نییە ، هێندێك ئەڵێن ئەم « لا اقسم »وە ، بەکارئەهێنرێ بۆ گەورەیی سوێند پێخوراوەکە ، هەروەك سوێندخۆر بڵێ : من ئەم شتە بە سوێند پێخواردنی گەورەی ناکەم ، چونکە لەخۆیا گەورەیە ، سوێندی بێ بخۆم یا بێ‌ی نەخۆم ، ئنجا مەبەستەکە هەرکامێکیان بێ ، هەر سوێند خواردنە لە مانادا ، وەك لە سوورەی « واقعه »دا ئەفەرموێ « فلا اقسم بمواقع النجوم ، وانه لقسم لو تعلمون عظیم »(١) تەنانەت ئەمە ئێستاش هەر هەیە ، زۆرجار دوو کەس کە لەسەر شتێك دەمیان تێ‌ئەگیرێ ، یەکێکیان بەوی‌تر ئەڵێ پێویست بە سوێندخواردن نییە ، یا پێویست ناکات سوێند بخۆم کە ئەم شتە وایە ،

ئنجا خواش لەسەر دەستووری ئەوان ، ئەفەرموێ ( فلا اقسم بما تبصرون ) سوێند ناخۆم بەو شتانەی کە بە چاو ئەیانبینن ( وما لا تبصرون )وە بەوانەی کە نایانبینن ، واتە ئەم بوونەوەرە گەورەیە کە

(١) واتە سوێند ناخۆم بەوشوێنانەی کە ئەستێرەی لێ هەڵدێ‌و لێ ئاوا ئەبێ ، وە ئەمە سوێندێکی گەورەیە ئەگەر بزانن ٠

اِنَّـــهُ لَقَولُ رَسولٍ كَريمٍ (٤٠) وَما هُوَ بِقَولِ شاعِرٍ ،

ئەم قورئانە فەرموودەی ڕەوانەکراوێکی گەورەیە (٤٠) وە قسەی شاعیر نی‌یە ،

خوا دروستی کردووە ـ کـە کۆمـەڵەی ڕۆژیی ئێمـە ، بـــە ڕۆژو مانگ‌و ئەستێرەو زەویی‌یەوە ، بەقـەد زەنگیانەیەکە لەچاو ئەوا ـ ئەبێ چـاو هەنای چەندی بـکات ، وە ژیریی‌و بیر تا چەندە بڕ بکات ، وە زانینی ئێمـە ئەبێ چـەند بێ لەچـــاو بوونەوەرو نهێنی بوونەوەرا ، کـەوابوو ڕەوا نی‌یە بۆ ئادەمیی هـەرچی بـــە چـاو نەی‌بینێ ، وەیا ژیریی‌و بیری پەیی پێ نەبات ، خێـــرا بەدرۆی دەرکـــات ، وەك سرووشی قورئان بۆ سەر دڵی پێغەمبەری ئیسلام •

بەم سوێندە نیشان‌ئەدات کـە هـەرچی خـوا دروستی کردووە بە بێ‌نموودیان مـەزانن ، وە هەموو شایستەی ووردبوونەوەن ، واتـــە سوێند بە هـەرچی شت هـەیە لە جیهانا بە بینراوو نەبینراویانەوە کـــە یەکێکیان خوا خۆیەتی (انه لقول رسول كريم) ئەم قورئانە فەرموودەی ڕەوانەکراوێـکی گـەورەیە کە لەلایەن خواوە بۆتان ئەهێنێ وە لـــە زبان ئەوەوە پێتان ئەڵێ ( وما هو بقول شاعر )وە ئـەم قورئانە قسـەی شاعر نی‌یە ، وەك هێندیکتان ئەڵێن ، چونـکە جگە لەوە کە پێغەمبـــەر محـەوەتی هـــەیە هێشتا شیعرێـکی نەوتووە ، وە شیعرێـکی بەڕاستی نەخوێندۆتەوە ـ لـە هـەموو قورئانیشا یەك شیعری تەواوی تیـا نی‌یە

قـَلِیلاً ما تُؤْمِنُونَ (٤١) وَلا بِقَوْلِ كاهِنٍ

زۆر کەم بڕوا ئەهێنن ( بە قورئان ) (٤١) وە قسەی جووکیی نیی‌یە

بەپێی دەستووری عەرووز ( قلیلا ما تؤمنون ) کـەم‌بڕوا ئەهێنن بـــە قورئان ( ولا بقول کـــاهن )وە قســـەی جووکیش نیی‌یـــە ، وەك هێندێکی‌ترتان ئەڵێن ، چونـکە جووکیی کـە قسـه لـە هێنـدێ شتی پەنهان‌و نادیار ئەکـات ، لەســەدا ئەگـــەر یەکێکیان وەك پلاری کوێریی بیگرێ ، نەوەدونۆیان بە درۆ دەرئەچن ، بەڵام قورئان هەمووی ڕاست‌و دروستە ، جـگە لەوە کە مەبەستی جووکیی لە جیهانا هەر ئەوەیە کـە بە درۆو دەلەسـە خۆی بژیەنێ ، ئیتر تائێستا جووکیی‌یەك نەبووە کـــە ئادەمیی هێنـابێتە سـەر ڕێ‌یەکی ڕاست ، وە دەستوورو شەریعەتێـکی دانابێ ، وە گەلێکی لە زیندانی دیلی‌و نەخوێندەواریی‌و هەژاریی ڕزگار کردبێ ، وەك پێغەمبەر کردوویەتی ، جگە لەوە ئەگـەر ئەم پێغەمبـەرە جووکیی بێ ئیتر چ‌نرخێك بۆ پێغەمبەرەکانی‌تر ئەمێنێتەوە ، چونـکە ئەمە ئاشکرایە لـە هـــەموو کەسێکەوە کـە ئایینی ئەم لە ئایینی هـــەموو پێغەمبەرەکانی‌تر تەواوترو ڕێك‌وپێك‌ترە ، وە نامەی ئەم لە نامەی ئەوان بەرزترو جوانترە ، وە ڕێك‌وپێك خستن « اصلاحات »ی ئـەم لـە هـی ئەوان زۆرترە ، ئنجـا ئەگـەر خـوانە خواستـە وەك ئەڵێن وابێ ، هیچ نرخێك نامێنێتەوە نە بۆ پێغەمبەرەکانی‌تر،وە نە بۆ ئایین‌یان‌و نە بۆ نامەیان، وە ئەبێ جووکیی‌یەك لە هەموو پێغەمبەرەکانی پێش خۆی گەورەتر بێ ،

قَلِيلاً مَا تَذَكَّرُونَ (٤٢) تَنْزِيلٌ مِنْ رَبِّ الْعَالَمِينَ ( ٤٣ ) وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ (٤٤)

زۆر کەم بیر ئەکەنەوە (٤٢) ( ئەم قورئانە) نێرراوەتە خوارەوە لە پەروەردگاری جیهانیانەوە ( ٤٣ ) ئەگەر (محمد) بەدەم ئێمەوە هێندێ وتانی هەڵبەستایە (٤٤)

ئنجا مرۆڤی زیر چۆن قسەی وا ئەکات ، وەکو ئەفەرموێ ( قليلا ما تذكرون ) کەم بیرئەکەنەوەو پەند لەگوێ ئەگرن ، واتە نە بڕوا ئەهێنن و نە پەند وەرئەگرن ، چونکە یەکێك بە پێغەمبەر بڵێ شاعیر یا جوکیی هەر بێبڕوایە ، نەك بڕوای کەمە .

ئنجا کەوابوو ( تنزيل من رب العالمين ) سرووشێکی خوایی‌یە هاتۆتە خوارەوە لە پەروەردگاری جیهانیانەوە بۆسەر دڵو دەروونی پێغەمبەری ئیسلام .

★ ★ ★

لەدوای ئەوەی کە فەرمووی قورئان سرووشێکی خوایی‌یە ، بۆ پێغەمبەر ، ئنجا ئەفەرموێ کە پێغەمبەریش ناتوانێ بەدرۆ قورئان هەڵبەستێ بەدەم ئێمەوە ، چونکە ئەگەر شتیوا بکات ، ئێمە لێی قبووڵ ناکەین ، وەکو ئەفەرموێ ( ولو تقول علينا بعض الاقاويل ) ئەگەر محمد « درووودی خوای لێ بێ » بەدەم ئێمەوە درۆی بکردایە ،

لَاَخَذْنا مِنْهُ بِالْيَمِينِ (٤٥) ثُمَّ لَقَطَعْنا مِنْهُ الْوَتِينَ (٤٦)
فَما مِنْكُمْ مِن اَحَدٍ عَنْهُ حاجِزِينَ (٤٧)

ئێمە بەدەستی خۆمان تۆڵەمان لێ ئەسەند(٤٥) لەپاشا ڕەگی گیانیمان ئەبڕیی (٤٦) وە کەس نەئەبوو لە ئێوە کە لەوە دووری بخاتەوە (٤٧)

وە هێندێك قسەی هەڵبەستایە ( لاخذنا منه باليمين ) بەڕاستی ئێمە بە دەسەڵاتی خۆمان تۆڵەمان لێ ئەسەند ( ثم لقطعنا منه الوتين ) لەپاشا ڕەگی گیانیمان ئەبڕیی ( فما منكم من احد عنه حاجزين ) ئەوکاتە کەس نەئەبوو لە ئێوە کە بتوانێ بکەوێتە ناوەندمانەوە ، وە سزای ئێمەی لێ دووربخاتەوە ، واتە هەرکەسێك بە درۆ بڵێ من پێغەمبەرم ، وە بەدەم ئێمەوە ووتار هەڵبەستێ زوو لە باڵی ئەدەین ، وە هەرگیز مەیدانی نادەین هەروەك لەمەپێش مەیدانی کەسێکمان نەداوە کە بەدرۆ خۆی کردبێ بە پێغەمبەر .

ئەگەر « بووذە »و « کنفوشیۆس »و « زەردەشت » ئەڵێن ـ کە حەوت‌سەد ملیون ئادەمیی لەسەر ئایینی ئەوانن ـ کێ ئەڵێ کە ئەمانە پێغەمبەر نەبوون ، نەخوازەلا زەردەشت کە زۆر لە زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوەن کە پێغەمبەرێکی خاوەن ئایین‌و نامە بووە ، ئەگەر ئەمڕۆ شتێکی پڕوپووچ لە ئایینەکەیانا بێ ، ئەوە هی خۆیان نی‌یە ، بەڵکو لەدوای خۆیان زیادکراوە لە ئایینەکەیان ، هەروەك هەزاران شت لە ئایینی ئیسلام‌و جوولەکەو گاوور زیاد کراوە ، بەڵام زۆر سوپاس بۆ خوا کە قورئانەکەمان بە پاکیی‌و دەست‌لێ‌نەدراویی ماوەتەوە .

چـۆن ئەگونجێ پێغەمبەرێتی پێغەمبــەر درۆ بێ ، تاقە مرۆڤێـکی هــەژاری ، بێ کەسی ، نەخوێندەواری ، جیهان نەدیدەی بێ گەیشتوو لەناو گەلێـکی پەستی ، بتپەرستی ، بێ وێلی ، بێ ڕەووشتو خـووی نەخوێنــدەوارا ، بانـگی مەردوم بـکات بۆ خواناسین ، وە بە ملیون و بلیون مەردوم بە دەنـگی یەوە بچن ، وە ئاینێکی جیهانی «عالەمی» بێنێ لــە مـاوەی بیستوسێ ســالا ، وە دەوڵەتێـکی ئیسلامی دامەزرێنێ ، لەپاش حەفتا ساڵ بەدرێژیی بیگرێ لــە «جاوە»و «فلیپین»ەو تا قەراغی دەریای ئەتلەسی ، وە بە پانی لــە « قازان »ەوە تا « سەیلان » وە گەلێـکی ئیسلام ڕێكخا لە تیرەو هۆزو نەتەوەی ئەو ناوچە گەورەیە ، وە سەدو پەنجـا تا دووســەد نەتەوایەتی بتوێنێتــەوە لــە بۆتەی ئیسلامەتی‌دا ، وە ئەمــانە بـکات بە برا ، وە جیاوازیی هەڵـگرێ لەناویانا ، وە قـــەڵاو کۆشکێکی گەورەیان بۆ دروست بـکات ، وە دەستوورو شەریعەتێکی وای بۆ دانابن کــە مایەی ژیانی هــەردو جیهانیان بێ ، وە ئەمە یەکەم جـــار بێ لــە مێژووی ئادەمیی‌دا کــە پێغەمبــەرێك هاتبێ‌و توانی‌بێتی ئادەمیی یەکخـا بە هــەموو تیــرەو هۆزو نەتەوەیەکی‌یەوە ، وە تاكو تەنیایی خــوا بــەو ڕەنـگەی کــە قورئان ئەفەرموێ بلاوی بـکاتەوە لەناویانا .

جـگە لەوە کە نامەیەکی بەرزی زانینی «علمی» وەك قورئانیشی هێنابێ ، وە دەرگـــای زانینی لــە کۆمـــەڵی ئادەمیی کردبێتەوە ، وە قوتابخانەیەکی ئیسلامەتی دانابێ ، وە بە ملیون پێشەواو زاناو بزانی لێ دەرچووبێ ، وە بــە ملیۆنەهــا کتێبیان دانابێ لــە هــەموو جۆرە زانیــاری‌یەکدا ، کــە نامەخانەکــانی ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا ئــەمڕۆ بــە

دەستنووسەکانی ئەوانەوە شانازیی ئەکەن •

هەروەك «تۆماس کارلایل» ئەڵێ لە «الابطال»دا : ئەگەر ئەمەی پێغەمبەر کردوویەتی بناغەی لەسەر درۆ بێ ، ئەوکاتە ئەبێ جیهانیش بناغەی لەسەر درۆ بێ وە هەرچی هەیە لە جیهانا بە ڕۆژو مانگ‌و ئەستێرەو زەویی‌یەوە هەمووی درۆ بێ ، وە هەمووی ڕێشکەو پێشکەی چاو بێ •

ئەگونجێ یەکێك بڵێ لەم دواییەدا چەند شارستانێتی‌یەك ڕاست بۆتەوە ، کە بەڕاستی مەردومیان سەرسام کردووە بە هێزو کردەوەی بەکەڵکیانەوە ، کە ئەمانە هیچ پەیوەستی‌یەکیان بە ئیسلامەتی‌یەوە ، نی‌یە ، وە لەسەر بناغەی دینی ئیسلام نین ، وە بەڵکو وەك لافاو هاتووشن بەسەر ئیسلامەتی‌دا ، وە وەختە ڕیشەی لە بن دەربێنن ، ئنجا ئەگەر یەکێك وابڵێ منیش ئەڵێم :

١ ـ ئەگەر پێغەمبەرو قورئان نەبوایە کە دەرگای سەربەستێتی زیریی‌و بیرو زانینی کردەوە لە کۆمەڵی ئادەمیی ، نە شۆرشی «لۆتر» ئەبوو ، نە ئەمڕۆ ئەم شارستانێتی‌یە ئەبوو ، بەڵێ ئەگونجێ هەر ببوایە ، بەڵام لەپاش هەزاران ساڵی‌تر ئەبوو •

٢ ـ ئەگەر پێغەمبەر ئەمڕۆ بێتەوە جیهان ، وە بەناو هەموو عالەمی ئیسلاما بگەڕێ ، نە ئوممەتەکەی خۆی ئەناسێتەوە ، وە نە ئاینەکەی خۆی ، وە نە ڕازیی ئەبێ لە شارستانێتی‌یان ، هەروا ئەگەر بگەڕێ بەناو هەموو ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوادا ، چاوی ڕوون ئەبێتەوە بە هەوڵ‌و کۆششیان لەڕێی دەرخستنی مواهبی ئادەمیی‌و خۆشیی‌و

وَإِنَّهُ لَتَذْكِرَةٌ لِلْمُتَّقِينَ (٤٨)

وە ئەم قورئانە بێ‌گومان پەندە بۆ پارێزگاران (٤٨)

ئاسوودەگیی گشتی‌و دۆزینەوەی نهێنی‌یانی جیهان‌و کەرەسەو هێــزە سامناکەکانی ناوزەوی‌و بۆشایی هەوا ، کــە خــوا ئەمــانەی بۆ قازانجی ئادەمیی داناوە ، وە پڕ بە دڵ کردەوەو کۆششنە باشەکانیان پەسەند ئەکات ، سا مەگــەر ئەوشتانەیان نەبێ کە بێ‌شەرعین ، وە دوورن لە سرووشتی پاکی ئادەمی‌یەوە ، وە پێچــەوانەی فەرموودەی خواو پێغەمبــەرن ، کــە ئەمڕۆ زۆرکەس لە خۆشیان ئەم جۆرە شتانەیان ناوێ ، وە هەمیشە بە نووسین داوای هەڵگرتنیان ئەکەن ، وەك عەرەق‌و قومارو بەربەرەڵایی‌و گــەلێ شتی‌تر .

بەڵکو ئەگــەر عیساو محمد بێنەوە جیهان ، پێغەمبەر فەرموودەی قورئان لــەناو گاورەکــانا ئەبینێ‌و عیساش فەرموودەی انجیل لەناو مسڵمانەکانا ئەبینێ .

★ ★ ★

ئنجا کاتێك کــە دەرکــەوت قورئان سرووشێــکی خوایی‌یە ، ئەمــەش دەرکــەوت کــە ئەفەرموێ ( وانه لتذكرة للمتقين ) بێ‌گومــان قورئان ئامۆژگاریی‌یە بۆ ئەوکەسانەی کــە لــە ناڕەزایی خــوا خۆیان ئەپارێزن ، واتە ئەوکەسانەی کە دڵ‌و دەروونێکی پاك ، وە سرووشتێکی چاکیان هــەیە ، گوێی بۆئەگرن ، وە دڵی ئــەدەنێ ، وە بەهــرەی لێ

وَاِنَّا لَنَعْلَمُ أنَّ مِنْكُمْ مُكَذِّبِينَ (٤٩) وَاِنَّهُ لَحَسْرَةٌ عَلَى الْكَافِرِينَ (٥٠) وَاِنَّهُ لَحَقُّ الْيَقِينِ (٥١)

---

وە ئێمە ئەزانین کە هێندێکتان قورئان بەدرۆ ئەزانن (٤٩) وە بێ گومان قورئان (مایەی) خەفەتی بێ‌بڕوایانە (٥٠) وە بەڕاستی قورئان ڕاست‌و دروستە (٥١)

---

وەرئەگرن ، بەڵام ئەو بێ‌بڕوایانەی کە نایانەوێ گوێی لێ بگرن‌و دڵی بدەنێ‌و بیری لێ بکەنەوە ، وە هەر لەخۆیانەوە ئەچن بەگژیاو بەدرۆی ئەزانن ، ئەوانە خوا هەڕەشەیان لێ ئەکات ئەفەرموێ ( وانا لنعلم ان منکم مکذبین ) بەڕاستی ئێمە ئەزانین کە هێندێکتان قورئان بە درۆ ئەزانن ، واتە ئاگامان لێتانە ، وەلێمان وون‌نابن ، وە ئەم بێ‌بڕوایی ئێوەیە کارناکاتە سەر قورئان ، وە نابێ بە گەردی داوێنی ، بەڵام کاتێك کە ڕووناکیی قورئان لە جیهانا بڵاوبووەوە ، یا لە ڕۆژی دواییدا دەرکەوت ڕزگاربوونی ئەوانەی کە بڕوایان پێ هێناوە ، ئەوکاتە ئنجا قورئان ئەبێ بە داخی دڵیان کە بۆچی بڕوایان پێ نەهێناوە ، وەکو ئەفەرموێ ( وانە لحسرة علی الکافرین )وە قورئان مایەی داخ‌و خەفەت‌و پەشیمانی‌یە بۆ بێ‌بڕوایان ( وانە لحق الیقین )وە قورئان ڕاست‌و دروست‌و بێ‌گومانە •

ئنجا هەرگاە قورئان وابوو کە ووترا ، وە ئەوانەی کە باوەڕپێشت پێ‌ناکەن ، دووچاری ڕۆژی ڕەشی خۆیان ئەبن ، وەك لەپێشەوە ووترا ،

فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ (٥٢)

کەواتە (ئەی پێغەمبەر) تۆش هەمیشە یادی پەروەردگاری گـەورەی خۆت بکە (٥٢)

کەوابوو بێهیوا مەبە ئەی پێغەمبەری خوا ، وە هەمیشە سوپاس و ستایشی ئەو خوایە بکە کەوا ئەم پایە بڵندەی داویتێ ، وە کردووتی بە پێغەمبەر ، وەکو ئەفەرموێ ( فسبح باسم ربك العظيم ) ئنجا ئەی پێغەمبەر هەمیشە یادی خوای گەورەی خۆت بکە ، وە سوپاس و ستایشی بکە •

# سورة المعارج

بسم الله الرحمن الرحيم

سَأَلَ سَائِلٌ بِعَذَابٍ وَاقِعٍ (١)

## سوورەی ( معارج )ە

به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

داواکارێك داوای سزایەکی (خوایی) کرد کە (ئەوسزایە) هەرئەبێ (١)

## سوورەی ( معارج )ە

مەککیە ، ٤٤ ئایەتە ، ٢١٦ ووتەیە ، ٨٦١ پیتە

بسم الله الرحمن الرحيم

به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

بتپەرستەکان هەمیشە گاڵتەیان ئەکرد بە پێغەمبەر ، وە بەو هەڕەشانەی کە لێی ئەکردن بە سزاو تۆڵەی ڕۆژی دوایی ، ئنجا هەموو جارێك بەگاڵتەوە ئەیانووت کوا ئەو سزایانەی کە هەمیشە باسیان ئەکات و ئێمەی پێ ئەترسێنێ ، بەڵکو جارێکیان « نضر »ی کوڕی «حرث» ووتی ـ وەك قورئان بۆمان ئەگێڕێتەوە لە لایەکی ترەوە ـ : « اللهم ان كان هذا هو الحق من عندك فامطر علينا حجارة من السماء او ائتنا بعذاب اليم »(١) ، ئنجا بەمبۆنەیەوە ئەم سوورەتە هاتە خوارەوە فەرمووی ( سأل سائل بعذاب واقع ) داواکارێك داوای سزایەکی خوایی

(١) واتە خوایە ئەگەر ئەم قورئانە ڕاستەو لە تۆوەیە ، بەردمان لە ئاسمانەوە بەسەرا ببارێنە ، یا سزایەکی سەختمان بۆ بنێرە ·

لِلْكافِرينَ لَيْسَ لَـهُ دافِعٌ ( ٢ ) مِنَ اللهِ ذِي الْمَعـارِجِ (٣) تَعْرُجُ الْملائِـكَةُ وَالرّوحُ اِلَيْهِ في يَوْمٍ كـانَ مِقْـدارُهُ خَمسينَ اَلْفَ سَنَةٍ (٤)

---

نی‌یە بۆ بێ‌برِوایان هیچ پاڵپێـوەنەرێك ( كـە بیان‌پارێزێ ) ( ٢ ) لــە (سزای) خـــوای خـــاوەن پلەو پایەی زۆر (٣) فریشتـەو جبریل سەرئەكەوون بۆ لای خوا لە رِۆژێـكا كـــە ماوەكەی پەنجا هـــەزار ساڵە (٤)

---

كرد ، كـە ئەو بڵێت‌و نەڵێت ئەو سزایەی هەر تووش ئەبێ ، وە خـــوا برِیوێتی‌یەوە ، ئنجا خوا وەرام ئەداتەوە ئەفەرموێ : ئەو سزایەی كە گـەو بێ‌برِوایە داوای ئەكـات ، ئامـادەكراوە لـــە رِۆژی دوایی‌دا ( للـكافرین ) بۆ بێ‌برِوایان ( لیس لـە دافع ) هیچ كـەسێك نی‌یە كـــە لەورِۆژەدا بتوانێ ئەو سزایەیان لێ دووربخـاتەوە ، وە بی‌یان‌پارێزێ ( من الله ذی المعارج )(١) لە سزای ئەو خوایەی كە خاوەنی زۆر پلەو پایەی بەرزە ، كە ( تعرج الملائكة والروح الیه ) فریشتەو جبریل دێن‌و ئەچن‌و سەرئەكەوون بۆ بارەگای ئەو خوایە بە ئیش‌و كاری تایبەتیی بەندەگان ( في یوم ) لە رِۆژێـكا ـ وەك رِۆژی دوایی بێ ـ كـە لەبەر سەختی‌و ناخۆشیی زۆر درێژ ئەنوێنێ ، لەلایان ، بە رِەنگێكی‌وا كـە بە هەزاران ساڵ دێتە پێش‌چاویان ، وەكو ئەفەرموێ ( كان مقداره خمسین الف سنة ) درێژی‌یەكەی پەنجا هـەزار سـاڵە ، واتە وەك نەخۆشێكی

---

(١) «ذی‌المعارج» لێرەدا بەمانا «رفیـع الدرجات»ە ، لـــە سوورەی «مؤمن»دا .

ئازاردار چۆن ساتێکی لێ ئەبێ ، بە ساڵێك‌و سەعاتێکی لێ ئەبێ بە سەدساڵ ئەمیش ئەوڕۆژەی لێ ئەبێ بە پەنجا هەزار ساڵ ، کەوابوو مەبەس لەم ژمارەیە ئەمەندە ساڵ نی‌یە ، بەڵکو مەبەس نیشاندانی درێژیی ئەوڕۆژەیە ، کە بە لای بێبڕواوە زۆرو بە لای خواشەوە کەمە ، بەوەدا کە لە دوو ئایەتی‌ترا ڕۆژێك بە هەزار ساڵ ناوئەبات ، ئەفەرموێ : « ویستعجلونك بالعذاب ولن یخلف الله وعده ، وان یوما عند ربك كألف سنة مما تعدون ٢٢/٤٧ »(١) ، وە ئەفەرموێ « یدبر الامر من السماء الى الارض ثم یعرج الیه في یوم كان مقداره الف سنة مما تعدون ٣٢/٥»(٢) ، واتە تووشی سزای سەختی خۆت ئەبیت لە ڕۆژێکا کە هەر لێت نابڕێتەوە ، ئەمە وەك ئەو دەستوورو باوە وایە لە هەموو زەمانێکا کە ئەگەر یەکێك بی‌یەوێ باسی کردنی کارێك بکات بەزۆریی ، ئەڵێ : حەفتا جارم بانگ‌کردیت ، یا سەدجار هاتمەلات ، وە ئەگەر بی یەوێ باسی درێژیی تەمەنێك بکات ئەڵێ : ئەگەر مەردوم هەزار ساڵ بژیی ، یا پەنجاهەزار ساڵ بژیی ، تێر ناخوات ، ئنجا لە هەردوکیانا مەبەس هەر درێژیی تەمەنە ، نەك هەزار ساڵ‌و پەنجاهەزار ساڵە بە بێ زیادو کەم(٣) .

(١) واتە بەپەلە داوای سزات لێ ئەکەن ، وە هەرگیز خوا لەبەڵێنی خۆیدا دواناکەوێ ، وە ڕۆژێك لای پەروەردگاری تۆ وەك هەزار ساڵی ئێوە وایە .

(٢) واتە خوا لەئاسمانەوە تەدبیری کاروباری زەویی ئەکات ، لەپاشا سەرئەکەوێ بۆ لای ئەو لە ڕۆژێکا کە ماوەکەی هەزار ساڵە ، لەوانەی کە ئەیانژمێرن .

(٣) ئەگونجێ مەبەس هەر پەنجا هەزار ساڵیش بێ بە بێ زیادو کەم ، چونکە ڕۆژی ئێمە پەیدا ئەبێ لە سووڕانەوەی زەویی

فَاصْبِرْ صَبْراً جَمِيلاً (٥)

ئنجا خۆت ڕابگرە (ئەی محمد) بە خۆڕاگرتنێکی جوان (٥)

واتە کات لای خوا نی‌یە ، دە هەزار ملیون ساڵ لەمەپێش کە ڕۆژو زەویی‌و ئەستێرە گەڕۆکەکان هەموو یەك کۆمەڵە بوون پێکەوە ، وەك ئەمڕۆ وایە لای خوا ، کە واتە ئەو پەلەپەلەی کە ئەو بێ‌بڕوایانە هەیانە بۆ ڕۆژی دوایی خوا نی‌یەتی ، وە ئەو دووریی ڕۆژی دوایی‌یەی کە بەلای ئەوانەوە هەیە بەلای خواوە نی‌یە ، کەوابوو ئەی محمد ( فاصبر صبرا جمیلا ) خۆت ڕابگرە بە خۆڕاگرتنێکی جوان ، واتە نە بە قسەی ئەم بێ‌بڕوایانە لێڵ بە ، وە نە بە گاڵتەکردنیان دڵگیر بە ، وە نە بە دڵ ئارەزووی تۆڵەو سزایان بکە ، ئەمانە هەمووی بۆ خوا بەجێ‌بێڵە ، وە بزانە کەخوا دەستوورو باوێکی هەیە لە جیهانا ، چ لە ڕووی لەناوبردنی زەلام‌و گەلانو ، چ لەڕووی پێ‌گەیاندنو بەرهەم هێنانیانەوە ، کە ئەو دەستووری خۆیە تێك‌نادات بۆ هیچ کەسێك ، وە ئەو پەلەپەلەی کە تۆ هەتە ، ئەو نی‌یەتی ، وە ئەو هەڕە هەڕەی کە ئەوان

---

بەدەوری خۆیا بە بیست‌و چوار سەعات ، لە بوونەوەرا ئەستێرەی‌وا هەیە بە ساڵێکی ئێمە یا بە هەزاران ساڵی ئێمە چەرخەیەك تەواو ئەکات ، کەواتە ڕۆژێکی ئەو ئەستێرەیە هەزاران ساڵی ئێمەیە ، ناڵێم مەبەس لەم پەنجا هەزار ساڵە ئەوەیە ، بەڵام ئەمەوێ ئەمە بزانیین کە تا چ‌ئەندازەیەك جیاوازی هەیە لەنێوان ڕۆژی ئەستێرەیەك‌و ئەستێرەیەکی‌ترا ٠

اِنَّهُمْ یَرَوْنَهُ بَعیداً ( ٦ ) وَنَراهُ قَریباً (٧) یَوْمَ تَكونُ السَّماءُ كَالْمُهْلِ (٨) وَتَكونُ الْجِبالُ كَالْعِهْنِ (٩).

بەڕاستی ئەو بێبڕوایانە ئەوڕۆژە بە دوور ئەبینن (٦)و ئێمە بە نزیکی ئەبینین (٧) ئەوڕۆژەی کە ئاسمان وەك مسی تواوە (٨)و شاخەکان وەك خوریی شیی‌کراوەیان لێ دێ •

لەو چەند ڕۆژی زیانەیانا ئەیکەن هیچ نرخێکی نیyە ، وە ئەو ڕۆژە ڕەشەی کە بە بێ‌گومان تووشیان ئەبێ بەلای ئێمەوە زۆر نزیکە ، با بە لای ئەوانیشەوە زۆر دوور بێ ، وەکو ئەفەرموێ ( انهم یرونه بعیدا ) ئەوان ئەو ڕۆژە بە دوور ئەبینن ، واتە بەلایانەوە وایە کە هەرگیز نابێ ( ونراه قریبا ) وە ئێمە بە نزیکی ئەبینین ، کام ڕۆژ ؟ ( یوم تکون السماء کالمهل ) ئەو ڕۆژەی کە ڕەنگی ئاسمان لێڵ ئەبێ‌و سوور هەڵئەگەڕێ وەك ڕەنگی ڕۆن زیتوونی داخکراو ، یا ئاسن‌و مسی تواوە ( وتکون الجبال کالعهن ) وە شاخەکان وەك خوریی ڕەنگاوڕەنگی شیی‌کراوەیان لێ دێ ، واتە لەبەرئەوەی کە خاکی زەویی هەمووی کانی ڕەنگاوڕەنگە تۆزەکەشی کە ئەچێ بەئاسمانا بە ڕەنگاوڕەنگ ئەبینرێ •

ئنجا لەوکاتەدا ، جیهان بەیەکادێ ، وە کەس لە کەس نابرسێ ، وە هەرکەسە خوا خوای ئەوەیەتی کە خۆی ڕزگار بێ ، وەکو ئەفەرموێ

وَلا يَسْأَلُ حَمِيمٌ حَمِيماً (١٠) يُبَصَّرُونَهُمْ يَوَدُّ الْمُجْرِمُ لَوْ يَفْتَدِي مِنْ عَذابِ يَوْمِئِذٍ بِبَنِيهِ (١١) وَصاحِبَتِهِ وَأَخِيهِ (١٢) وَفَصِيلَتِهِ الَّتِي تُؤْوِيهِ (١٣)

وە کەس لە کەسی خۆی ناپرسێتەوە (١٠)کە نیشانی یەکتریی ئەدرێن ، بێبڕوا حـــەزئەکات کـە بیدایە لە تۆڵەی ڕزگار بوونی لـــە سزای ئەوڕۆژە ، بە کوڕانی‌یەوە (١١)وە بە ژنی‌یەوەو بە برایەوە (١٢)و بـە هۆزێـکی‌یەوە کە پەنایان ئەدا (١٣)

( ولا يســـأل حميم حميمـــا ) هیچ کەسێك پرسیار لە هیچ کەسێـکی خۆشەویستی خۆی ناکات ، نە باوك‌و دایك لە ڕۆڵەو ، نە خوشك‌و برا لە یەکتریی ، لەگەڵ ئەمیشە کە ( يبصرونهم ) ئەم خزمانەیان نیشان‌ئەدرێ ، وە هـەموو چاویان بەیەك‌ئەکەوێ ، وە ئەزانن کـــە لـــە چ‌تەنگانەو ناخۆشی‌یەکان •

نە، تەنگانەی ئەوڕۆژە هـەر ئەوەندە نی‌یە کـە ووترا ، بەڵـکو گـــەلێ لەوەش زیاترە ، وەکو ئەفەرموێ ( يود المجرم ) بێبڕوا ئاوات ئەخوازێ ( لو يفتدي من عذاب يومئذ ) کـە خۆزگە هەرچی کەس‌و کـاری هەیە بێ‌توانایە بیـدایە لە تۆڵەی ڕزگاربوونی خۆی لە سزای ئەوڕۆژە (ببنيه) بە کوڕانی‌یەوە ( وصاحبته )و بە ژنی‌یەوە (واخيه)و بە برایەوە ( وفصيلته التي تؤويه ) وە بە هۆزو تیرەیەکی‌یەوە کە پەنایان

وَمَنْ فِي الْاَرْضِ جَمِيعاً ثُمَّ يُنْجِيهِ (١٤) كَلَّا اِنَّها لَظى (١٥) نَزّاعَةً لِلشَّوى (١٦) تَدْعو مَنْ اَدْبَرَ وَتَوَلّى (١٧) وَجَمَعَ فَاَوْعى (١٨)

---

و بە هەرکەس ، کە لەسەر زەوی‌یە (هەمووی بدایەو) لەپاشا هەر خۆی ڕزگاری بێ ( ١٤ ) نەء ( بارمتە وەرناگیرێ ) بەڕاستی ئاگری دۆزەخ بە بڵێسەیە (١٥) داماڵێنەری پێستی سەرە (١٦) بانگی کەسێك ئەکا کە پشتی هەڵکردبێ لە خواو ڕووی وەرگێڕابێ ( ١٧ ) وە دارایی کوکردبێتەوە وهەڵی‌گرتبێ (١٨)

---

ئەدا لە جیهانا ، وە شانازیی پێوە ئەکردن ( ومن في الارض جميعا ثم ينجيه ) وە بە هەر کەس کە لەسەر زەوی‌یە ، لە ئادەمیی ، وە هەمووی بدایەو هەرخۆی ڕزگاری ببوایە .

ئنجا لەکاتێکا کە بێ‌بڕوا لەم ئاواتانەدایە ، لەبڕ دەنگێك دێ ئەڵێ : (کلا) با وا نەزانێ بێ‌بڕوا کە ئەوڕۆژە هەر نی‌یە ، یا ئەگەر بێ بارمتەی تیا وەرئەگیرێ ( انها لظى ) بەڕاستی ئاگری دۆزەخ ئاگرێکی بە بڵێسەیە ( نزاعة للشوى ) داماڵێنەری پێستی سەرە ( تدعو من ادبر وتولى ) بە زبانی حاڵ بانگی کەسێك ئەکات کە پشتی هەڵکردبێ لە بڕواهێنان بە خواو بە ڕۆژی دوایی ، وە ڕووی وەرگێڕابێ ، هەر بەوڕەنگە بانگی کەسێك ئەکات کە ( وجمع فاوعى ) دارایی کۆکردبێتەوەو هەڵی‌گرتبێ ، وە لەڕێی خواو خزمەتی

اِنَّ الاِنْسانَ خُلِقَ هَلوعاً (١٩) اِذا مَسَّهُ الشَّرُّ جَزوعاً ( ٢٠ )

بێ گومان ئادەمیی دروست کراوە بە چاوبرسیی یەکی تەنــگە تیلکە ( ١٩ )
کــە ناخۆشی یەکی تووش ببێ هاوارو ناڵە دەست پێ ئەکات (٢٠)

هەژارانا بەختی نەکردێ •

ئەمــە هــەڕەشەیەکی تێجگار گــەورەیە لــە دەوڵەمەندی چرووك کــە بەشی هــەژار نەدا لە دارایی یەکەی ، کــەوا بەم ڕەنگە کردی بــە هاوملی ئەوکەسانەی کە بڕوایان بــە خوا نەبێ ، چونکە ئەگەر بڕوای ببوایە فەرمانی ئەوی بەجێ ئەهێنا ، وە بەشی هەژاری لە دارایی یەکەی ئــەدا •

★ ★ ★

لەپاش باسی ئاگری دۆزەخ ، کە بانــگی دەوڵەمەندی چرووك و بێ بڕوا ئەکات بۆ لای خۆی ، ئنجا بــە ڕەنگێــکی تێــکڕایی باسی دوو سیفەتی ئادەمیی مان بۆ ئەکات کە لەگەڵ سروشتیا تێکەڵە ، وە لە یەکەم ڕۆژی بوونی یەوە لەگەڵیایەتی ، وە بووە بە مایەی هــەموو ناکۆکیی و ناخۆشی یەکی ، وە نیشانمان ئــەدات کــە ئادەمیی چــۆن بەرانبــەریی خۆشیی و ناخۆشیی ئەکات لە کــاتی بڕواو بێ بڕوایی دا ، ئەفەرموێ ( ان الانسان خلق هلوعا )بەڕاستی ئادەمیی دروست کراوە بە چاو برسیی یەکی تەنــگە تیلکەی وا ( اذا مسه الشر )کاتێك کە خرابیی و ناخۆشیی تووشی ببێ لــە هەژاریی ، یا نەخۆشیی ، یا ترس و بیمێك ( جزوعا ) هــاوارو

وَاِذا مَسَّهُ الْخَيْرُ مَنوعاً (٢١)

کــەساماشیش ڕووی تێبکات ئەیگرێتەوە ( لە مەردوم) (٢١)

ناڵە دەست‌پێ‌ئەکات ، وە نائومێدی ڕووی تێ‌ئەکات ، وە وائەزانێ کــە ئەو ناخۆشی‌یەی هەرگیز بەسەرا تێ‌ناپەڕێ ، ئنجا ئەگەر هەژاری‌یە ، وائەزانێ کــە هــەرگیز دەوڵەمەندیی بەدوادا نایەت ، وە ئەگــەر نەخۆشی‌یە ، وائەزانێ کــە هەرگیز چاك بوونەوەی نی‌یە ، وە ئەگــەر ترس‌و بیمە ، وائەزانێ کــە جارێــکی‌تر ئاسایش‌و دڵنیایی نابینێتــەوە ، زۆر جــار ئەم نائومێدی‌یەی ڕای ئەکێشێ بۆ شتی زۆر خراپ ، بەڵکو بۆ کوشتنی خۆی ( واذا مسه الخیر )وە کاتێك کــە چاکــەیەك ڕووی تێ‌بــکات ، لە دەوڵەمەندیی یا پایەو ناوونیشانێك (منوعا) ئەیانــگرێتەوە لــە مەردووم ، وە وا تێ‌ئەگات ئەوەی کە دەستی کــەوتووە بــە هێزی بازووی خۆیەتی ، ئەوکاتە لەجیاتی سوپاسی خوا بــکات وە بەشێك لــە دارایی‌یەکەی لە ڕێی خوادا بەخت بــکات ، کەچی هەرچێکی هەیە لە پارەو دارایی‌و ڕێزو دەست‌ڕۆین ، هەمووی لە مەردوم ئەگێڕێتەوە ، وە بە بێ‌کەڵك ئەمێنێتەوە ، بەڵــکو زۆرجار یاخیش ئەبێ ، وە دەست‌درێژیی ئەکات بۆ ســەرو ماڵ‌و ناموسیشیان ، ئنجا ئەگەر خوا نەخواستە هــەموو کەسێك وابووایە ، دۆستایەتی‌و خۆشەویستی‌و دڵ‌نەرمیی نەئەمــا لــە جیهانا ، وە لەجیاتی ئەمانە دوژمنایەتیی‌و ناحەزیی‌و دڵ‌ڕەقیی ئەهــاتە پێشەوە ، بەڵام خوای گــەورە ـ کە پەروەردگاری جیهــانیانە ـ بــە میهرەبانیی خۆی ، درەختی بڕوای ناشتووە لە دڵ‌و دەروونی زۆر لــە

الاَ الْمُصَلِّيْنَ (٢٢) الّذينَ هُمْ عَلَى صَلاتِهِمْ دائِمونَ ( ٢٣ ) وَالّذينَ في اَمْوالِهِمْ حَقٌ مَعْلومٌ (٢٤)

مەگەر نوێژکەران (٢٢) ئەوانەی کە درێژەیان هەیە لەسەر نوێژەکانیان (٢٣) وە ئەوانەی کە بەشێکی ئاشکرا لە دارایییانا هەیە (٢٤)

مەردومانا ، وە بە ئاوی زیریی‌و بیری بەرز ، وە بە پەندو ئامۆژگاریی ئایین ئاوی‌داوە ، وە لق‌وپۆپی ئەو درەختە لە هەموو ئەندامێکی ئەوکەسانەوە سەری دەرهێناوە ، بە ڕەنگێکیوا کە بیانگێڕێتەوە لەم سیفەتە پیسانەی پێشوو ، کە ئەو بڕوادارانەش ئەمانەن کە ئەفەرموێ ( الا المصلين ) مەگەر نوێژکەرانێك کە ئەم هەشت ڕەوشتانەیان تیابێ •

١ ـ ( الذين هم على صلاتهم دائمون ) ئەوانەی لە ترسی خوا درێژەیان هەیە لەسەر نوێژەکانیان ، وە پێنج فەرزە لە کاتی خۆیا بەڕێك‌وپێکی ئەیکەن ، وە لە هەموو گوفتارو کردارێکی بەهرەمەند ئەبن ، وە بەو سەجدەو رکوعانە کە ئەیبەن گەورەیی خواو زەبوونی خۆیان‌جێ‌گیر ئەبێ لە دڵو دەروونیانا ، بەڕەنگێکیوا نە بە ناخۆشیی ڕۆزگار زۆر لێڵ ، وە نە بە خۆشیی‌و دەوڵەمەندیی یاخی ئەبن •

٢ ـ ( والذين في اموالهم حق معلوم ) ئەوانەی کە بەشێکی باشی

لِلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ ( ٢٥ ) وَالَّذِينَ يُصَدِّقُونَ بِيَوْمِ الدِّينِ (٢٦) وَالَّذِينَ هُمْ مِنْ عَذَابِ رَبِّهِمْ مُشْفِقُونَ (٢٧)

بۆ هەژاری داواکەرو بێنەوای داوانەکەر (٢٥) وە ئەوانەی کە بڕوایان بە ڕۆژی دوایی هەیە (٢٦)وە ئەوانەی کە لە سزای پەروەردگاری خۆیان ئەترسن (٢٧)

دیار لە دارایی‌و دەست‌کەوتەکەیان دائەنێن (للسائل) بۆ ئەو هەژارانەی کە ناچار ئەبن بە داواکردن لە مەردوم ( والمحروم ) وە بۆ ئەوانەی ڕوویان نایەت داوا بکەن ، یا بەهۆی سووتان یا لافاو یا شتێکی ترەوە بێ‌دەست‌مایە ماونەتەوە ، یا بەدرێژایی ساڵ هەر هەووڵ ئەدەن‌و هیچیان دەست‌ناکەوێ •

چەند جوانە کە ئەم یارمەتیی‌و دەست‌گرتنەی ناوبردووە بە حەق ، واتە ئەو ماڵەی کە خوا بە دەوڵەمەندی داوە بەشێکی هەژاری تیایە ، وە ئەمان هاوبەشی ئەوانن ، وە هەرچی دەوڵەمەند بیدا بە هەژار منەتی تیا نی‌یە •

٣ ـ ( والذين يصدقون بيوم الدين )ئەوانەی کە بڕوایان بە ڕۆژی دوایی هەیە ، وە هەرچی ئەکەن بۆ دوورکەوتنەوەیە لە سزای ئەوڕۆژە •

٤ ـ ( والذين هم من عذاب ربهم مشفقون ) ئەوانەی کە پڕ بە دڵ

اِنَّ عَـذابَ رَبِّهِـمْ غَیْرُ مَأمونٍ ( ٢٨ ) وَالَّـذینَ هُـمْ لِفُروجِهِمْ حافِظونَ (٢٩) اِلاّ عَلی اَزْواجِهِمْ اَوْ ما مَلَكَتْ اَیْمانُهُمْ فَاِنَّهُمْ غَیْرُ مَلومینَ ( ٣٠ )

بەڕاستی سزای پەروەردگاری ئەوان وانییە کە لێی دڵنیا بن (٢٨) وە ئەوانەی کە ئاگاداریی جێشەرمی خۆیان ئەکەن (٢٩) مەگەر لەگەڵ ژنانیان ، یا کەنیزەکێك کە بووبن بە خاوەنیان ، بێگومان ئەوانە سەرزەنشت کراو نین (٣٠)

لە سزای خوای خۆیان ئەترسن ، وە هەرگیز دڵنیا نین لە خوا ، کە ئایا چاکەیان لێ گیرا ئەکات یا نا ؟ وەکو ئەفەرموێ ( ان عذاب ربهم غیر مأمون ) بەڕاستی سزای خوای ئەوان نابێ کەس لێی دڵنیا بێ ، چونکە ئەوکەسە هەرچەند چاکەو کاری باش بکات ، بەلام ئەگونجێ شتێکی خراپ بە دڵیا بێ ، یا درێغ و کۆتاهی‌یەکی ببێ ، کە ببێ بە مایەی گیرا نەکردنی ، پێغەمبەر بەو هەموو گەورەیی‌یەوە ، هەمیشە لە سزای خوا ترساوە ، وە بەلایەوە وابووە کە بە کردەوەی خۆی ڕزگاری نابێ و ناچێتە بەهەشت مەگەر بە میهرەبانیی خوا .

٥ ـ ( والذین هم لفروجهم حافظون ) ئەوانەی کە داوێن پاکن ، وە ئاگاداریی جێشەرمی خۆیان ئەکەن ( الا علی ازواجهم ) مەگەر لەگەڵ هاوجووتی خۆیان ( او ما ملکت ایمانهم ) یا لەگەڵ کەنیزەکێک کە بووبن بە خاوەنی ( فانهم غیر ملومین ) بێگومان ئەوانە سەرزەنش کراو نین ،

فَمَنِ ابْتَغى وَرَاءَ ذلِكَ ، فَأُولئِكَ هُمُ العادونَ (٣١)

ئنجا هەرکەسێك دوای شتی‌تر بکەوێ ئەوانە بەستن (٣١)

واتە ئەنگۆو ئەشەر ڕوویان تێ‌ناکات ، چونکە لەزێی سروشت لایان‌نەداوە ، وە ویستویانە کە لە ڕێ‌یەکی شەرعی‌یەوە نەتەوە بخەنەوە بۆ کۆمەڵو گەل ( فمن ابتغى وراء ذلك ) ئنجا هەرکەسێك بەدوای شتی‌ترا بگەڕێ ، بەم ڕەنگە داوێن‌پیسی بکات لەگەڵ ژنی‌ترا یا ژنێك مارە بکات بۆ ماوەیەك کە پێی‌ئەڵێن «موتعە» ، یالەپاشەوە لەگەڵ خێزانی خۆی ، یا لەگەڵ نێرینە ، یا لەگەڵ گیانداری‌تر دروست‌بێ ، یا بە دەست خۆی ڕەحەت بکات ( فأولئك هم العادون ) ئەوکەسانە ئەوانەن کە بەستن وە لە ڕێی ڕاست لایان‌داوە ، وە لە سنووری شەرع چوونەتە دەرەوە •

ئەم ئایەتە نیشان ئەدات کە ئیسلام کۆمەڵی پاكو تەمیزو ناوچەوان بەرزی دیاری بێ‌پەردەی ئەوێ ، کۆمەڵێك کە بە بێ‌فڕوفێڵ هەموو پێویستانێکی سروشتی تیا بەجێ‌بێنرێ ، بەڵام بە بێ بەربەرەڵلایی‌و پێچ‌وپەنایەك کە عەرەقی ناوچەوان بتکێنێ • کۆمەڵێك کە بوێستێ لەسەر دروستکردنی خێزانی شەرعی قایمی بەتین ، وە لەناو خانوویەکی ئاشکرا لە گەڕەکا ، کە هەموو کەسێك بڵێ : ئەمە خانووی فیسارکەسە • کۆمەڵێك کە هەموو منالێك باوکی خۆی تیا بناسێتەوە ، وە شەرمەزار نەبێ لە بوونی خۆی ، ئەم شەرمەزار نەبوونەشی لەبەر ئەوە نەبێ کە شەرمو حەیا باری‌کردبێ ، بەڵکو

لەسەر ئەوەبێ کە پەیوەندیی ژن و پیاو لەسەر بناغەیەکی ڕێك و پێك و پاك و تەمیز و هەمیشەیی و ئامانجداریی بێ ، وە بێ یەوێ پێویستێکی ئادەمێتی و کۆمەڵایەتی بەجێ بێنێ ، نەك هەر بۆ کەیف و خۆشیی و ڕابواردن و هەڵمیزان بێ بەم و بەوا •

لەڕۆژێکەوە کە جەنگ و ئاژاوە پەیدابووە لەناو کۆمەڵی ئادەمییدا ، وە مەردوم بەدیل گیراوە ، بەندە «عبد» پەیدابووە ، هیچ گەلێك نەبووە لە جیهانا کە بەندەی تیا نەبووبێ ، تا گەیشت بە ڕادەیەك کوڕ و کچ ئەفڕێنران و ڕاو ئەکران ، وە ئەکران بە بەندە ، وە نیوەی بازرگانیی جیهان بەسەر کڕین و فرۆتنی بەندەگانەوە بووە ، لەگەڵ ئەمیشە کە زۆر دڵڕەق بوون لەگەڵیانا ، وە بە چاوی ئاژاڵ و وڵاخ تەماشا ئەکران ، هەروەك هیچ ئایینێك دەستووری بۆ دانەناوون ، وە خزمەتێکی نەکردوون •

کاتێك کە ئیسلام هات زۆر بەزەیی هاتەوە بە بەندەگانا ، وە پێی ناشرین بوو ، کە ئادەمیی ئادەمیی داگیر بکات و بیکا بە بەندە ، وە ویستی دەستوورێکی وای بۆ دابنێ کە بەرەبەرە هەڵی گرێ لەناوا ، بەم ڕەنگە :

یەکەم ـ قورئان بڕیاری نەداوە بە بەندەگرتن ، وە دانی پیا نەناوە ، بەڵکو هەر فەرمان ئەدا بە ئازادکردنیان ، کە لەمەوە دەرئەکەوێ کە بەندەگرتنی کۆن ماوە ، ئنجا هات هەموو سەر چاوە و دەرگاکانی لێ داخست ، دەرگایەکیان نەبێ کە ئەویش دیلێکە کە لە جەنگێکی ئایینیدا بگیرێ ، وە دوژمنەکەشت بێ بڕوابێ بە خوا ، لەم کاتەشا ئیسلام

بەکوتوبڕیی جەنــگ هەڵناگیرسێنێ لەگەڵیان ، بەڵــکو ســەربەخۆیی‌یان ئەداتێ لــە هــەڵبژاردنی یەکێك لــەم سێ ڕێــگایە ، یا ئیسلام بوون ، یا جزیەدان ، یا جەنگ کردن ، ئنجا ئەگەر مسڵمان بوون یا جــزیەیان دا ئەوکاتە پێویست ئەبێ لەســەر ،سڵمانان ، ئاگاداریی خۆیانو سەرو ماڵو ناموسیان ، وە چاودێریی ئایینو بــیروباوەڕو خواپەرستیی‌و خانەی خوایان، وە ئەگــەر جەنگیشیان کرد ، ئەوکاتە کــە جەنگ بوو ، ئەبێ دیلیش ببێ ، بەڵام ئەم دیــلانە یا ئەبێ بــە خــۆڕایی بەرەڵلا بــکرێن ، وە یا بەرانبەر بە بارمتەیەك وەك قورئان ئەفــەرموێ « فاذا لقیتم الذین کفروا فضرب الرقاب حتی اذا اثخنتموهم فشــدوا الوثاق ، فاما منا بعد واما فــداء حتی تضع الحرب اوزارها ٤/٤٧ »(١) ئنجا ئەگەر لە سوپاگا «معسکر»ی دوژمن دیلی ئێــوە بوو ، وە بەرەڵلایان نەئەکردن ، وە کردنیان بــە بەندە ، ئەوکــاتە ئێوەش ئەتوانن دیلی ئەوان بــکەن بــە بەندە ، وەك کردە بە وێنــەی کردە « معاملة بالمثل » کــە تا ئەمــڕۆ ئــەم دەستوورە لەناوهەموو دەوڵەتێکا بەکاردێنرێ‌و چاودێریی ئەکرێ ، ئنجا ئەگــــەر پیــاوە ، خاوەنەکەی ئیشی پێ بــکات ، وە ئەگەر ژنە دروستە بۆخۆی بچێتــە لای ، نــەك لەناو لەشــکرا بەرەڵلا بن بۆ هــەرکەسێك کــە ئارەزوویان بکات وەك دیلی ئێستا کە بەناو پێیان ناڵێن دیل بەڵام هــەزار جار لە دیل ژێربێ ترن .

دووهەم ــ دەرگای زۆری بۆ کردوونەتەوە بۆ ئازادکردنیان .

---

(١) واتە (لەکاتی جەنــگا کە گەیشتنە ئەوانەی کە بێبروان ، لــە ملیان بدەن تا زۆریان لێ‌ئەکوژن ، ئنجا بیانگرن ، ئەوکاتە ســا یا بــە پیاوەتی بەرەڵلایان بــکەن ، وە یا بــە بارمتــە ، تا جەنگ‌کەران چەك دائەنێن .

وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ راعونَ (٣٢)

وە ئەوانەی کە چاودێریی سپاردەو پەیمانی خۆیان ئەکەن (٣٢)

سێهەم ــ قورئان بەشێکی لە زەکاتی مسڵمانان داناوە بۆ کڕینەوەی بەندەگان و ئازادکردنیان •

چوارەم ــ هەرچی ووتاری نەرم و شل هەیە پێغەمبەر بەکاری هێناوە لەگەڵ مسڵمانانا ، بۆئەوەی کە لەگەڵ بەندەگانا نەرم و شل بن ، وە بە چاوی برا تەماشایان بکەن ، وە لەگەڵ خۆیانا جیایان نەکەنەوە ، وە یەکەم کەس کە بەندەی ئازادکرد پێغەمبەر بوو کە زیدی کوڕی « حارثە »ی ئازاد کرد ، وە کردیشی بە کوڕی خۆی ، وە پوورزایەکی خۆشی لێ مارەکرد کە ناوی «زینب» بوو ، لەپاشا ئیتر لە هەموو لایەکەوە دەستکرا بە ئازادکردنیان تا گەیشتن بە پایەی وەزیریی لە دەوڵەتی ئیسلامیدا ، بەڵکو گەیشتن بە پاشایی وەك کافووری اخشیدیی •

بەمڕەنگە ئیسلام بناغەی دانا بۆ ووشك‌کردنی ئەم سەرچاوەیە ، بەڵام مسڵمانان پەیڕەوییان نەکرد ، هەروەك لە زۆر شتی‌ترا لایاندا لە دەستووری ئیسلام •

لەم سەرباسە « موضوع »دا ووتارێکی تایبەتیم هەیە لە جزمی سێهەمی «ناڵەی دەروون»دا ، بەتەواویی ئەم سەرباسەی ڕوون‌کردۆتەوە ، پێویستە بۆ ئەو کەسانەی کە ئەیانەوێ باش تێی‌بگەن ، بەووردیی بچن بیخوێننەوە •

شەشەم ــ ( والذين هم لاماناتهم وعهدهم راعون ) ئەوانەی کە

وَالَّذِينَ هُمْ بِشَهَادَاتِهِمْ قَائِمُونَ ( ٣٣ )

وە ئەوانەی کە گەواهیی خۆیان بەتەواویی ئەدەن ( ٣٣ )

ئاگاداریی سپاردەو پەیمانی خۆیان ئەکەن لەگەڵ خواو بەندەگانا ، وە هەموو جۆرە پێویستێکی دین و دنیا بەجێ دێنن ، وە لە هیچ ڕوویەکەوە دەست پیسی و ناپاکی ناکەن ، کە گەورەترینیان گەواهیی « شهادة »یە ، بۆیە بەتایبەتی ناوی بردو فەرمووی :

حەوتەم ـ ( والذين هم بشهاداتهم قائمون )ئەوانەی کە وێستاوژن بۆ هەموو جۆرە گەواهییەك ، واتە هەموو گەواهییەك بەڕاستیی ، وە بە بێ زیادو کەم ئەدەن ، لەسەر خزم و بێگانەو دۆست و دوژمن وەك یەك . هەرگەلێك ئەم ڕەوشتەی تیابوو ، وە هەموو کەسێکی ئاگاداریی سپاردەی خۆی کرد ، وە پێویستانی خۆی بەجێ هێنا ، ئەو گەلە ﷺ هەموو ئەندامێکی دڵنیایی ڕووی تێ ئەکات ، وە پشتێنی لێ ئەکاتەوە ، وە هەر گەلێك کە وانەبوو ، وە پێویستانی خۆی بەجێ نەهێنا ، ئەو کاتە هیچ ئەندامێکی دڵنیا نابێ ، وە هەموولایەکیان وەك جانەوەرو دڕندە تێ بەرئەبن ، وە هەرچی ڕۆی دەستی خۆی ئەوەشێنێ .

ئنجا بۆئەوەی نیشان بدات کە نوێژ گەورەترین سیفەتی بڕوادارانە ، بۆیە لە یەکەم سیفەتا باسی کرد ، وە وا لە دوایشا باسی ئەکاتەوە ئەفەرموێ :

وَالَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ (٣٤) أُولَٰئِكَ فِي جَنَّاتٍ مُكْرَمُونَ (٣٥)

وە ئەوانەی کە ئاگاداریی نوێژیان ئەکەن (٣٤) ئەوانە (ی کە باس کران) ڕێز ئەگیرێن لە باخاتی بەهەشتا (٣٥)

هەشتەم ـ ( والـذین هم علی صلاتهم یحافظون )ئەوانەی کە ئاگاداریی نوێژیان ئەکەن ، واتە لەپێشەوە دەستنوێژی بۆ ئەشۆنو خۆیانی بۆ ئامادە ئەکەنو دڵی بۆ پاك ئەکەنەوە لە هەموو شتێك ، وە بە دڵ ڕووئەکەنە خوا ، وە بە هۆش و گۆشەوە نوێژەکەیان ئەکەن بە کۆمەڵ ، بە خۆیو هەموو نزاو پاڕانەوەیەکی پێشەکێو پاشەکیی یەوە ، بەجۆرێکیوا کە هەمیشە خۆی لە پەناخوادا ئەبینێ ، وە بە هەموو بەشێکی ڕازییە (اولئك)ئەم بڕوادارانەی کە ئەم ڕەوشتانەیان هەیە ( في جنـات مکرمون )لە ڕۆژی دواییدا ڕێزیان ئەگیرێ لە باخاتی بەهەشتا .

مەبەست لە ژمارە یەك ، نوێژکردنە لە وەختی خۆیا بێ ئەوەی لە دەست بدرێ . مەبەست لە ژمارە هەشت نوێژکردنە بە خۆیو هەموو ویردو هۆش و گۆش و ئاگاداری یەکەوە ، بە جۆرێك کە بەهرەی لێ ببینرێ ، وە خاوەنەکەی بگێڕێتەوە لە هەموو گوفتارو کردارێکی خراپ .

★ ★ ★

فَما للّذينَ كَفَروا قِبَلَكَ مُهْطِعينَ (٣٦) عَنِ اليَمينِ وعَنِ الشِمالِ عِزينَ ؟ ( ٣٧ )

چی‌یانە ئەو بێ‌بڕوایانە ( کە تۆ دەرئەکەویت ئەی محمد ) بەپەلە دێن بۆ لات (٣٦) (لەپاشا) لەلای ڕاستو چەپتەوە بلاّوەی لێ‌ئەکەن (٣٧)

بێ‌بڕواکانی مەککە بڕوایان بە ڕۆژی زیندووبوونەوەو پرسیارو سزا نەبوو ، وە هەمیشە لەمڕووەوە بە گاڵتە پرسیاریان لە پێغەمبەر ئەکرد ، وەك لە سەرەتای ئەم سوورەتەوە باسی‌کرد ، ئنجا هەرچەند پێغەمبەر بهاتایەتە دەرەوە ، وە ئەوەی بە سرووش بۆی هاتبو بیخوێندایەتەوە ـ ئەو بێ‌بڕوایانە بەپەلە ئەهاتن بۆلای‌و دەوریان‌ئەدا تا لەپاشا گاڵتە بە قسەکانی بکەن ، وە ئەیان‌ووت : ئەگەر ئەم مسلمانانە بچنە بەهەشت وەك محمد ئەڵێ ، ئێمە لەپێش ئەوانا ئەچینە بەهەشت ، چونکە ئێمە لە گەورەی عەرەبین ، ئنجا بەم‌بۆنەیەوە خوا ئەدا بە لووتیانا ئەفەرموێ ( فما للذين كفروا قبلك مهطعين )ئەوە چی‌یانە ئەو بێ‌بڕوایانە ؟ هەرچەند تۆ دەرئەکەویت ئەی محمد بەپەلە دێن بۆ لات‌و ملت بۆ درێژئەکەن ، لەپاشا ( عن اليمين وعن الشمال عزين ) لەلای ڕاستو چەپتەوە کۆمەڵ کۆمەڵ ئەڕۆن‌و بلاّوەی لێ ئەکەن ٠

اَيَطْمَعُ كُلُّ امْرِئٍ مِنْهُمْ اَنْ يُدْخَلَ جَنَّةَ نَعِيمٍ ؟ ( ٣٨ ) كَلاَّ ! اِنَّا خَلَقْنَاهُمْ مِمَّا يَعْلَمُونَ (٣٩)

---

ئایا هەموو یەکێك لەوان بەتەمایە کە بخرێتە بەهەشتی پڕ لە بەهرەو خۆشیی ؟ (٣٨)وانی یە(وەك بەتەمان) ئێمە بەڕاستیی دروستمان کردوون لەوەی کە ئەیزانن(٣٩)

---

(أيطمع كل امرىء منهم ان يدخل جنة نعيم) ئایا هەموو یەکێك لەوان بەتەمایە کە بخرێتە بەهەشتی پڕ لە بەهرەو خۆشیی ، بێ ئەوەی کـە بڕوا بێنێ ، یا گوێ لە ئامۆژگاریی پێغەمبەرەکـەی بـگرێ ، واتە با بەتەمـای بەهەشت نەبێ (کلا)وانی یە وەك ئەوان تێ گەیشتوون چوونە بەهەشت بە حەسەبو نەسەب نی یە ، بەڵـکو بە خواپەرستیو کردەوەی باشـە ( انا خلقناهم مما یعلمون ) بێ گومان ئێمە ئەوانمان دروست کردووە لەوەی کـە خۆیان ئەیزانن ، واتە لـە دڵۆپێك ئاویاکـە ئەگـەر لـە داوێنی هەرکامێکیان بکەوێ بە قێزو بێزەوە ئەیشوا ، کە واتە ئەم دەعیەو دەمارە چی یە کـە ئـەوان بـە خـەرجی ئەدەن ، وە وائەزانن کە ئەبێ بچنـە بەهەشت بە بێ بڕواو کردەوەی چاك •

ئنجـا هەڕەشەیان لێ ئەکات کـە ئەگـەر پەشیمان نەبنەوە ، خوا لەناویان ئەبات ، وە دەستەیەکی تر ئەهێنێتە پێشەوە کە لەوان باشتر بن ،

فَلا أُقْسِمُ بِرَبِّ الْمَشارِقِ وَالْمَغارِبِ ، انّا لَقادِرونَ (٤٠)
عَلى اَنْ نُبَدِّلَ خَيْراً مِنْهُمْ ، وَما نَحْنُ بِمَسْبوقينَ ( ٤١ )

سوێنـد بە پەروەردگـاری ڕۆژهـەڵاتو ڕۆژئاوای زۆر ، ئێمـە بەدەسەڵاتین (٤٠) لەسەر ئەوەی کە لەوان باشتر بهێنین ، وە کـەس لەدەستمان دەرناچێ (٤١)

وە سوێنـدی لەسـەر ئەخـوات ئەفەرموێ ( فلا اقسم[1] برب المشـارق والمغارب ) سوێند ناخۆم بە پەروەردگاری ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوای بێپایان لە جیهانا ، واتە لـە زەوییدا ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوای زۆر هـەیە ، وە هەرساتەی ڕۆژ لە شوێنێك هەڵدێو لـە شوێنێك ئاوا ئەبێ ، کـە ئەمـە گەورەترین بەڵـگەیە لەسەر خڕیو گردییو سووڕانەوەی زەویی ، وە ئەمە یەکێکە لەمعجزەی قورئان کە پانزە چەرخ لەمەپێش گەیاندوویەتی ، واتە سوێندبە خوای جیهان ( انا لقادرون علی ان نبدل خیرا منهم ) ئێمـە بێ گومان بەدەسەڵاتین کـە لەوان باشتر بێنینە پێشەوە ، واتە ئـەوان لەناوبەرینو دەستەیەکی باشتر لەوان بێنین کە بڕوا بێنن بـە پێغەمبەرو باوەڕی پێبکەن ( وما نحن بمسبوقین )وە کەس لە دەستمان دەرناچێ ، واتە ئەگەر ئێمە ئەو بێبڕوایانە لەناوبەرین ناتوانن لە دەستمان دەربچن ، بەڕەنگێك کە خۆیان ڕزگار بکەن ، وە ئێمە دەسەڵاتمان بەسەریانا نەمێنێ .

★ ★ ★

(١) لە سوورەی «حاقە»دا تەفسیری «فلا اقسم»مان کرد ، وە ووتمان کە ئەمەش جۆرێکە لە سوێند .

فَذَرْهُمْ يَخُوضوا وَيَلْعَبوا ، حَتى يُلاقوا يَوْمَهُمْ الَّذى يُوعَدونَ (٤٢) يَوْمَ يَخْرُجونَ مِنَ الْاَجْداثِ سِراعاً كأنَّهُمْ الى نُصُبٍ يوفِضونَ (٤٣) خاشِعَةً اَبْصارُهُمْ

ئنجا وازیان لێ بێنه با قسەی هیچ‌وپووچو گاڵتەی خۆیان بکەن ، تا تووشی ئەوڕۆژەی خۆیان ئەبن کە بەڵێنیان پێدراوە ، (٤٢) ئەوڕۆژەی کە بەپەلە لە گۆڕ دێنە دەرەوە وەك بۆلای بتەکانیان تاوبدەن (٤٣) چاویان شۆڕو

ئنجا بە پێغەمبەر ئەفەرموێ ( فذرهم ) واز لەم بێبڕوایانە بێنە ئەی محمد ( یخوضوا ) با دەستبکەن بە قسەی هیچ‌وپووچی خۆیان ( ویلعبوا ) وە گاڵتەی خۆیان بکەن ( حتی یلاقوا یومهم الذی یوعدون )تا تووشی ئەوڕۆژە ڕەشەی خۆیان ئەبن کە بەڵێنیان پێدراوە ، وەك ڕۆژی زیندووبوونەوەو لێپرسینەوە بێ ( یوم یخرجون من الاجداث سراعا ) ئەوڕۆژەی کە لە گۆڕ دێنە دەرەوە ، وە بەپەلە ڕووئەکەنە دەشتی کۆبوونەوە ( کانهم الی نصب یوفضون ) هەروەك لە جیهانا ، وە لە ڕۆژی جەژنەیانا بەپەلە لە ماڵ ئەچوونە دەرەوە بۆ لای بتەکانیان ، ئنجا لەوڕۆژەدا ( خاشعة ابصارهم ) چاویان شۆڕۆ

تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ، ذلِكَ الْيَوْمُ الّذى كانوا يُوعَدونَ (٤٤)

---

ڕیسوایی دایانئەگرێ ( وە پێیان ئەووترێ ) ئەمە ئەوڕۆژەیە کە لەوەپێش بەڵێنیان پێدرابوو (٤٤)

---

سەربەرەوژێر ( ترهقهم ذلة ) ڕیسوایی‌و شەرمەزاریی دایانئەگرێ ، وە پێیان ئەووترێ لە ڕووی سەرکۆنەوە ( ذلك اليوم الذى كانوا يوعدون ) ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە پێغەمبەر هەڕەشەی پێ لێ ئەکردن‌و پێتان باوەڕ نەئەکرد ، وە گاڵتەتان پێ ئەکرد .

# سوورەی ( نووح )ە

مەککی‌یە ، ٢٨ ئایەتە ، ٢٢٤ ووتەیە ، ٩٥٠ پییتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

### بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئـــەم سوورەتە داستانێـکی نووح پێغەمبـەرمـان بۆ ئەگێڕێتەوە لەگـەڵ گەلەکەیا ، کە یەکەمین پێغەمبەر بووە ، کە خوا ناردوویەتی بۆ سەر کۆمەڵێك لـە ئادەمیی ، بە ئایینێکی پاکو تەمیزەوە ، وە (٩٥٠) ساڵ لەناویانا ماوەتەوە ، وە بە هـەموو زبانێك بانـگی کردوون بۆ بڕواهێنان بە خواو بە پێغەمبەریەتی خۆی ، وە ئەوان بە بێ‌بڕوایی مانەوە ، وە زۆر ئازاری پێغەمبەرەکەی خۆیان‌دا •

بەم داستانە سێ شت نیشان‌ئەدات :

١ ــ میهرەبانیی خوا دەربارەی کۆمەڵی ئادەمیی کە بەرودوا ئـــەم هـەموو پێغەمبەرانەی بۆ ناردوون ، لە یەکەم پێغەمبەرەوە تا دواهەمین پێغەمبەر « درووودی خـوای لێ بێ » بـە ئایینی پاکو تەمیزەوە ، بۆ ڕێ نموونیی ئادەمیی •

٢ ـ لاساریی ئادەمیی‌و دڵڕەقی‌یان‌و ملەملەو دوژمنایەتی‌یان لەگەڵ پێغەمبەرەکانیانا .

٣ ـ هەوڵ‌و تەقەلای پێغەمبەران‌و خۆڕاگرتن‌و دان بەخۆدا گرتن‌یان لە ڕێی ڕاگەیاندنی فەرموودەو فەرمانانی خوا بە بەندەگانا ، بە بێ قازانج‌و سوودێك کە دەستیان بکەوێ لەم ڕێگایەدا .

ئنجا ئەم داستانی پڕ لە تاڵاوە ئەگێڕێتەوە بۆ پێغەمبەری ئیسلام کە دواترین پێغەمبەرە ، وە ئەرکی هەموو پێغەمبەرەکانی کەوتۆتە سەرشان تا تێبگات ئەندازەی لاساریی ئادەمیی‌و ملەملەی لەگەڵ پێغەمبەرەکەیانا ، وە لە ئەندازەی تێکۆشانی نووح پێغەمبەر ، کە لەو ماوە دوورو درێژەدا کۆڵی نەداو ، دەستی هەڵنەگرت ، وە تا حاڵی بێ کە خوا چۆن ئاگاداریی ئەو چەند کەسانەی کرد کە بڕوایان هێنا ، وە ڕزگاری کردن لەو سزایەی کە بۆی ناردن ، هەر وەك ئەیەوێ پاشەڕۆژی گەلە بێ‌بڕواکەی نووحیش نیشانی بێ بڕواکانی عەرەب بدا ، وە تێیان بگەیەنێ ، ئەگەر ئەمانیش لاساریی بکەن وەك ئەوان لەناوئەچن ، وە حاڵی‌شیان بکات ، کە پێغەمبەرەکەی ئێوە پێغەمبەرێکی گەورەو دڵفراوان‌و میهرەبانە ، وەك نووح نی‌یە کە لەگەڵ ڕقی هەستا نزای

# سورة نوح

## بسم الله الرحمن الرحيم

اِنّا اَرْسَلْنا نوحاً اِلى قَوْمِهِ : أنْ أَنْذِرْ قَوْمَكَ مِنْ قَبْلِ اَنْ يأتِيَهُمْ عَذابٌ اَليمٌ (١) قالَ : ياقَوْمِ ، اِنّى لَكُمْ نَذيرٌ مُبينٌ (٢)

---

# سووڕەی ( نووح )ە

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئێمە نووحمان نارد بۆلای گەلەکەی ، (وە پێمانووت) کە گەلەکەت (بە پەندو ئامۆژگاریی) بترسێنە پێش ئـەوەی سـزای سەختیان بۆ بێت (١) (نووح) ووتی : ئەی گەلی خۆم بەڕاستی من (پێغەمبەرو) ترسێنەرێـکی ئاشکرام بۆ ئێوە (٢)

---

فڕکردن لە هەموو گەلەکەی بـکات ، ئەفەرموێ ( انا ارسلنا نوحـا الى قومه )ئێمە نووحی کوڕی «لامك»ی کوڕی «متوشالح»مان بە پێغەمبەریەتی نارد بۆلای گەلەکەی کـە بتپەرست ، وە پێمـانووت : ( ان انذر قومك ) کـە گەلەکەت بترسێنە ( من قبـل ان یأتیهم عـذاب الیم ) پێش ئەوەی کـە سزای سەختیان تووش ببێ بە خنکان لە جیهاناو بە سووتان لە ئاگری دۆزەخا ( قال یاقوم انی لـکم نذیر مبین ) نووح پێیووتن : ئەی گەلی خۆم بەڕاستی منپێغەمبەری خوام ، بۆ ئێوەی ناردووم تا ئـەم سێ ووتەیەتان پێبگەیەنم ، وە پێتانبڵێم :ــ

ا نِ اعْبُدُوا اللهَ وَاتَّقوهُ وَاَطیعونِ (٣)

(بەمرەنگە) کە بەندەیی خـوا بـکەن ، وە خۆتانی لێ بپـــارێزن ؛ وە فەرمانبەریی من بکەن (٣)

١ ـ ( ان اعبدوا الله ) بەندەگیی‌و پەرستشی خوا بـکەن ، وە دەست لە بتەکانتان هەڵـگرن کـە ناویان «ود»و «سواع»و «یغوث»و « یعوق »و « نسر »ە •

٢ ـ ( واتقوه ) خۆتان بپارێزن لە بێفەرمانیی ئەو خوایە ، واتە هەر فەرمانێکتان پێئەدات بەجێ‌ی‌بێنن ، وە هەرچیتان لێ قەدەغە ئەکات لێ‌ی نزیك مەکەونەوە •

٣ ـ ( واطیعون ) فەرمانبـــەریی من بـکەن لەوەی کـە خـوا بۆی ناردووم بۆ ڕێنموونیی ئێوە •

بەڕاستی ئـەم سێ ووتەیە بنیاتی هـەموو ئایینێـکی ئاسمانی‌یە ، وە لەدوای ئەمانە ئنجا لە لق‌و پۆپا جیـائەبنەوە ، بە ووتەی یەکـەم ـ کـــە خواپەرستی‌یە ـ گـەل ڕزگاری ئەبێ لە شتی پڕوپووچ‌و پشت ئەبەستێ بە خوا • بە ووتەی دووهەم ـ کە ترسە لە خواو خۆپاراستنە لە ناڕەزایی ئەو ـ گەل لە سنووری خوا ناچێتە دەرەوە ، ئەوکاتە ڕەووشت‌و خووی بەرزو بەهێز ئەبێ ، وە لە بۆگەنیی‌و ڕووخـان دوورئەکەوێتەوە • بـە ووتەی سێهەم ـ کە فەرمانبەریی پێغەمبەرە ـ گەل یەك‌ئەکەوێ ، وە لـە دووبەرەکیی بەدوور ئەبێ •

ئێستاش گەلان هەر بەم سێ پلەیەدا سەرئەکەوون‌و بەرز ئەبنەوە لـە ژیانا ، یا ژێرئەکەوون‌و نزم‌ئەبنەوە ، وە باشترین شاهید لەسەر ئـەم

يَغْفِرْ لَكُمْ مِنْ ذُنُوبِكُمْ ، وَيُؤَخِّرْكُمْ اِلى اَجَلٍ مُسَمًّى ، اِنَّ اَجَلَ اللّهِ اِذا جاءَ لا يُؤَخَّرُ ، لَوْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ (٤)

تا خوا لە گوناهتان خۆش ببێ ، وە بتانهێڵێتەوە تا کاتی مردنی ناوبراوتان بێگومان کاتی سزای خوا کە هات دواناکەوێ ، ئەگەر بتانزانیایە (٤)

قسەیە مێژووی گەلانە .

ئنجا ئەفەرموێ : ئەگەر ئەم سێ ووتەیە وەربگرنو کاری پێبکەن ( يغفر لكم من ذنوبكم ) ئەوا خوا خۆش ئەبێ لە گوناهەکانتان ، وە ئەو سزایەی کە بۆی داناوون ـ وەك خنکانتان بێ بە لافاوی گەورە ـ لە سەرتان هەڵئەگرێ ، ئەوکاتە ژیانتان درێژ ئەبێتەوە ، وەکو ئەفەرموێ ( ويؤخركم الى اجل مسمى )وە بە زیندوویی ئەتانهێڵێتەوە تا کاتی خۆی کە خوا بۆی داناوون بژین ، واتە تا ئەودەمەی کە هەموو کەسێکی تر ئەمرێ بە مردنی خۆی ، واتە خوا بڕیاری داوە ئەگەر بڕوا نەهێنن بە خوا بە لافاوی گەورە بتان خنکێنێو لەناوتان ببات لە دەقیقەو سەعاتی خۆی بە بێدواکەوتن ، وە ئەگەر بڕواش بێنن لافاوەکەتان لەسەر هەڵگرێو ئەتانهێڵێتەوە تا کاتی مردنی خۆتان ، ئنجا لەبەرئەوەی کە گەلەکەی بڕوایان بەمە نەبوو ، کە ئەگەر بڕوانەهێنن لە دەقیقەو سەعاتی خۆی بە لافاوی گەورە لەناویان ئەبات ، فەرمووی ( ان اجل الله ) بێگومان ئەو کاتی سزایەی کە خوا دایناوە بۆتان ( اذا جاء ) کە هات ( لا يؤخر ) دواناکەوێ ( لو كنتم تعلمون ) خۆزگە ئەمەتان بزانیایە ، وە لێی

قَالَ : رَبِّ إِنِّي دَعَوتُ قَومِي لَيلاً وَنَهاراً ( ٥ )

ووتی : خوایه من گەلەکەی خۆمم (بەپەنهانیی) بانگ‌کرد بە شەوو بە ڕۆژ (٥)

ووردبونایەتەوە تا ئەچووە دڵتانەوە .

★ ★ ★

بەپێی فەرموودەی خوا نووح پێغەمبەر فەرمانەکانی گەیاند بە گەلەکەی زۆر بە نەرمو نیانی ، بەڵام ئەوان گوێیان نەدایە وە قسەیان نەکرد ، ئنجا نووح لای خوا سکاڵا ئەکات ، بەڵام چۆن سکاڵایەك ؟ سکاڵایەکیوا کە مووبەموو باسی هەوڵو تەقەلاکانی خۆی ، وە بێبڕوایی ئەوان ئەکات ، وە ئەڵێ خوایە بە سێ جۆر لەگەڵیانا خەریك‌بووم ، ماوەیەك هەر بەدزییەوە ئامۆژگاریم ئەکردن ، ماوەیەکیش هەر بەئاشکرا ، ئنجا دەمێ بەئاشکراو دەمێ بەدزییەوە ، هیچیان کەڵکی نەبوو ، وەکو ئەفەرموێ :

١ ـ ( قال ) نووح پێغەمبەر ووتی ( رب انی دعوت قومی لیلا ونهارا ) خوایە من گەلەکەی خۆم بانگ‌کرد لەپێشەوە بەپەنهانیی ، وە یەکەیەکە ئەچوومە لایان ، وە بە شەوو بە ڕۆژ لەگەڵیانا خەریك‌بووم کە بڕوا بێنن بە تۆو بە تاكو تەنیایی تۆ ، بەڵام بێهوودە بوو ، چونکە تا من بانگم ئەکردنو بەسەریانا ئەهاتم ، ئەوان زۆرتر لێم

فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَائِي إِلَّا فِرَاراً (٦) وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ لِتَغْفِرَ لَهُمْ ، جَعَلُوا أَصَابِعَهُمْ فِي آذَانِهِمْ ، وَاسْتَغْشَوْا ثِيَابَهُمْ ، وَأَصَرُّوا ، وَاسْتَكْبَرُوا اسْتِكْبَاراً (٧)

---

وە تا بانگم ئەکردن ئەوان زۆرتر دوورئەکەوتنەوە لێم (٦) وە من هەرچەند بانگم ئەکردن (بۆ بڕواهێنان) تا لێیان خۆش بێت ، ئەوان پەنجەیان ئەکرد بە گوێچکەیانا ، وە کاڵاکانیان ئەدا بە سەرو چاویانا ، وە ئەمانەوە لەسەر ئەو بێبڕوایی‌یە ، وە سەرکێشی‌یان ئەکرد چۆن سەرکێشی‌یەك (٧)

---

دوورئەکەوتنەوە ، وەکو ئەفەرموێ (فلم یزدهم دعائي الا فرارا) بانگ‌کردنەکەی من بۆ ئەوان کەڵکی نەئەدانێ مەگەر دوورکەوتنەوە نەبێ ، واتە تا بانگم ئەکردن بۆ بڕواهێنان بە خواو دوورکەوتنەوە لە بتەکان ئەوان دوورتر ئەکەوتنەوە لە خۆم‌و لە ئامۆژگاری‌یەکانم .

ئەگەر جارێك بمگرتایە لە بوواریکا ، وە ڕێی دەرچوونیان نەمایە ، گوێی خۆیان ئەئاخنی تا گوێیان لە ئامۆژگاری‌یەکانم نەبێ ، وە سەرو چاوی خۆیان دائەپۆشی تا چاویان پێم نەکەوێ ، وەکو ئەفەرموێ (واني کلما دعوتهم لتغفر لهم) وە من هەرچەند بانگم ئەکردن بۆ بڕواهێنان تا تۆ لێیان خۆش ببیت (جعلوا اصابعهم في اذانهم) پەنجەیان ئەکرد بەگوێچکەیانا (واستغشوا ثیابهم) وە بە فەقیانەو سەردەستی بەرگ‌و کاڵایان سەرو چاوی خۆیان دائەپۆشی ، بۆئەوەی کە من نەبینن ، یا من چاووم بەوان نەکەوێ (واصروا) وە درێژەیان بەم بێبڕوایی‌یە ئەدا (واستکبروا استکبارا) وە سەرکێشی‌یان

ثُمَّ اِنّی دَعَوْتُهُمْ جِهاراً (٨) ثُمَّ اِنّی اَعْلَنْتُ لَهُمْ ، وَاَسْرَرْتُ لَهُمْ اِسْراراً (٩)

لەپاشا بەئاشکرا بانگم کردن (٨) ئنجا (دەمێك) بۆم ئاشکرا ئەکردن‌و (دەمێك) بۆم پەنهان ئەکردن بە پەنهان کردنێکی تەواو (٩)

ئەکرد چۆن سەرکێشی‌یەك •

٢ ـ لەپاش ئەوەی کە بانگ‌کردن‌و ئامۆژگاریی کردنیان بەدزی‌یەوە کەڵکی نەبوو ، ئنجا بەئاشکرا بانگم ئەکردن ، وە لە هەموو کۆبوونەوەیەکیانا باسی خوام بۆ ئەکردن ، وە لەسەر هەموو کۆلان‌و شەقامێك ئەوێستام‌و ڕێ‌ی خوام نیشان ئەدان ، وەکو ئەفەرموێ ( ثم انی دعوتهم جهارا ) لەپاشا بەئاشکرا ، وە بە بێ‌ترس‌و بیم بانگم ئەکردن •

٣ ـ لەپاشا کە زانیم ئەمەش کەڵکی نی‌یە ، ئنجا لەگەڵ کامیان بە باشم بزانیایە بەپەنهانیی ، وە لەگەڵ کامیشیان بە باشم بزانیایە بە ئاشکرا ئامۆژگاریم ئەکردن ، وەکو ئەفەرموێ ( ثم انی اعلنت لهم واسررت لهم اسرارا ) لەپاش ئەوە ، دەمێك بەئاشکرا پێم‌ئەووتن‌و دەمێکیش بەپەنهانیی•

ئنجا باسی ئەو قسانە ئەکا کە داوێتی بە گوێچکەیانا ، ئەفەرموێ

فَقُلْتُ : اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ، إِنَّهُ كَانَ غَفَّاراً ( ١٠ ) يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُمْ مِدْرَاراً (١١)وَيُمْدِدْكُمْ بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ ،

ئنجا پێم‌ووتن : داوای لێخۆشبوون بکەن لە پەروەردگارتان ، بەڕاستی خوا زۆر لێخۆشبووە (١٠) (ئنجا گەر وابکەن) بارانی زۆرتان بەسەرا ئەبارێنێ (١١) وە دارایی‌و کوڕی زۆرتان بێ ئەبەخشێ ،

( فقلت : استغفروا ربکم ) پێم‌ووتن : بڕوا بە پەروەردگارتان بێنن‌و داوای لێخۆشبوونی لێ بکەن ( انه کان غفارا ) چونکە بەڕاستی خوا زۆر لێخۆشبووە ، ئنجا ئەگەر بڕوای پێ‌بێنن‌و داوای لێخۆشبوونی لێ بکەن ، پێنج شتی زۆر گرنگتان ئەداتێ :

١ ـ ( یرسل السماء علیکم مدرارا ) لەئاسمانەوە بارانی زۆرتان بەسەرا ئەبارێنێ ، ئەوکاتە وولاتتان بڕ ئەبێ لە دەغڵ‌ودان‌و لەوەڕو پیت‌و فەڕ ، وە هەموو ئەکەونە خۆشیی‌یەوە •

٢ ـ ( ویمددکم باموال ) بەیدەزبەی هەموو جۆرە دارایی‌یەك ئەڕێژێ بەسەرتانا •

٣ ـ (وبنین) کوڕی زۆرتان ئەداتێ •

زانایانی کۆمەڵایەتی ئەڵێن نەتەوە کاتێك زۆر ئەبێ لە گەلێکا کە دادو ئاسایش‌و دڵنیایی زۆر بێ ، وە زۆرو ستەم‌و هەژارانی لەناوا نەبێ •

وَيَجْعَلْ لَكُمْ جَنَّاتٍ ، وَيَجْعَلْ لَكُمْ اَنْهاراً (١٢)

وە باخاتی جوانو جۆگەئاوی زۆرتان ئەداتێ (١٢)

٤ ـ ( ويجعل لكم جنات ) باخاتو بێستانی زۆرتان بۆ ئەکات ، کە هەموو جۆرە میوەیەکی لێ بخۆن ، دیارە هیچ گەلێك داوای میوە ناکات تا تێر نەبێ ، وە هەمووجۆرە پێبژیویێكو دەستکەوتێکی زۆری نەبێ •

٥ ـ ( ويجعل لكم انهارا ) جۆگەو ئاوی زۆرتان ئەداتێ کە لە هەموو لایەکەوە بیتو فەڕی لێ وەرگرن •

لەمئایەتانەوە دەرئەکەوێ کە گەلی نووح لە ساڵێکی زۆر سیاساڵا بوون ، نە بارانیان بووە ، نە دەغڵودانو لەوەڕ ، بەڵکو نە ئاوی خواردنەوە ، هەموو ڕەشوڕووتو بێکار ماونەوە بەڕەنگێك کە ژنو مێرد ئارەزووی نزیككەوتنەوەی یەکتریییان نەبووە •

ئنجا ئەگەر بڕوایان بە خواو دەستووروو باوی ببوایە ، وە بەپێی شەرعی خواو فەرموودەی پێغەمبەرەکەیان بجوولایەتەوە ، ئەو کاتە فێری ئیشو کار ئەبوون لە کارێز لێدانو هەڵکەندنی بیرو ڕاکێشانی جۆگە ئاوو ناشتنی باخو باخاتو بێستان ، وە قازانجو دەستکەوتیان زۆر ئەبوو ، وە بەتەواویی ئەبووژانەوە ، لە لایەکیتریشەوە کە بە فەرموودەی خواو پێغەمبەرەکەیان بکردایە ، دەستیان لە بێشەرعیو کاری خراپ هەڵئەگرت ، ئەوکاتە هەر کەسە لەگەڵ خێزانی خۆی

ما لَكُمْ لا تَرْجُونَ لِلّهِ وَقاراً (١٣) وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْواراً ؟ (١٤)

ئەوە بۆچی ناترسن لە گەورەیی خوا ؟ (١٣) لەکاتێکا کە دروستی کردوون بە چەند پلە (١٤)

بەئاشتیو بەرێكوپێكی دائەنیشت ، وە ئاژاوە لەناو ماڵو منالا نەئەما ، وە ژنو مێرد زۆر بەخۆشیی ڕایانئەبوارد ، وە منالی زۆریان ئەخستەوە .

ئائێستا نووح پێغەمبەر بە گەلەکەی ئەووت : ئەگەر بڕوا بێنن خێروبێری ئاسمانو زەویتان بەسەرا ئەڕێژێ ، ئنجا پێیانئەڵێ : کە ووردبینەوە لە خۆیانو لە ئەستێرەکانی ژوور سەریان ، وە ئەفەرموێ لە یەکەمیانا ــ کە ووردبوونەوەیە لە خۆیان ــ ( ما لكم لا ترجون لله وقارا )ئەوە چیتانە واتە بۆچ لە گەورەیی خوا ناترسنو گوێی نادەنێ ؟ ( وقد خلقكم اطوارا ) لە کاتێکا کە بە بێ گومان دروستی کردوون بە چەند پلە ، واتە بە گەلێ پلەدا سەری خستوون تا کردوونی بە ئادەمیی ، کە پلەی یەکەمی دلۆپێك ئاوو پلەی دوایی مرۆڤێکی تەواوە ، واتە خوایەك ئەمە میهرەبانیی بێ لەگەڵتانا ، وە ئەمە هێزو دەسەلاتی بێ ، چۆن ئەبێ بڕوای پێنەهێنن ؟ وە بە دروستکەرو پەروەردگاری خۆتانی نەزانن ؟ وە سەردانەنەوێنن بۆ خۆیو بۆ پێغەمبەرەکەی ؟ وە فەرمانبەریی نەکەن ؟

اَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ خَلَقَ اللّٰهُ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقاً (١٥) وَجَعَلَ الْقَمَرَ فِيهِنَّ نوراً ،

ئایا نابینن کە خوا چۆن حەوت ئاسمانی دروستکردووە یەك لەسەر یەك (١٥) وە مانگی گێڕاوە لەناویانا بە ڕووناکو

وە ئەفەرموێ لە دووهەمیانا ـ کە ووردبوونەوەیە لە ئەستێرەکان ( الم تروا كيف خلق الله سبع سماوات طباقا ) ئایا نابینن کە خوا چۆن حەوت ئاسمانی بە ژوور سەرتانەوە دروستکردووە ، یەك لەسەر یەك .

مەبەس لەم حەوت ئاسمانە حەوت ئەستێرەن لەو ئەستێرە گەڕۆکانەی کە بەدەوری ڕۆژا ئەسووڕێنەوە ، وە ئاسمان بن بۆ زەویی، واتە لە زەویی دوورتر بن بە ڕۆژ وەك مريخ . مشتری . زحل . ئەورانووس . نیبتون . پلۆتۆ . تێکس ، کە ئەم دواییەیان لە ساڵی١٩٥٣دا دۆزراوەتەوە ، بەڵام ئەوانەی کە لە زەویی نزیکترن بە ڕۆژ ئەوانە لەژێر زەوییەوەن ، وە ئاسمان نین بۆ زەویی ، وەك «عطارد»و «زهره» هەروەك زەویی خۆی بەرناکەوێ وەك لە تەفسیری ئایەتی ٢٩ لە سوورەتی «بقره»دا باسمان کردووە وە وێنەکەیمان نیشانداوە ، وە لە تەفسیری سوورەی «ملك»دا باسمان کردووە لەم جزمەدا ( وجعل القمر فيهن نورا ) وە مانگی گێڕاوە بە ڕووناك لەناویانا .

مەبەس لەم مانگە هەر مانگی خۆمان نییە ، چونکە مانگی

وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِراجاً (١٦)

ڕۆژی گێڕاوە بە چرا (١٦)

خۆمـان هـەر ڕووناکیی بـە زەویی ئەدات ، نـەك بە ئەستێـرە گەڕۆکەکانی تریش ، بەڵکو مـەبەس مانـگی هـەموو ئەستێـرە گەڕۆکەکانە(١) واتە زۆر لـە گەڕۆکەکان یەکی مانگێك یا زیاتر لـە مانگێـکی هەیە ، خوا گێڕاوێتی بە ڕووناکیی بۆ ئەو گەڕۆکە .

وەك لە تەفسیری سوورەی «ملك»دا باسمان کرد « زەوی مانگێك»و «مریخ» دوو مانـگ و «مشتری» دوانزە مانـگ و «زحـل» نۆ مانـگ و «ئەورانووس» پێنج مانگ و «نیتون» دوو مانـگی هەیە . «عطاردو زهرە» مانگیان نییە ، «پلوتۆ»و «ئێکس»یش مانگیان بەرچاو نەکەوتووە ، واتـە زەویی لەگەڵ مریخ و مشتری و زحل و ئەورانووس و نیبتونا ٣١ مانـگیان هەیە ، کە هەریەکە ئەستێرەی خۆی ڕووناك ئەکاتەوە .

( وجعل الشمس سراجا )وە ڕۆژی گێڕاوە لەناویانا بە درەخشان .

لەم ئایەتەوە دەرئەکەوێ کە مانگ و ڕۆژ لە حەوتەوانەی گەڕۆك نین ، ئەگینـا ظرفیتی شت ئەبێ بۆ خـۆی کـە ئەمەش دروست نییە ، هـەروا ئایەتی « ولئن سـألتهم مـن خلق السمـاوات والارض ، وسخر الشمس والقمـــر لیقولن الله ٦١/٢٩ »(٢) وە گـەلێ ئایـەتی تریش

(١) چونکە ئەلف‌ولامی سەر «قمر» بۆ جنسە نەك بۆ عهدە .

(٢) واتە ئەگـەر بپرسییت لێیان کـە کێ ئاسمانەکان و زەویی دروست کردووە وە ڕۆژو مانـگی ڕام‌کردووە ، ئەڵێن خوا .

نیشان ئەدەن کـە مانگ‌و ڕۆژ لە حەوتەوانەی گەڕۆك نین ، بە نیشانەی ئەوەی کە جیا ناویان ئەبات ، وە لە زەویی‌و حەوتەوانە جیایان ئەکاتەوە ، هـەروەك دەرئەکەوێ کـە زۆر لە گەڕۆکەکـان مانگیان هەیە ، کـە ئەمەش تازە زانراوە ، وە هەروەك دەرئەکەوێ کـە ڕووناکیی مانـگ لە خۆیەوە نی‌یە ، وە ڕووناکیی ڕۆژ لەخۆیەوەیەتی •

کەواتە لەم ئایەتەدا چوار معجزەی زانیـنی «علمی» زۆر گەورەی تیـایە :

١ ـ مانگ‌و ڕۆژ لە حەوتەوانەی گەڕۆك نین ، کـە ئەمـە تازە زانراوە •

٢ ـ حەوتەوانەی گەڕۆك بە پێ «عطاردو زهرەو زەویی» حـەوتن ، کە ئەمەش لە ساڵی ١٩٥٣مدا زانراوە •

٣ ـ زۆر لە حەوتەوانەی گەڕۆك مانگیان هەیە •

٤ ـ ڕووناکیی مانگ لەخۆیەوە نی‌یە ، بەڵـکو لەڕۆژەوەیە ، وە ڕووناکیی ڕۆژ لەخۆیەوەیەتی ، ئەمانە ئەگەر بەهۆی سرووشی خواوە ئاشـکرا نەکرانایە محمدێـکی نەخوێنـدەوار پانزە چەرخ لەمـەپێش ئەمانەی لەکوێ زانی ، بەڕاستی زانینی ئـەم جـۆرە شتانـە لەوڕۆژەدا هـەر لـە خواوە بووە ، وە خوا ڕاست ئەفەرموێ کە ئەڵێ « قل انزلـه الذی یعلم السر في السماوات والارض »(١) فرقان/٦ •

(١) واتە بڵێ ئەی (محمد) قورئانی ناردۆتە خوارەوە ، ئەوکەسـەی کە هەرچی نهێنی ئاسمانان‌و زەویی هەیە ئەیانزانێ •

وَاللهُ اَنْبَتَكُمْ مِنَ الْاَرْضِ نَبَاتًا (١٧)

وه خوا ئێوەی ڕوواندووه له زەویی به ڕواندن (١٧)

لەدوای فەرماندان بە ووردبوونەوە لــە ئەستێرەکان ، ئنجا نووح پێغەمبــەر ڕووی گەلەکــەی وەرئەگێڕێ لــە ئاسمانەوە بۆ زەویی تا ووردبینەوە کــە چۆن پەیدا بوون لــە خاك ، وە ئەمرنو ئەبنەوە بــە خاك ، وە زیندوو ئەبنەوەو دێنە دەرەوە لە خاك ، وە ئەفەرموێ ( والله انبتکم من الارض نباتا )خوا ئێوەی ڕوواندووە لە زەویی بە ڕوواندنێکی تایبەتی ، واتە یا خوای گــەورە بابەگەورەتان ــ کە ئادەمە ــ لــە خاك دەری‌هێنــاوە دروستی کردووە ، یاخــۆ هــەموو ئادەمیی‌یــەکی دروست‌کردووە لــە خــاك ، بەم‌ڕەنــگە هەمووی لــە ئاوی نێــرو مێ‌و ئاوەکەش لــە خواردەمەنیی‌و خواردەمەنیی‌یەکەش لــە خــاك دروست کردووە ، کەواتــە گیاو ئادەمیی هەردوکیان بێچووی زەوین ، وە لــە ناوسکی ئەم خاکە هاتوونە دەرەوە ، وە بە شیری ئەم دایکە ئەژین •

بەم ئایەتە نیشان ئەدات کــە عالەمی گیاو گیان وەك یەکن ، وە لە زۆر دەستوورو باوی ژیانا چوون یەکن ، لەبەرئەوە هێندێك لە زانایانی بــەرز ئەڵێن : ئادەمیی درەختێــکە ئەڕوا بەســەر زەوییدا ، درەختیش ئادەمیی‌یەکە تا ئەژنۆی لە خاك گیراوە •

لەپاش ئەوەی کــە نووح پێغەمبەر بە گەلەکەی ووت کــە خوا ئێوەی وەك گیا لە گڵ دەرهێناوە ، ئنجا بەم‌بۆنەیەوە ئەیەوێ بــدا بــە

ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا ، وَيُخْرِجُكُمْ اخْرَاجاً (١٨)

لەپاشا ئەتانباتەوە ناوی ، وە دەرتان ئەهێنێتەوە (لێی) بە دەرهێنان (١٨)

تۆیچکەیانا کە لەپاش مردن ئەتان کاتەوە بە خاك ، وە دوای ئەوەش کە کاتی خۆی هات وەك جاری یەکەم دروستتان ئەکاتەوە لە خاك ئەفەرموێ ( ثم یعیدکم فیها )لەپاشا ئەتانگێڕێتەوە بۆ ناوخاك بە مردن ، وە خاکی جەستەتان لەگەڵ خاکی زەویدا تێکەڵ ئەکاتەوە ( ویخرجکم اخراجا )وە دەرتان ئەهێنێتەوە لە خاك وەك جاری یەکەم بە دەرهێنانێکی تایبەتی ، واتە ئەمە شتێکی زۆر ئاشکراو ئاسانە ، جێی دەمەقاڵێی و دوودڵی نی‌یە ، ئەو خوایەی کە دوێنێ وەك گیا لە خاك دەری‌هێناویت، سبەینێش هەر بەودەستوورە لە خاك دەرت ئەهێنێتەوە ، ئیتر بۆ بە هی یەکەم بڕوا ئەکەیت و بە هی دووهەم بڕوا ناکەیت •

یەکێك لە معجزەی قورئان ـ کە کەس لێی وورد نابێتەوە ـ ئەمەیە کە زۆر جار ئایەتێك بە دوو یا بە سێ یا بە زیاتر جۆر ئەیلێتەوە کە هیچیان لە شێوەو ئاهەنگی قورئان ناچێتە دەرەوە • بۆنموونە وەك ئەم ئایەتە وایە کە ئێستا تەفسیرمان کرد ئایەتی سوورەی «طه» کە ئەفەرموێ « منها خلقناکم ، وفیها نعیدکم ، ومنها نخرجکم تارة اخری » وە ئایەتی سوورەی «اعراف» کە ئەفەرموێ « قال منها تحیون ، وفیها تموتون ، ومنها تخرجون » •

لەم جۆرە معجزەیە بەسەدها تیایە ، وە ئەووتریێ و ئەووترێتەوە بێ‌ئەوەی یەکێك لێی ووردبێتەوە •

وَاللّهُ جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ بِسَاطاً ( ١٩ ) لِتَسْلُكُوا مِنهَا سُبُلاً فِجَاجاً (٢٠)

---

خوا زەویی بۆ ڕاخستوون ( ١٩ ) تا هاتوچۆ بکەن بە ڕێگە کراوەکانیا (٢٠)

---

لەدوایی‌دا نووح پێغەمبەر باسی میهرەبانیی‌یەکی‌تریان بۆ ئەکات ، کە خوا زەویی بۆ ڕاخستوون وەك بەڕە ، وە لە هەموو لایەکەوە ڕێگای بۆ ڕاکیشاوون بەڕەنگێك کە بتوانن هاتوچۆی پیا بکەن ، وە هەموو ئیش‌و کارێکی خۆیانی لەسەر جێ‌بەجێ بکەن ، ئەفەرموێ ( والله جعل لکم الارض بساطا ) خوا زەویی بۆ ڕاخستوون ( لتسلکوا منها سبلا فجاجا )تا هاتوچۆ بکەن بە ڕێگا کراوەکانیا ، وە بێن‌و بچن بەشوێن ئیش‌و کارو قازانج‌و سوودی خۆتانا .

ئا بەم‌جۆرە ، وە بەم‌زبانە شیرینە ساڵەهای ساڵ نووح پێغەمبەر لەگەڵ گەلەکەیا خەریك‌بوو ، وە بە هەموو زبانێك ئامۆژگاریی‌کردن ، بەڵام کەڵکی نەبوو ، وە نووح هەر دانی بەخۆیا گرت‌و کۆڵی نەدا ، تا بەتەواویی نائومێد ما ، وە بەتی هیوای بچڕا ، ئنجا ڕووی‌کردە

قال نوحٌ : رَبِّ انَّهُمْ عَصَوْنی ، وَاتَّبعوا مَنْ لَمْ یَزِدْهُ مالُهُ
و وَلَدُهُ الاّ خَساراً (٢١) وَمَکَروا مکْراً کُبّارا (٢٢)

---

نووح ووتی : خوایـە ، گـەلەکەم بێفەرمانی‌یان کردم ، وە پەیڕەویی
کەسێکیان کرد کە ماڵو منالیان قازانجی پێ‌نەگەیاندوون زیان نەبێ (٢١)
وە زۆر فڕوفێڵی گەورەیان کرد (٢٢)

---

بارەگای خوا ، وە سکالاکەی پێشووی تەواو کرد ، فەرمووی ( قـــال
نوح : رب انهم عصونی ) نووح پێغەمبـەر ووتی : ئـەی پەروەردگارم
بەڕاستی گەلەکەم بێفەرمانی‌یان کردم ( واتبعوا من لم یزده ماله وولده
الا خســارا ) وە پەیڕەویی کەسێـکیان کـــرد ـ وەك ســــەرۆكو
دەوڵەمەندەکانیان ـ کە دارایی‌و ماڵو منالیان قازانجی پێ‌نەگەیاندوون
زیان نەبێ •

ئەم سەرۆكو دەوڵەمەندانە ، پارەی زۆرو منالی زۆرو دەستو
پێوەندی زۆریان بووە ، ئەمانە وایان زانیوە ئەگـەر بڕوا بێنن بە نووح
پێغەمبەر ، گەورەیی‌یەکەیان نامێنێ ، وە ئەمانیش وەك هەژارەکان ئەبێ
دوای پێغەمبەرەکــەیان بـکەوون ، لەبەرئـەوە هـاتن بەرهـەڵستی
پێغەمبەرەکـەیان وێستان ، لەلایەکـەوە فڕوفێڵیان لــە نووح ئەکرد
بەدزی‌یەوە ، لەلایەکی‌ترەوە بـە فڕوفێڵ دڵی گـەلەکەیان لێ ســارد
ئەکردەوە ، وەکو ئەفـەرموێ ( ومکروا مـکرا کبارا ) زۆر فڕوفێڵی
گەورەیان کرد •

وَقَالُوا : لا تَذَرُنَّ الِهَتَكُمْ وَلا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلا سُواعاً ، وَلا يَغُوثَ وَيَعوقَ وَنَسْراً (٢٣)

---

وە ووتیان دەست هەڵنەگرن لە خواکانتان ، وە دەست هەڵنەگرن لـــە (پەرستنی) «ود»و «سواع»و «یغوث»و «یعوق»و «نسر» (٢٣)

---

هەر لـە فرۆفێڵی ئەو گەورانەیە ، بۆ لەخشتەبردنی گەلەکەیان ، ئەمـە کە هانەهانەیان ئـەدان لەسـەر پەرستنی بتەکانیـان ، وە ناویان ئەبردن بە خـوای ئەوان ، وەکو ئەفـەرموێ ( وقالوا ) ووتیـان بـە گەلەکەیان ( لا تذرن الهتكم )دەست هەڵنەگرن لە خواکانتان نەخوازەلا پێنجە گەورەکەیان ، کە بەتایبەتی ناویان ئەبات ، ئەفەرموێ ( ولا تذرن ودا ، ولا سواعا ، ولا یغوث ، ویعوق ، ونسرا )وە دەست هەڵنەگرن لە پەرستنی ئـەم بتـانە کـە ناویان «ود»و «سواع»و «یغوث»و « یعـوق »و « نسر »» •

بتپەرستیی بە دوو جۆر پەیدا بووە :ـ

١ ـ «صابئی»یەکان بڕوایان زۆر بووە بە ئەستێرە ، وە بەلایانەوە وابووە کە هەموو شتێك ئەوان ئەیکەن لەسەر زەویی ، بەڵام لەبەرئەوەی کـە زۆر دوورەدەستن ، وە دەست نایانـگاتێ ، تا ماچیان بکەنو لێیان بپاڕێنەوە ، هاتن لـە وێنەی هـەر ئەستیرەیەك شتێکیان دروستکرد بۆ پەرستنو لێپاڕانەوەی ، وە ئەمە پێیئەڵێن دینی «صابئی» کە کۆنترین دینێکی پڕوپووچە ، ئەم دینە مایەوە تا ابراهیمی خلیل هاتو ڕووخاندی •

٢ ـ پیاوی گەورە گەورە بوون لە پێغەمبەرانو پیاوچاکانو پاڵەوانان ، کە گەلەکەیان خۆشیان ویستوونو بڕوایان وا بووە کە پورتەوێکی خوایان تیا بووە ، لەبەرئەوە لەدوای مردنیان هاتوون وێنەیان بۆ دروست‌کردوونو دایان‌ناوون ، بۆئەوەی کە هەمیشە لە بەرچاویان بن بە خۆیانو گەورەییو ڕەووشتو خووی جوانیانەوە ، تا بیریان نەچنەوە ، وە هەمیشە خێریان بۆ کردوون وبووخوردیان بۆ سووتاندوون ، لەپاشا بەرەبەرە ئنجا ماچیان کردوونو لێیان پاڕاونەتەوەو داوای شتی‌وایان لێ کردوون کە هەر لە خوا داوا ئەکرێ ، لەدوایی‌دا ئنجا پەرستوونیانو نوێژیان بۆ کردوون تا وای لێ هات جێیەك نەمایەوە لە هەموو کونو قوژبنی سەرزەویی‌دا کە بتێکی تیا دانەنرابێ ، تەنانەت ئەوڕۆژەی کە پێغەمبەر شاری مەککەی گرت ٣٦٠ بتی لەناو زووری « کعبە »و دەوروبەری هێنایە دەرێو فڕێی‌دان ، یەکێك ئەگەر لەمە وورد بێتەوە تێ‌ئەگات کە بۆچی ئیسلام وێنەو ڕازاندنەوەی گۆڕی مردووی بەتەواوی قەدەغە کردووە ، تا پڕو بیرێژنو سادەو تێ‌نەگەیشتوو هەڵنەخەڵەتێن ، وە بیروباوەڕیان لە خواوە نەیەتە سەر ئەم گۆڕە ڕزیوانە ، بەڵێ چوونە سەر گۆڕی پیاوچاکان هەیە ، بەمەرجێگە کە یادی خۆیانو زانینی بەرزیان یا ڕەووشتو خووی جوانیان یا سەردانانو تێکۆشانیان لە ڕێی خواو مسڵمانانا ، یا لەڕێی کۆمەڵەو گەلا بکەیت ، وە پەندو ئامۆژگاری‌یان لێ وەرگریت ، وە نزای چاکیان بۆ بکەیت لە بارەگای خوادا کە پلەو پایەی ئەو مردووانە ـ با پێغەمبەریش بن ـ بەرزبکاتەوە ، نەك داوای شتێکیان لێ بکەیت کە هەر لە خوا داوائەکرێ ، ئەم هەموو سلاوانەی

وَقَدْ اَضَلُّوا كَثيراً ،

وە (ئەمانە) زۆریان گومڕا کرد ،

کـە لە پێغەمبەر ئەدرێ هەمووی داوای ڕەحمەتە لـە خوا کـە بیڕێژێ بەسـەر گیـانی پاکیـا ، بەڵام داخی بەجـەرگم لـە بتپەرستی کۆنی جارانەوە ، هاتووینەتە سـەر پەرستنی گۆڕی شێخو پیرو دارو بەردو جێنزرگەی ئەمو ئەو ، کە ئەمانە هەمووی گومڕاین لە ئیسلامەتیدا • ( وقد اضلوا کثیرا )بەڕاستی ئـەم سەرۆکانە زۆریان گومڕا کرد ، وە سەریان لێ تێکدان •

★ ★ ★

لێرەدا نووح پێغەمبەر دڵی جۆشی سـەندو زانی کـە گەلەکەی زۆر پیس‌و بۆگەنن ، بە هیچ شتێك دڵیان داناچڵەکێ‌و ناگەڕێنەوە ، وە بە هیچ جۆرە ئامۆژگـاری‌یەك بڕوا ناهێنن ، نەخوازەلا کـە خواش سرووشی بۆ کرد : کـە لەوەی تائێستا بڕوای پێ‌هێناویت ئیتر کەسی‌تر بڕوات پێ ناهێنێ لە گەلەکەت ، وەك لە ئایەتێکی‌ترا ئەفەرموێ « واوحی الی نوح انه لن یؤمن مـن قومك الا مـن قـد آمـن ۱۱/۳۶ »[۱] لەبەر

---

(۱) واتە سرووش‌کرا بۆ نووح کە ئیتر لە گەلەکەت کەسی‌تر بڕوات پێ‌ناهێنێ مەگەر هەر ئەوانەی کە لەپێشەوە بڕوایان هێناوە •

وَلا تَزِدِ الظّالِمينَ اِلاّ ضَلالاً (٢٤) مِمّا خَطيئاتِهِمْ أُغْرِقوا فَأُدْخِلوا ناراً ، فَلَمْ يَجِدوا لَهُمْ مِنْ دونِ اللهِ أَنْصاراً (٢٥)

---

(خوایە) ئەم ستەمکارانە لە گومڕایی زیاتر هیچی‌تریان بۆ زۆر مەکە (٢٤) بەهۆی گوناهەکانیانەوە بە ئاو خنکێنران ئنجا خرانە ئاگرەوە ، بێجگە لە خوا هیچ یارمەتی‌دەرێکیان دەست‌نەکەوت (٢٥)

---

ئەمانە نزای لێکردن فەرمووی ( ولاتزد الظالمين الا ضلالا ) خوایە ئەم ستەمکارانە لە گومڕایی زیاتر هیچی تریان بۆ زیاد مەکە ، وە زورتر سەریان لێ بشێوێنە •

لەمانە لەپێشەوە دەرکەوت کە گەلی نووح زۆر گومڕاو بێ‌بڕوا بوون ، وە نووح پێغەمبەر زۆر لێ‌یان نائومێد بووە ، دیارە گەلێك کە وای لێ هات شایانی هەموو جۆرە نزاو خەشم‌و قینێکی خوایی‌یە، وەکو ئەفەرموێ ( مما خطيئاتهم اغرقوا ) بەهۆی گوناهەکانیانەوە هەموویان بە ئاو خنکێنران ( فادخلوا نارا ) و خرانە ناو ئاگری دۆزەخەوە ( فلم يجدوا لهم من دون الله انصارا ) بێجگە لە خوا ، یارمەتی‌دەرێکیان دەست‌نەکەوت ، واتە بتەکانیان نەیانتوانی ڕزگاریان بکەن •

قورئان باسی ئەوە ناکات کە ئەم لافاوە گـەورەیە هەمـوو رووی سەرزەویی گرتووە ، یا هەر چەند شوێنێـکی تایبەتی گرتووە بـەڵام پێنج شت لە قورئانەوە دەرئەکەوێ :

ـ لەپێش لافاوەکەوە ئاو لە هەموو شوێنێك هەڵقوڵاوە بـەزۆریی تەنانەت لەناو تەندووریشەوە ئاو هاتۆتەدەرێ •

٢ـ نووح پێغەمبەر ، کەس‌وکاری خۆیو ئەوانەی بڕوایـان پـێ هێنابوو ، لەگەڵ نێرو مێیەك لە زۆر گیان‌لەبەرانی‌تری هەڵـگرتـووە لەناو کەشتی‌یەکەیا •

٣ ـ کەشتی‌یەکەی بەسەر شـەپۆلە ئاوی‌وادا ڕۆیشتووە کە وەك کێو وابووە •

٤ـ کەشتی‌یەکـەی لەسـەر کـێوی جـوودیی « گوودیـی » نیشتـۆتەوە (١) •

٥ـ نووح‌و کەس‌وکارو ئەوانـەی کە بڕوایـان پـێ هێنابـوو ڕزگاریان بووە ، وە ئەوانیـکەی‌تر هەموو خنکاوون •

لەپاش ئەوەی کە لافاوەکە نیشتەوە ، نووح پێغەمبەر لاشـــەی هێندێك لە بێ‌بڕواکانی بەرچاوکەوت لەناو لیتەو قوڕاوا ، برینی دڵـی کولایەوەو نزایەکی‌تری کرد لەوانەی کـە وەك گەلەکەی ئەم ئـەبن

(١) ئەم کێوە لە ڕۆژهەڵاتی دەجلەوەیە لە کوردستانی تورکیـــا ، لە شوێنێك کە پێی‌ئەڵێن «ئەرارات» هەروەك تەوراتییش بـە ئەرارات ناوی ئەبات •

وَقَالَ نُوحٌ : رَبِّ ، لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّاراً (٢٦) إِنَّكَ إِنْ تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا عِبَادَكَ ، وَلَا يَلِدُوا إِلَّا فَاجِراً كَفَّاراً (٢٧)

---

نووح فەرمووی : خوایە ھیچ کەسێك لە بێبڕوایان مەھێڵە لەسەر زەویی (٢٦) (چونکە) ئەگەر تۆ بیانھێڵیت بەندەگانی تۆ گومڕا ئەکەن ، وە ھەر منالی بەدکاری سوپاسنەکەر ئەخەنەوە (٢٧)

---

لە بێبڕواییدا ، ئەفەرموێ ( وقال نوح : رب لا تذر علی الارض من الکافرین دیارا) نووح ووتی : خوایە ھیچ کەسێك لەبێ بڕوایان مەھێڵە لەسەر زەویی چونکە (انك ان تذرھم) ئەگەر تۆ بیانھێڵیت لەلایەکەوە ( یضلوا عبادك ) بەندەگانی تۆ گومڕا ئەکەن ، لە لایەکیتریشەوە ( ولا یلدوا الا فاجرا کفارا ) ھەر منالی بەدکاری سوپاسنەکەر ئەخەنەوە ، منالێك کە لە باوەشی ئەو خراپانەدا گەورە بووبن ، وە ناپاکیی‌و بێبڕواییيان لێ وەرگرتبن ، واتە خوایە ئەگەر یەکێك لەوانەی کە بڕوایان پێ ھێناووم ، وە لە خنکان ڕزگاریان بووە ، دەستیکرد بە بێبڕوایی ، وەك بێبڕواکان لە ناوی بەە • بەمە نووح ئاڵ‌و مناڵەکانی خۆی‌و ئەوانەی کە بڕوایان پێھێناوە ئەیانترسێنێ لەوەی کە بێبڕوا ببنەوە •

لەبەرئەوەی کە پێغەمبەران ئادەمین ، وە جێی ھەڵەو کۆتاھیین ، وە ھێچیان بە شایستەی خۆیان ناچنە بەھەشت مەگەر بە میھرەبانیی خوا

رَبِّ اغْفِرْ لِي وَلِوالِدَيَّ ، وَلِمَنْ دَخَلَ بَيْتِيَ مُؤْمِناً ، وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِناتِ وَلا تَزِدِ الظّالِمِينَ إِلاّ تَباراً (٢٨)

---

خوایە خۆشبە لە خۆمو باوکمو دایکم ، وە لەوکەسەی کە دێتە ماڵم بە بڕوادارییەوە ، وە لە هەموو پیاوو ژنی بڕوادار ، وە بەشی ستەمکاران زۆر مەکە تیاچوونو لەناوچوون نەبێ (٢٨)

---

نەبێ ، بۆیە نووح پێغەمبەر لە دواییدا لە خوا ئەپاڕێتەوە ، وە داوای لێخۆشبوونی لێئەکات ، ئەفەرموی ( رب اغفر لی ولوالدی ) خوایە خۆشبە لە خۆمو لە باوکو دایکم ( ولمن دخل بیتی مؤمنا ) وە لەوکەسەی کە دێتە ماڵم بە بڕوادارییەوە ( وللمؤمنین والمؤمنات ) وە لە هەموو پیاوو ژنێکی بڕوادار ، وە ئەگەر هەڵەیەکمان کردووە ، چاومان لێ بپۆشە بە میهرەبانیی خۆت ( ولا تزد الظالمین الا تبارا ) وە بەشی ستەمکاران زۆر مەکە ، تیاچوونو لەناوچوون نەبێ •

# سوورەی ( جـن )ە

**مەککی‌یە ، ٢٨ ئایەتە ، ٢٨٥ ووتەیە : ٧٥٩ پیتە**

## بسم الله الرحمن الرحيم

**بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

لەبابەت جنۆکەوە زۆر دووبەرەکیی هەیە ، هێندێك بەلایانـەوە وایە کە هەن‌و خۆیان ئەگـۆڕن ، وە بە هەموو ڕەنگ خۆیان نیشـان ئەدەن ، وە ئەتوانن زیان بـگەیەنن ، وە خوا ژنی لێ هێنـاوون ، وە فریشتە کچی خوان‌و لە جنۆکە بوون ، وە بـەم بۆنـەیەوە جنۆکـە ئەپەرستن ، وەك لە سوورەی «صافات» دا ئەفەرموێ « وجعلوا بينه وبين الجنة نسبا »(١) ، وە لایان‌وایە کە جنۆکە هەمووشت ئەزانن ، وە زۆر شت ئەڵێن بە جووکیی‌و ئەستێرەشناس‌و جادووگەر ... ، تەنانەت عەرەبەکانی مەککەو دەوروبەری پـێیان‌وابـوو کـە جنۆکە ئـەم قورئانە بە پێغەمبەر ئەڵێ .

وە هێندێکیش پـێی وایە کـە جنۆکە هەر نین ، وە قسەکردن لەبابـەت جنۆکەوە بـە شتێـکی زۆر پڕوپووچی ئـەزانن ، ئنجا لـە ناوەندی ئەم دوو بیروباوەڕەدا قورئان ڕێگایەکی مام‌ناوەندیی گرتووە ،

(١) واتە خوێشایەتی‌یان خستۆتە ناوەندی خواو جنۆکەوە .

نە ئەڵێ نیین ، نە ئەڵێ بەم‌جۆرەن کە مەردوم تێ‌ی‌گەیشتوون .

جنۆکە جۆرێـکن لە دروست‌کراوانی خوا کە هەرگیز بە چـاو نابینرێن ، وەختێ خۆی زەویی کە لە ڕۆژ جیابۆتەوەو پارچەیەك ئاگری گڕی هەڵگیرساو بووە ، تا بە هەزاران هەزار ساڵ کوژاوەتەوەو سـارد بۆتەوە ، وەك لە شوێنی خۆی باس‌کراوە ، ئنجا لەو ماوەیەدا خوا لـە ئاگرەکەی جنۆکەی دروست‌کردووە ، هەروەك دوای ساردبوونەوەی ئادەمیی دروست‌کردووە لە خاکەکەی ، وەك لە سوورەی «الرحمان»دا ئەفەرموێ « خلق الانسان من صلصال کالفخار ، وخلق الجان من مارج من نـار » (١) .

خوا گـەلێ جۆرە گیانداری هـەیە ، هێندێکیان بە هەوا ئەژیین ، لەگـەڵ لـە ئاوا نوقوم بوون ئەخنکێن ، هێندێکیان لە ئاوا ئەژیین لەگەڵ لە ئاو هاتنـە دەرەوە ئەمرن ، ئنجا هەروەك ئەمـانە هـەیە با جـۆرە گیـاندارێکیش بێ لـە ئاگر دروست‌کرابێ ، وە ئێمـە نەی‌بینیین ، وە هەرچیش ئێمـە نەی‌بینیین مانای وانی‌یە کـە نی‌یە ، چونـکە ئـەو گیانەی کـە لەبەرەمانایە ، وە لە هەموو شت نزیکترە لێمان ، نە بە چاو ئەی‌بینین ، نە بە لووت بۆنی ئەکەین ، نە بە گوێ ئەی‌بیـن ، نە بە دەست دەستمان بەری‌ئەکەوێ ، نە بە دەم تامی‌ئەکەین ، کەچی بێ‌گومانیشیین کە هەیە ، کەوابوو با فریشتەو جنۆکەش شتێك بن وا .

---

(١) واتە خوا ئادەمیی دروست‌کرد لە گڵێـکی ووشـکی ڕەقی وەك سواڵەت وە جنۆکـەی دروست‌کرد لـە بڵێسەی ئاگرێـکی بێ‌دووکەڵ .

تێناگەم ئەوانەی کـە هەر لەخۆیانەوە ئەڵێن ئەم جۆرە شتـانە نین ، لەســـەر چبنیاتێك وائەڵێن ؟ ئایا لەبەرئەوەیە هـــەرچی لـە بوونـەوەر «کون»دا هـەیە هـەموویان تاقی کردۆتـەوەو دەستیان لێ کوتاوە ، وە ئەمدیوو ئەودیویان کردووە ، تەنیـا جنۆکـەو فریشتە نەبێ ، کـە بەرچاویان نەکەوتووە ؟ هیچ زانایەك وا نازانێ ، وە بیری وا ناڕوا ، چونکە ئەو گیانلەبەرانەی کە نەدۆزراونەتەوە لەســـەر زەویی تێجـگار زۆرن ، وە کـەس نەی‌وتووە کـە زنجیرەی ئـەو گیانلەبەرانە تەواو بووەو بە پایان گەیشتووە .

یا لەبەرئەوەیە کـە هەرچی هێزانی پەنهان « قوای مکنونە » هەیە لـە بوونەوەرا ، هەموویان دۆزیوەتەوە ، جنۆکە نەبێ ؟ کەس ئەمەی نـەووتووە ، چونـــکە زۆر هێـــز هـەیە ، هـەر ڕۆژەی هێندێـکی ئەدۆزرێتـەوە کـە تا دوێنێ نەدۆزراوەتەوە ، زانایان بە هـەموو هێزو تەوانایی خۆیانـەوە قۆڵیان لێ هەڵماڵیوە بۆ دۆزینـــەوەی هێـــزانی بوونەوەر ، وە هەمیشە بڵاوی ئەکەنەوە کـە هێشتا لـە قەراغی دەریای بێ‌پایانی نادانیی‌دا وێستاوون ، وە هێشتا دەستیان بـە هیچ نەکردووە ، کەوابوو ئەم بڕیارە چی‌یە کـە ئەم جۆرە کەسانە ئەیدەن بـە نەبوونی جنۆکـە ، زانیـــاریی ئادەمیی لـەم بوونەوەرەدا ئەوەندە کـــەمو هیچ‌وپووچە ، ڕێنادات بۆ ئادەمیی‌یەك کـە تۆزێ نرخی خۆی بزانێ ، بڕیار بە هیچ شتێك بدات .

لەگـەڵ ئەمیشە کـە جیهانی گیانو فریشتەو جنۆکـە لـــە زۆر دەمێکەوە بووە بە گرێی دڵی زانایان ، وە لە هەموولایەکەوە نەخوازەلا

لـە ئەوروپاو ئەمریـکا خەریـکی کۆڵینەوەو پۆست‌کەندە « تحقیقات » کردنیانن ، خواش دوو دەرگای لێ کردوونەتەوە ، بۆ سـەر عالەمی گیان، یەکێکیان دەرگــای « علمی تنویمی مغناطیسی » ، دووهەمیان دەرگــای « علمی مباحثی نفسی »بە یەکـــەمیان کـــە مرۆڤ ئەنوێنن ، وە گیانی هەڵئەسووڕێنن لە هێندێ کارو باری‌وادا کە بەپێی باو «عادة» لـە کردن نین ، وە بەمــە دەرئەکەوێ کە گیانی مرۆڤ جیایە لە جەستەی • بـــە دووهەمیان گیـانی مردوو ئەهێنن‌و ئامادەی ئەکەن ، وە قسەی لەگــەڵ ئەکەن ، تا بۆیان ئاشکرا ئەبێ کـە ئەمە گیانی فلانەکەسە ، وە هـــەر پرسیارێکی لێ بـکەن وەڵام ئەداتەوە ، وە ئەمـانە لـە زۆر وولات لیژنە «لجنة»یان هـەیە ، وە ئەندامیان لـە هـــەموو جیهـــانا لە بیست ملیون تێپەڕیـــوە ، وە ئـەم ئەندامـــانەش یا زانایـــەکی بەرز ، یا پزیشك یائەندازیار ، یا پرۆفیسۆرێـکە ، وە «٣٠٠» گۆڤار «مجلە» یان هەیە کە هەر ئەم باسانەی تیا ئەنووسن ، وا چاوەڕوان ئەکرێ ، کـە لەمـەولا زانایان لەم‌ڕووەوە زۆر شت بدۆزنەوە ، وە شۆڕشێك بخەنە جیهانەوە •

ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر لەگەڵ چەند کەسێك لە هاوڕێیانی خۆی چوو بۆ «سوقی عکاظ» وە لە چۆڵی «نخلة» دابەزین‌و نوێژی بەیانی‌یان بە کۆمەڵ کرد لە خزمەت پێغەمبەرا ، لەم دەمــەدا چـەند جنۆکەیەك

# سورة الجــن

بسم الله الرحمن الرحيم

قُلْ : اُوحِيَ اِلَيَّ اَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِنَ الْجِنِّ

## سوورەی ( جــن )ە

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

(ئەی محمد) بلّێ : کە سرووشم بۆ کرا کــە چــەند کەسێك لە جنۆکــە گوێیان گرت (لە قورئان خوێندنەوەم)

بەلایانا تێپەرین ، کــە گوێیان لە دەنــگی قورئان خوێندنی پێغەمبەر بوو ، وێستانو گوێیان بۆ قورئانەکە گرتو دڵیان دایە ، وە بڕوایان هێنا کــە ئەمە نامەیەکی ئاسمانییە بۆ پێغەمبەری ئیسلام هاتووە ، بێئەوەی کــە پێغەمبەر پێیان بزانێ ، یا بییان بینێ ، تا ئەم سوورەتە هاتە خوارێ، فەرمووی ( قل اوحى الى انه استمع نفر من الجن ) ئەی محمد بلّێ بــە گەلەکەت ، کــە سرووشم بۆ کرا لە خواوە ، کــە چەند کەسێك لــە جنۆکە گوێیان گرت لە قورئان خوێندنەوەم •

فَقالُوا : اِنَّا سَمِعْنَا قُرْآناً عَجَباً ( ١ ) يَهْدِي اِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ ، وَلَنْ نُشْرِكَ بِرَبِّنَا اَحَداً (٢)

ئنجا ووتیان : بەڕاستی ئێمە قورئانێکی سەیرمان ~~بیت~~ بیست (١) ڕێنموونیی ئەکات بۆ ڕێی ڕاست ، وە ئێمەش بڕوامان پێ هێناوە ، وە هەرگیز کەس ناکەین بە هاوبەشی پەروەردگارمان (٢)

ئنجا سیانزە شتمان بۆ ئەگێڕێتەوە لە زمان جنۆکەوە ، تا مەردوم یەك بەیەك تێبگەن ، ئەفەرموێ :

١ ـ ( فقالوا انا سمعنا قرآنا عجبا ) ووتیان ـ لەدوای گەڕانەوەیان بۆناو گەلەکەیان ـ بەڕاستی ئێمە قورئانێکی زۆر سەیرمان بیست کە لە ووتاری ئادەمیی ناچێ ( یهدی الی الرشد ) ڕێنموونیی ئەکات بۆ ڕێی ڕاست ( فامنا به ) ئێمەش بڕوامان پێهێنا ( ولن نشرك بربنا احدا ) وە هەرگیز کەس ناکەین بە هاوبەشی پەروەردگارمان ، واتە ئەی بێبڕوایانی قورەیش جنۆکە بە بیستنی چەند ئایەتێك لە قورئان بڕوایان هێنا ، کەچی ئێوە بڕواناهێنن لەگەڵ ئەم هەموو قورئانەی کە پێغەمبەر ئەیخوێنێتەوە بەسەرتانا ، وە ئێوە بە پێغەمبەرەکەتان ئەڵێن : جووکیی یا شێت ، کە هەرکامێکیان بێ ئەبێ زانیاریی لە جنۆکەوە وەرگرێ ، کەچی ئەوە جنۆکە بە بیستنی چەند ئایەتێك سەرسام بوونو کاری تێکردنو بڕوایان پێهێنا •

وَاَنَّـهُ ـ تَعالی جَدُّ رَبِّنـَا ـ ما اتَّخَذَ صاحِبَةً وَلا وَلداً (٣) وَاَنَّهُ كانَ يَقولُ سَفيهُنا عَلَى اللهِ شَطَطاً (٤) وَاَنّا ظَنَنّا اَنْ لَنْ تَقُولَ الْاِنْسُ وَالْجِنُّ عَلَى اللهِ كَذِباً (٥)

وە بەڕاستی ـ بڵنـدە گەورەیی پەروەردگارمان لە شتی ناشایستە ـ هیچ ژنو مناڵێکی بۆ خۆی دانەناوە (٣) وە هەرزەی ئێمە درۆی نالەباری هەڵئەبەست دەربارەی خـوا (٤) وە ئێمە وامان ئەزانی کە ئادەمیی‌و جنۆکـە هەرگیز درۆناکـەن دەربارەی خوا (٥)

٢ ـ ( وانـه تعالی جدربنا ) وە بەڕاسـتی ـ بڵندە گـەورەیی پەروەردگارمان ، لە هەموو شتێکی ناشایستە ـ ( ما اتخذ صاحبة ولا ولدا) هیچ ژنو مناڵێـکی بۆ خۆی دانەناوە ، واتە خوا گەلێك لەمـە بەرزترە کە ژنی بێ یا مناڵی بێ •

عەرەبەکـــان وایان‌ئەزانی کـە خوا ژنی‌هێناوە لـــە جنۆکە ، وە فریشتە کچی خوان لەو ژنەی ، ئنجـا وا جنۆکـە ، خۆیان ئەم قسە پڕو پووچە بەدرۆئەخەنەوە ، ئەگـەر شتی‌وا ببوایە ، جنۆکە شانازیی‌یان پێوە ئەکرد ، بەڵام خوای خۆیان بە پاكو تەمیز ڕائەگرن لەم جۆرەشتانە •

٣ ـ ( وانه کان یقول سفیهنا علی الله شططا ) بێ‌گومـان هـەرزەو نادانی ئێمە درۆی نالەباریان ، هەڵئەبەست دەربارەی خوا ، بەم ڕەنـگە مسیح‌و عوزەیریان بە کوڕی خواو فریشتەیان بە کچی ئەو دائەنا •

٤ ـ ( وانا ظننا ان لن تقول الانس والجن علی الله کذبا ) ئێمە وامان

ئەزانی کـە ئادەمیی‌و جنۆکە هەرگیز درۆناکـەن دەربارەی خوا ، وە ناتوانن بەدرۆ بڵێن : خوا هاوبەشی هـەیە ، وە ژن‌و منـاڵی هـەیە ، لەبەرئەوە هەرچێکیان ئەووت ئێمە بڕوامان پێ‌ئەکردن ، بەڵام ئێستا کە گوێمان لە قورئان بوو ، تێ‌گەیشتین کـە قسەکانیان درۆیە ، وە ئێمـە بەهەڵەدا چووین کـە ئـەم دوو دەستەیەمان بە ڕاستگۆ ئەزانی ، وە تێ‌گـەیشتین کـــە لەناو ئـەم دوو دەستەیەدا درۆزن زۆرە ، پێویستە دوورکەوتنەوە لە خۆیان‌و درۆو دەلەسەیان •

ئێمە کـە ئادەمیین – ئەبێ لەم قسەی جنۆکانە پەند وەرگرین – پەندەکەش ئەمـەیە کـە ئێمەش بێدار بینەوە وەك ئەوان ، وە تێ‌بگەین کـە لەناو ئێمەشا درۆزنی‌وا زۆرن کە داوامان لێ‌ئەکەن کە بڕوا بکەین بـە هـەرچی بووترێ ، یا لـە کتێبا بنوسرێ ، با پێچەوانەی ژیریی‌و بیریش بێ ، بەڵـکو با پێچەوانەی ئەو شتانەش بێ کە ئیسلام بڕیاری لەسـەر داوە ، کەوابوو شایستە نی‌یە کـە ئەو چەند جنۆکەیە لە ئێمە ژیرترو بەبیرتر بن ، وە بڕوای ئـەوان لـە بڕوای ئێمـە ڕاست‌ترو ڕێك‌وپێك‌تر بێ •

لە پێش ئیسلاما هەرچەند یەکێك یا چـەند کەسێك لـە عەرەب شـەو بمانایەوە لە چۆڵ‌و بیابانێکا ، زۆر ئەترسان لـە جنۆکـەی ئـەو ناوچەیە ، وە لایان‌وابوو کـە هەموو کۆمەڵە جنۆکەیەك گەورەیەکیان هەیە ، ئنجا ئەهاتن پەنایان ئەبرد بە گەورەی ئەو جنۆکانە ، تا بیانپارێزێ لە جنۆکەی ئەو ناوچەیە ، یا ئەگەر نەخۆش بکەوتنایە نوشتەیان ئەکرد بەخۆیانا ، یا پارچە دارێك یا کوتە پەڕۆی سەرگۆڕێکیان هەڵ‌ئەگرت ،

وَ اَنَّهُ كَانَ رِجَالٌ مِنَ الْاِنْسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِنَ الْجِنِّ ، فَزَادُوهُمْ رَهَقاً (٦)

وە زۆر مرۆڤ لە ئادەمیی پەنایان ئەبردە بەر چەند مرۆڤێك لە جنۆکـە (کە بیانپارێزن) کەچی زۆرتر ماندوویان ئەکردن (٦)

کـە ئایینی ئیسلام هات ئەمانەی هەڵگرت ، وە داوای کرد لـە هەموو مسڵمانێك کە هەر پەنا بگرێ بە خوا وە هەڵگرتنی نوشتەو گەلێ شتی تری دانا بـە هـاوبەش پەیداکردن بۆ خـــوا ، وە بەمبۆنەیەوە ئـەم ئایەتە هاتەخوارێ ، فەرمووی :

٥ ـ ( وانه كان رجال من الانس ) زۆر مرۆڤ لە ئادەمیی ، کـــە شەو بمانایەتەوە لە دەشتێکی چۆڵو بیابانا ( يعوذون برجال من الجن ) پەنایانئەبرد بە گەورەی جنۆکەی ئـەو شوێنە ، تا بیانپارێزێ لە زیانی جنۆکەی ئەو ناوچەیە ، چونـکە پێیان وابوو کە هەموو شوێنێکی چۆڵ جنۆکەی زۆری تیایە ، وە ئەو جنۆکانە گەورەیەکیوایان هەیە ئەگـەر پەنای پێ ببرێو داوای پاراستنی لێ بکرێ ، پەنایان ئەدات ( فزادوهم رهقا ) کەچی بەم پەناگرتنە جنۆکەکان زۆرتر ئادەمییەکانیان ماندوو ئەکرد ، واتە ترسیان زۆرتر لێ ئەنیشت ، چونـکە هەرکەسێك تا هاوار لە غەیری خوا بـکات دڵنیایی کـەمتر ئەبێ ، وە هـــەمیشە دڵی نـــە خرتەخرتو پەلەپەلا ئەبێ ، بەڵام کـە هـاوار لـە خوا کرا مـەردوم بەتەواویی دڵنیا ئەبێ ، چونکە بەڕاستی هەر خوایە کە بمێنێو لەناونەچێ ،

وە هەر زیندوو بێ‌و نەمرێ ، وە هەر وەك خۆی بمێنێتەوە ، ئنجا هەرکەسێك دەست بەخوا بگرێ هەرگیز دەستی بەرنابێ ، وە هەرکەسێك دەست بە غەیری خوا بگرێ زۆر زوو دەستی بەرئەبێ ، چونکە ئەو شتە یا ئەگۆڕێ ، یا نامێنێ •

هێندێك زانا لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ئەڵێن : زۆر مرۆف لە ئادەمیی پەنایان ئەبردە بەر چەند مرۆڤێك لە ئادەمیی‌تر وەك جووکیی‌و جادووگەرو ساختەچی بێ ، وە داوای نوشتەی «ئەبوودووجانە»و دێوبەندیان لێ ئەکردن تا بیان‌پارێزن لە زیانی جنۆکە ، وە ئەو جووکیانەش بۆ گەرمیی بازاڕی خۆیان ئەوەندەی‌تر ئەیان‌ترساندن لە دێوو جنۆکە ، تا زۆر نوشتەو دێوبەندیان پێ بنووسن ، وە باری شانیان قورستر بکەن بە سەرقەڵەمانەو خەرج‌و باجی دێوبەند(١) •

ئەم ئایەتی شەشەمە دوو مانای بوو ، لەسەر مانای یەکەم دەرکەوت کە جنۆکە هیچیان بەدەست نی‌یە ، وە ناتوانن زیان بە کەس بگەیەنن ، وە شایستەی ئەوە نین کە ئادەمیی لێ‌یان بترسن •

قورئان لەسەر زبانی جنۆکە ، بیروباوەڕی مەردومان ڕاست ئەکاتەوە دەربارەی دێوو ، دێوبەندو جنۆکەو نوشتەی ئەبوودووجانە ، کەچی بەداخەوە ڕۆژبەڕۆژ باشتر خۆمان فرێ‌ئەدەینە باوەشی جووکی‌و ساختەچی‌یەوە •

---

(١) لەسەر مانای یەکەم «من الجن» ئەبێ بە سیفەت بۆ « رجال » • لەسەر مانای دووهەم پەیوەند ئەبێ بە «یعوذون»ەوە ، واتە پەنایان ئەگرت لە جنۆکە بە جووکیی کە بی‌یان‌پارێزن بە دێوبەندو «ئەبوودووجانە» •

وَ اَنَّهُمْ ظَنُّوا كَمَا ظَنَنْتُمْ أنْ لَنْ يَبْعَثَ اللهُ اَحَداً (٧)
وَ اَنَّا لَمَسْنَا السَّمَاءَ ، فَوَجَدْنَاهَا مُلِئَتْ حَرَساً شَدِيداً
وَ شُهُباً (٨)

وە ئەوان گومانیان بردووە ، هەروەك ئێوە گومانتان بردووە کە هەرگیز خوا کەس نانێرێ (بۆ ڕێنموونیی) (٧) وە ئێمە ئەگەڕاین بەشوێن دەنگ‌و باسی ئاسمانا ، کەچی دیمان پڕکراوە لە پاسەوانی قایم‌و تیری ئەستێرە (٨)

٦ ـ ( وانهم ظنوا كما ظننتم ) ئادەمیی گومانیان بردووە ، هەروەك ئێوە ـ ئەی جنۆکە ـ گومانتان بردووە ( ان لن يبعث الله احدا ) کە هەرگیز خوا کەس نانێرێ بە پێغەمبەرێتی ، نە بۆ ئادەمیی‌و نە بۆ جنۆکە ، واتە کە درۆش ئەکەن ، چونکە ئەوە محمدی کوڕی عبدالله کە خوا بە میهرەبانیی خۆی بە پێغەمبەر ناردوویەتی بۆ هەردوولا ، وە قورئانی بۆ ناردووە ، ئەو قورئانەی کە چەند ئایەتێکمان لێ بیست ، وە لەگەڵ بیروباوەڕی جارانی ئێمەدا ڕێك نەکەوت ، وە دڵی پاك کردینەوە لە زەنگی فڕوفێڵ‌و بڕوبووچ ، وە ئێوە ـ ئەی گەلی عەرەب ـ لە ئێمە شایستەترن بۆ بڕواهێنان بەم پێغەمبەرە ، چونکە ئێوە گەلی ئەوو تیرەی ئەوون .

٧ ـ (وانا لمسنا السماء ) ئێمە ئەگەڕاین بەشوێن دەنگ‌و باسی ئاسمانا ( فوجدناها ملئت حرسا شديدا وشهبا ) کەچی کە تەماشامان

ئەکرد پڕکراوە لە پاسەوانی قایمو تیری ئەستێرە •

مەبەس لەم پاسەوانانە ئەبێ شتێك بن غەیری «شهب» چونـکە بـە واوی عطفە جیایکردۆتەوە ، ئنجا لەکاتێکا کـە شهب پارچەیەك بێ لــە مــادەی ئەستێرە ، ئەبێ ئەم پاسەوانانە لە مادەیەکی‌تر بن غەیری مادەی ئەستێرە ، وە جێگایان ـ بەپێی فەرموودەی قورئان ـ ئاسمانە ، واتە ئەو بۆشایی‌یەی کــە لەدەوری زەوی‌یە • ئەمە پانزە چەرخە قورئان ئەمەی فەرمووە ، ئایا زانینو زانیاریی ئەم پاسەوانانەی دۆزی‌یەوە ؟! وە کــەی دۆزی‌یەوە ؟!•

لە ٢٠ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٥٥م لیژنەی ذرە «ئەتۆم» بڵاوی کردەوە کــە دکتۆر «ایرنست لورنس» ئەتۆمێــکی یاخی ســـەرکێشی دۆزیی‌یەتەوە لــە کارگەی ذرە لە زانستگای کالیفورنیا کە ٢٥ ســـاڵە زانایانی ذرە لێی‌ئەترسن •

زانایان دەمێکە قسە لەم ئەتۆمە سەرکێشە ئەکەن ، وە ئەیانزانی کە هەیە ، بەڵام نەیان‌ئەبینی •

ئەم ئەتۆمە بەشێکی زۆر پچکۆلانەیە کە پێی‌ئەڵێن « پروتۆنی سارد» کـــە بەدەوری زەوییدا بڵاوبوونەتەوە بەزۆریی ، وە ئاســـمانی زەویی پڕکردووە ، وەتەمەنی زۆر کورتە ، واتە بەشێکە لە هەزار ملیون بەشی چرکەیەك •

ئەم پاسەوانانە بە هــەر مادەیەکا هەڵئەقێن لە ئاسمانا ، لەناوی‌ئەبات ،

وا دەرئەکــەوێ هــەر پارچــە ئەستێرەیەك کـــە لە بۆشایی دەرەوە « فضای خارجي » بێتو ڕووبکاتە زەویی ئـــەم پرۆتۆنی ساردە پـــا هەڵئەتەقێو ئەیسووتێنێ ، وە نایەڵێ بـگاتە زەویی ، وە بەمڕەنگە خوای گـەورەو میهرەبان زەویی‌و گیانلەبەرانی سەرزەویی پاراستووە لـــەم پارچە ئەستێرانەی کـە شەو ڕۆژیی بە هەزاران هەزار ئەکشێن‌و ڕووەو زەویی دێنە خوارەوە ، وە لە ڕێگا ئەسوتێن‌و نامێنن مەگەر بەدەگمەن شتێکی کەمی بـگاتە زەویی(١) .

ئەم تاقــە ئایەتە بەسە بۆ بڕواهێنان بە خواو بە پێغەمبەرو بە قورئان ، ئەگــەر ئەم ئایەتە سرووشی خوا نەبێ پێغەمبەر ئەمــەی چۆن ئەزانی ؟ کێ پێی‌ووت ؟ لە چزانستگایەکا وەری گرت ؟! تا ســاڵی ١٩٥٥م کێ ئەمەی زانیوە خوا نەبێ ؟ کــەواتە هــەر ئەوەیە کــە خوا ئەفەرموێ « قل : انزله الذى يعلم السر في السماوات والارض »(٢) .

مەبەس لـە شهب ئـەو پارچــە ئەستێرانەن کە لەگەڵ زەویی‌دا بەدەوری ڕۆژا ئەسووڕێنەوە ، وە لەبەر بچووکیی بەئاسمانەوە نابینرێن ، وە بە ملیۆن‌و بلیۆن لـە کۆمەڵەی ڕۆژیی ئێمەدا بڵاوبوونەتەوە ، وە لـە شوێنی خۆیان ئەترازێن‌و ئەکشێن ڕووەو زەویی .

---

(١) ئەم باسەم لەکتێبی « الله والعلم الحديث »ی عبدالرزاق نوفل وەرگرتووە .
(٢) واتە بڵێ «ئەی محمد» ئـەوی ئـەم قورئانە ئەنێرێتە خوارەوە ئەوکەسەیە کە ئاگای لە نهێنیی هەموو ئاسمانەکان‌و زەویی‌یە ، کە ئەویش خوایە .

وَاَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَاعِدَ لِلسَّمْعِ ، فَمَنْ يَسْتَمِعِ الْآنَ يَجِدْ لَهُ شِهَاباً رَصَداً (٩)

وە ئێمە جاران دائەنیشتین لە چەند جێگایەك لە ئاسمان بۆ گوێ گرتن ، ئیتر ئەوکەسەی لەمەولا گوێ بگرێ تیرێکی ئەستێرە ئەبینی بە چاوەڕوانی خۆی (٩)

٨ ـ ( وانا كنا نقعد منها مقاعد للسمع ) ئێمە جاران لەپێش هاتنی پێغەمبەری ئیسلاما ، دائەنیشتین لە چەند جێگایەك لە ئاسمان ، بۆ گوێ گرتن لە دەنگ‌و باسی ئاسمان ( فمن يستمع الان ) ئنجا هەرکەسێك لە ئێستاکە بەدواوە گوێ بگرێ بەئاسمانەوە ( يجد له شهابا رصدا ) تیرێکی ئەستێرە ئەبینێ بە چاوەڕوانی خۆی ، بۆئەوەی بۆی دابێتە خوارەوە .

لەم قسەی جنۆکانەوە دەرئەکەوێ کە جنۆکە هەمیشە ویستویانە کە گوێ بگرن بەئاسمانەوە ، وە دەنگ‌وباسی لێ وەربگرن ، جاران لەپێش هاتنی پێغەمبەرا گوێیان پێوە گرتووە ، وە بە بیری خۆیان هێندێ شتیان لێ هەڵکڕاندووە ، وە دە ئەوەندەش درۆیان پێوە ناوە ، بەڵام دوای هاتنی پێغەمبەر ئیتر ئەگەر نزیکی ئاسمان بکەونەوە دەرئەکرێن ، واتە دوای هاتنە خوارەوەی قورئان ، دەرگای زانین‌و زانیاریی لە کۆمەڵی ئادەمیی کرایەوە ، وە دەستوورو باوی ئاسمان‌و زەویی بەناو ئادەمیی‌دا بڵاوکرایەوە وە بۆ هەموو شتێك ڕێگایەك دانراو

دەرگایەکی بۆ خرایە سەر پشت ، هەروەخت بتەوێ بۆی بچیت ئەبێ لەو ڕێگایەوە بۆی بچیت ، واتە جنۆکە لەپێش هاتنی ئیسلاما بازاڕێکی گەرم‌وگوڕیان بووە ، بەهۆی نادانی مەردومەوە ، بەڵام دوای هاتنی قورئان ئەو بازاڕەیان شکا .

واتە جاران جووکیی‌و جادووگەرو پیاوانی زۆرزان گاڵتەیان ئەکرد بە ژیریی‌و بیری مەردوم ، وە کوتەکی دەستی هەموو لایەکیان هەر جنۆکە بوو کە مەردومی پێ بترسێنن ، یا دەنگ‌وباسی ئاسمانی پێ وەرگرن ، وە ئەم جۆرە بیروباوەڕانە لە مێژووی کۆنی ئادەمیدا زۆر کاریگەر بوون ، وە یاریان بە ژیریی‌و بیری مەردوم کردووە ، بەڵام لەپاش هاتنە خوارەوەی قورئان‌و هاتنی پێغەمبەری ئیسلام هەرچی دەرگای زانین‌و زانیاریی بوو هەمووی کرایەوە ، وە هەرچی دەرگای شتی پووچ بوو داخرا ، تەنانەت لەسەر زمانی جنۆکە دووشتی پێ‌گەیاندین (یەکەم) کە جنۆکە ئازاری کەس نادەن ، هەروەك نابینرێن (دووهەم) جنۆکە شتی نهێنی نازانێ ، وە هەرچی نهێنی بێ هەمووی هەر لای خوایە ، وە دەستی کەسی ناگاتێ ، وەك لە ئایەتێکیترا ئەفەرموێ « وعنده مفاتح الغيب لا يعلمها الا هو »[1] .

دوای ئەوەی جنۆکە باسی نادانی خۆی کرد ، ئنجا کاکڵە «مغزی» یەکت ئەدەنێ کە پێویستە هەموو ئادەمی‌یەك وەری گرێ ، ئەفەرموێ :

(١) واتە کلیلی «دەرگای» نهێنی هەر لای خوایە ، کەس نایزانێ ئەو نەبێ .

وَاَنَا لا نَدْری : أشَرٌ أُرِیدَ بِمَنْ فِي الْاَرْضِ ، أمْ أرادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَداً (١٠)

---

وە ئێمە نازانین ئایا بەدیی ویستراوە بۆ ئەوانەی کە لەسەر زەوین ، یا پەروەردگاریان ڕێنموونیی ویستووە بۆیان (١٠)

---

٩ ـ (وانا لا ندری اشر ارید بمن في الارض ام اراد بهم ربهم رشدا) واتە ئێمەی جنۆکە کـە ئێوەی ئادەمیی واتان‌ئەزانی کـە هەموو شتێك ئەزانین ـ وا نی‌یە ، وە ئێمـە بەڕاستی نازانین خوا چی بڕیوەتەوە بۆ دانیشتـووانی سـەرزەویی ، ئایا بەدیی هـەڵبژێرراوە بۆیان بـــە ناردنی پێغەمبەری ئیسلام ـ چونـکە ئەگـەر بڕوای پێ نەهێنن لەناوئەچن وەك گـــەلانی پێش ئەوان ، کـە بڕوایان بـە پێغەمبەرانی خۆیان نەهێنـاو لەناوچـوون ـ یا پەروەردگاریان ئەیەوێ گەلەکـەی بڕوای پێ بێنێ تا تووشی خێرو خۆشی هەردو جیهان بێن •

واتە ئیتر نە بە تەمای زانینی ئێمـە بن بۆ ئەم جۆرە شتانە ، وە نە بە قسەی جووکیی‌و جادووگەریش بڕوا بـکەن ، ئەمە قسەی جنۆکـە بوو ، بەڵام بەپێی دەستوورو باوی قورئان کـە ئەفـەرموێ « وان لیس للانسان الا ما سعی »[1] خوا خۆی هیچی نەبڕیوەتەوە لەمانە لەخۆیەوە ، بەڵکو چاکیی‌و خراپیی‌و گومڕایی‌و ڕێنموونیی هەموو کەسێك‌و هەموو گەلێـکی بەستۆتەوە بە هەوڵ‌و تەقەلاو ژیریی‌و بیرو ووردبوونەوەی

---

(١) واتە هەرچی ئادەمیی بە هەوڵی خۆی دەستی نەخـات دەستی ناکەوێ •

خۆیانەوە •

ئەگـەر یەکێك بڵێ : لەم ئایەتانەوە وا دەرکەوت کە دوای هاتنی پێغەمبـەر جنۆکە ڕێ‌نەدرێن بۆ گوێ‌گرتن بەئاسمانەوە بەهۆی تیـری ئەستێرەوە ، لەگەڵ ئەمیشە کـە لەپێش پێغەمبەریشا ئەم ئەستێرانە هەر کشاوون ، وە ئەوەتی ئاسمانو زەویی هەیە ئەمانە هەر بوونو هـەر ئەبن ، ئنجا ئەگـەر یەکێك وا بڵێ ئێمەش ئەڵێین : قورئان کشانی ئەم ئەستێرانەی گێڕاوە بە نیشانە بۆ ئاگادار کردنەوەی ئادەمیی کـە جنۆکە جارێکی‌تر ئەو نرخەی نابێ کە جاران بوویەتی •

قورئان پڕبەدەم هاوار ئەکات کـە ژیریی‌و بیر بەهۆی هـاتنی قورئانو پێغەمبەرەوە ، لـەم شتە پڕوبووچانە ڕزگاری بوو ، وە با ئـەم ئەستێرە کشاوانە نیشانە بن بۆ ئێوە لەسەر دەرکردنی جنۆکەو شەیتان ، واتە ئیتر باوەڕ مەکەن بەو جووکیی‌و جادووگەرو ساختەچی‌یانەی کە یاریتان پێ‌ئەکەن •

وەك ئەمـەی قورئان وایە ، ئەوەی کـە لـە تەوراتا ئەفەرموێ : خوا بەڵێنی دا بە بەنووح پێغەمبەر کە جارێـکی‌تر لافاوێـکی‌تری وەك لافاوەکەی پێشوو نەبێتەوە ، وە خوا پەلکە زێڕینەی کرد بـە نیشـانە لەسـەر ئەم بەڵێنە ، واتە تا پەلـکە زێڕینە لە جیهانا بێ ئەو لافاوە نابێ ، ئنجـا ئەوانەی کـە تەفسیریان لە تەورات کردووە ئەڵێن : لەمـەوە دەرناکەوێ کـە پەلـکە زێڕینە لەپێش لافاوەکـەدا نەبووە ، چونـکە پەیدابوونی پەلـکە زێڕینە شتێکی سرووشتی‌یە ، هەرچەند هەتاو بدا لە دڵۆپی باران ئەو پەیدا ئەبێ ، بەڵام ئەوی جاران بووە خوا گێڕاویتی بـە

وَ اَنَّا مِنَّا الصَّالِحُونَ ،

وە ئێمە هێندێکمان باشین

نیشانە لەسەر ئەوەی کە لەمەولا نەبێ ، لەپاشا نموونەیان هێناوەتەوە بە تاشەبەردێکی گەورە کە لە زەویی‌یەکا لایەکی بەدەرەوە بێ ، وە ئەمڕۆ ئەو زەوی‌یە بەش بکرێ بە دووبەشەوە ، وە ئەو بەردە بکرێ بە نیشانەی دوو بەشەکــە وە نیشانیدا کــە سنووری هــەردولا لــەو بەردەوە ئەگەڕێتەوە •

هــەر بەمڕەنــگە قورئانیش کشانی ئەستێرەی گێڕاوە بە نیشانەی پڕوپووچی قســەی جووکیی‌و جادووگــەرو ساختەچی ، کــە گۆیا گوێ ئەگرن بەئاسمانەوەو دەنگ‌وباسی نهێنی خوایی وەرئەگرن ، واتــە ئەستێرە بکشێ ئەوە نیشانەی ئەوەیە کــە گوێ‌گرتن بە ئاسمانەوە نی‌یە ، هەروەك تەورات پەلکەزێڕینەیەك کــە لــە ســەرەتای جیهانەوە بووە - گێڕاوێتی بە نیشانە لەسەر ڕوونەدانی تۆفان جارێکی‌تر ، دوای تۆفــانی نووح •

ئنجا ئەو چــەند جنۆکەیە دەست‌ئەکەن بە باسی حاڵی خۆیان دوای بڕوا هێنانیان بەجۆرێك کــە تێ‌بــگەین کــە جنۆکەش وەك ئادەمیزاوان لەمەدا کە هەردوولا ئامادەن بۆ ڕێ‌نموونیش‌و گومراییش ، وە ئەڵێن :

١٠ - ( وانا منا الصالحون ) ئێمــە هێندیکمان باشین ، وە بۆ ڕەزای

وَمِنَّا دُونَ ذَلِكَ ، كُنَّا طَرَائِقَ قِدَدَاً(١١) وَأَنَّا ظَنَنَّا أَنْ لَنْ نُعْجِزَ اللهَ فِي الأَرْضِ ، وَلَنْ نُعْجِزَهُ هَرَبَاً ( ١٢ )

---

وە هێندیکمان لەوە نزمترین ، خاوەنی ڕێبازی زۆر بووین (١١) وە ئێمە ئەمانزانی کە هەرگیز دەرەقەتی خوا نایەین لە هەرلایەك بین لەزەویی ، وە لەژێر دەستی دەرناچین (١٢)

---

خوا ئیشئەکەین ( ومنا دون ذلك )و هێندێکمان لەوان نزمترین ( كنا طرائق قددا ) ئێمە جاران خاوەنی ڕێبازی زۆر بووین ، وە هەر دەستەیەکمان لەسەر بیروباوەڕێك بووین ، بەلام لەدوای ئەوەی کە قورئانمان بیستو بڕوامان پێ هێنا ، ئیتر هەوولئەدەین بۆ ڕێك خستنی خۆمان ، وە هەلگرتنی جیاوازیو دووبەرەکیی لەناومانا .

١١ ـ ( وانا ظننا ان لن نعجز الله في الارض ) ئێمە ئەمانزانی کە ناتوانین یاخیبین لە خوا بەڕەنگێك کە نەتوانێ سزامان بدات ( ولن نعجزه هربا )وە ناتوانین لە دەستی دەرچین بەجۆرێك کە نەتوانێ پێمان بگاتو بمانگرێتەوە ، بەلام لەم زانینە هیچ جۆرە بەهرەیەکمان وەرنەگرت ، وە نەیگێڕاینەوە لەو دووبەرەکییە کە تێیدابووین بڕوامان بە قورئان هێنا .

وَأَنَا لَمَّا سَمِعْنَا الْهُدَى آمَنَّا بِهِ ، فَمَنْ يُؤْمِنْ بِرَبِّهِ
وَأَنَّا مِنَّا الْمُسْلِمُونَ فَلا يَخافُ بَخْساً وَلا رَهَقاً (١٣)
وَمِنَّا الْقَاسِطُونَ ، فَمَنْ أَسْلَمَ فَأُولَئِكَ تَحَرَّوْا رَشَداً
( ١٤ )

وە ئێمە کاتێ کە ڕێنموونیی (قورئان) مان بیست بڕوامان پێهێنا ، ئنجا هەرکەسێك بڕوای هێنا بە پەروەردگاری خۆی ئیتر ناترسێ نە لە کەمیی (پاداش)و نە لە زۆریی (تۆڵە) (١٣) وە ئێمە هێندیکمان مسڵمانین‌و هێندێکمان ستەمکار ، ئنجا هەرکەسێك گەردن کەچیی کرد ، ئەوانەی ڕێی ڕاستیان گرت ( ١٤ )

١٢ ـ ( وانا لما سمعنا الهدى آمنا به ) ئێمە کاتێ کە ڕێنموونیی قورئانمان بیست بڕوامان پێهێنا ( فمن یؤمن بربه فلا یخاف بخساً ولا رهقا ) ئنجا هەرکەسێك بڕوای هێنا بە پەروەردگاری خۆی ، ئیتر ناترسێ نە لە کەمیی پاداش‌و نە لە زۆریی تۆڵەو سزا ، واتە شایستەی چەند بێ لە پاداش ئەیدرێتێ‌و لێی کەم ناکرێتەوە ، وە شایستەی چەند بێ لە تۆڵە زیاتری لێ ناسەندرێ .

١٣ ـ ( وانا منا المسلمون ومنا القاسطون ) ئێمە هێندێکمان مسڵمانین‌و هێندیکمان ستەمکار ( فمن اسلم ) ئنجا هەرکەسێك گەردن کەچیی کرد ، بەمڕەنگە بڕوای بە خواو بە پێغەمبەر هێنا ( فاولئك تحروا رشدا ) ئەوانە ڕێی ڕاستیان گرتووە کە بێگومان ئەیانگەیەنێ

وَأَمَّا الْقَاسِطُونَ فَكَانُوا لِجَهَنَّمَ حَطَبًا (١٥) وَأَنْ لَوِ اسْتَقَامُوا عَلَى الطَّرِيقَةِ لَأَسْقَيْنَاهُمْ مَاءً غَدَقًا (١٦)

وەلێ ستەمکاران بوون بە داری سووتەمەنی دۆزەخ (١٥) وە ئەگەر پایەدار بوونایە لەسەر ڕێی ڕاست ئاوی زۆرمان پێ ئەنۆشین (١٦)

بە بەهەشت ( واما القاسطون فكانوا لجهنم حطبا ) وەلێ گوناهکاران بوون بە داری سووتەمەنی دۆزەخ .

لەپاش گێڕانەوەی قسەی ئەو جنۆکانەی کە گوێیان لە دەنگی قورئان خوێندنی پێغەمبەر بوو لە نوێژاو مسڵمان بوون ، ئنجا باسی هێندێك لە باوی بڕواهێنانو ڕێی ڕاست گرتنمان بۆ ئەکات ، ئەفەرموێ ( وان لو استقاموا على الطريقة ) بڵێ سرووشم بۆ کراوە[١] کە ئەگەر دانیشتووانی مەککە پایەداربوونایە لەسەر ڕێی ڕاست ، ئەو ڕێیەی کە خوا لێی ڕازی‌یە لە گوفتارو کرداری باش ( لاسقيناهم ماء غدقا ) بارانی زۆرو بەکەڵکمان ئەڕژاند بەسەریانا ، واتە هەموو جۆرە پێبژیوێکمان بۆ ئەناردن ، وە هەموو نازو بەهرەو خۆشی‌یەکم بەسەرا ئەڕشتن .

بەڕاستی ئاو مایەی ژیانو سەرچاوەی هەموو پیت‌وفەڕێکە ، تا ئاو زۆرترو پاکتر بێ ، تەندروستی باشترو خۆشیی زۆرتر ئەبێ ، هیچ

(١) بەم تەفسیرە نیشان ئەدەین کە ئەم ئایەتە ئەگەڕێتەوە «عطف» بۆ سەر « انه استمع نفر من الجن » لە سەرەتای سوورەتەکەوە ، هەر بەم ڕەنگە ئایەتی دواییش .

شارێك لە شاران ئاوەدان نابێو پەرەناسێنێ ، تا لەسەر ڕووبارێکی گەورە نەبێ ، نەخوازەلا عەرەبستان کە ئاوی پاكو تەمیز تیایا لە هەووشت خۆشەویستترو بەنرخترە ، ئای کە جەنگ هەڵگیرسێنراوەو شەبەیخوون کراوەو پیاو کوژراوە لەسەر بیرێك یا قووڵکە ئاوێك !

بڕوا بە خواو بە دەستوورو باوی ، مەردوم ئەهێنێتەوە سەر نیش کردنو هەوڵو تەقەلادان ، لە کارێز لێدانو بیر هەڵکەندنو دەریاچە دروستکردنو ئاوڕاکێشانو باخنانو درەخت ناشتنو زەویی کێلان ، کە ئەمانەش بەپێی دەستوورو باوی خوا لە جیهانا هەورو باران ئەهێنن ، وە خێرو بێر ڕائەکێشن ، لەگەڵ ئەمیشە ئێمە کە مسڵمانین بڕوامان وایە تا گەل باشتر بێ ، وە بەپێی فەرموودەو فەرمانی خوا بڕوا بەڕێوە ، خواش زۆرتر پیتو بەرەکەت بە سەریانا ئەڕێژێ ، بەڵام ئەم پیتو بەرەکەتەش زۆر جار ئەگات بەئەندازەیەك کە خاوەنەکەی یاخی ، وە لە ڕێ دەرئەکات ، لەبەرئەوە دەوڵەمەندییو خۆشیی وەك هەژارییو ناخۆشیی تاقی کردنەوەی خوایە بۆ بەندەی خۆی ، هیوا هەیە بەهەردولا ، لە تاقیکردنەوە دەرئەچێ ، واتە نە لە هەژارییو ناخۆشییدا لە فەرموودەی خوا ئەچێتە دەرەوە ، وە نە لە دەوڵەمەندییو خۆشییدا ، هیوا هەیە لە هیچیانا دەرناچێ ، هیوا هەیە لە هەژارییو ناخوشیدا دەرئەچێ ، بەڵام لە دەوڵەمەندییو خۆشیدا دەرناچێ ، هیوا هەیە بەپێچەوانەی ئەمەیە .

بەڕاستی دەوڵەمەندیی ، دەستداریی ، جوانیی ، دەنگخۆشیی ، هێزو تەوانایی ، ناووشۆرەت ، هەمووی بۆ تاقیکردنەوەی بەندەیە ، ئەبێ مەردوم لەمکاتانەدا ئاگای لە خۆی بێ ، یاخینەبێ ، زۆرو ستەم

لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ، وَمَنْ يُعْرِضْ عَنْ ذِكْرِ رَبِّهِ يَسْلُكْهُ عَذَاباً صَعَداً (١٧)

تا تاقیان بکەینەوە تیایا ، وە هەرکەسێك ڕوو وەرگێڕێ لە یادی خوای خۆی ئەیخاتە ناو سزای سەختەوە (١٧)

نەکات ، لە چوارچێوەی ئاین دەرنەچێ ، وەکو ئەفەرموێ : ئەوانەی کە بەڕێی ڕاستا ئەڕۆن هەموو خۆشی‌یەکیان بەسەرا ئەڕێژین ( لنفتنهم فيه ) تا تاقی‌یان بکەینەوە لەو زیندەگانی‌یەدا ، واتە تێ‌یان‌بگەیەنین کە کامیان یاخی ئەبن‌و کامیشیان یاخی نابن ( ومن يعرض عن ذكر ربه ) وە هەرکەسێك لەوانەی کە خوا ماڵی دنیای بەسەرا ڕشتوون ، ڕوو وەرگێڕێ لە یادی پەروەردگاری خۆی ، واتە لە فەرموودەو فەرمانی بچێتەدەرەوە ، وە لە دەستوورو باوی دەرچێ ( يسلكه عذابا صعدا ) ئەیخاتە ناو سزای سەختەوە .

مەبەس لە یادی خوا هەر ناوبردنی نی‌یە بە زبان ، بەڵکو ناو بردنێتی بە کردەوەی باش‌و ئیشیی بەکەڵك .

ئێمە ئەگەر دەوری قورئان بکەینەوە ، وە ووردبینەوە لە مێژووی گەلان‌و بەسەرهاتی پێشینان ، تێ‌ئەگەین کە ئەم دەستوورە ، دەستوورێکی تێکڕایی‌یە ، وە پاش‌و پێشی نی‌یە ، هەر گەلێك یا هەر دەوڵەتێك کە سەرکەوت‌و بەرزبۆوە ، وە خوا لە هەموولایەکەوە ڕشتی بەسەریا ، ئنجا ئەگەر یاخی نەبوو ، وە دەستی لە ئیش‌و کار هەڵنەگرت ، وە لە

وَاَنَّ الْمَسَاجِدَ لِلّٰهِ فَلا تَدْعُوا مَعَ اللّٰهَ اَحَداً (١٨)

مزگەوتان بۆ خوان ، لەگەڵ خوادا بانگی کەسی‌تر مەکەن (١٨)

ڕێی ڕاستو دادپرسی لای‌نەدا ، ئەوا هەر لەو خۆشی‌یەدا ئەمێنێتەوە ، وە ئەگەر یاخی‌بوو ، وە دەستی لە ئیش‌و کار هەڵگرت ، وە نوقووم‌بوو لە کەیف‌و خۆشیی‌و ڕابواردنا ، وە دەستی‌کرد بە دەست درێژیی‌و زۆرو ستەم ، ئەوا بەرەبەرە ئەڕووخێ‌و لەناوئەچێ .

( وان المساجد لله ) بڵێ : سرووشم بۆ کرا ، کە مزگەوتان بۆ خوان ، پێویستە هەرخواپەرستی‌یان تیا بکرێ ، نە ئەبێ ڕەسم‌و بتیان تیا هەڵواسرێ ، وە نەکڕین‌و فرۆتن ، یا درومان‌و ئیش‌وکاریان تیا بکرێ ، یا پرسە «تعزیە»و کۆڕی قسەو گوفت‌وگۆیان تیا بگیرێ ، یا مردوویان تیا بنێژرێ ، لەبەرئەمە لە شەرعی ئیسلاما مزگەوت‌و تەبر کۆنابنەوە ، واتە کامیان بەسەر کامیانا چووبێ ، ئەبێ بڕوخێنرێ (فلا تدعوا مع الله احدا ) لەگەڵ پەرستنی خوادا کەسی تری تیا مەپەرستن‌و هاواری لێ مەکەن ، چونکە هەر خوایە کە بتوانێ بەدەنگ بەندەگانی خۆیەوە بێ ، کەسی‌تر ناتوانێ بەدەنگ کەسەوە بچێ ، وەك لە سوورەی « فاطر »دا ئەفەرموێ « والذین تدعون من دونه ما یملکون من قطمیر . ان تدعوهم لا یسمعوا دعاءکم ، ولو سمعوا ما استجابوا لکم »[1]

(١) واتە ئەوانەی کە بانگیان لێ ئەکەن بێجگە لە خوا هیچیان بەدەست نی‌یە . ئەگەر بانگیان بکەن دەنگتان نابیەن ، وە ئەگەر بشلێن گوێ‌یان لێ‌یە ناتوانن بەدەنگتانەوە بێن .

وَاَنَّهُ لَمَّا قَامَ عَبْدُاللهِ يَدْعُوهُ ، كَادُوا يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَداً (١٩) قُلْ : اِنَّمَا اَدْعُوا رَبِّي ، وَلا اُشْرِكُ بِهِ اَحَداً ( ٢٠ ) قُلْ : انّي لا اَمْلِكُ لَكُمْ ضَرّاً وَلا رَشَداً (٢١)

---

وە بەندەی خوا (محمد) کە هەستا بانگی خوا بکات (و بی‌پەرستێ) (بێ بڕواکانی مەککە) نزیك‌بوو دابارن بەسەریا (١٩) بڵێ : من هەر خوای خۆم ئەپەرستم ، وە کەس ناکەم بە هاوبەشی (٢٠) بڵێ بەڕاستی من هیچم بەدەست نی‌یە بۆ ئێوە ، نە زیان (و قازانج ، نە گومڕایی)و نە گەیاندنتان بە ڕێی ڕاست (٢١)

---

( وانه لما قام عبدالله یدعوه ) وە بڵێ : سرووشم بۆ کرا کە بەندەی خوا محمدی کوڕی عبدالله کە هەستا بانگی خوابکات‌و بی‌پەرستێ ، بێ‌بڕواکانی مەککە داباریین بەسەریا بەجۆرێك (کادوا) یکونون علیه لبدا ) نزیك بوو کە کەڵەکە ببەستن لەسەری بەڕەنگێك کە بنووسێن بەیەکەوە ، وە بچەسپێنە سەر یەك ، وەك مووی لبادی سووراوە .

ئنجا خوا فەرمانی پێ‌ئەدا کە پێیان‌بڵێ : من شتێکی خراپم بۆ نەهێناوون کە بەم‌جۆرە کەڵەکەم لەسەر بکەن‌و ڕووم لێ وەرگێڕن ئەفەرموێ (قل انما ادعو ربی) بڵێ : من تەنها خوای خۆم ئەپەرستم ( ولا اشرك به احدا )وە کەس ناکەم بە هاوبەشی ، هەروەك فەرمانی پێ‌ئەداو ئەفەرموێ (قل) بڵێ ئەی محمد بە بێ‌بڕواکانی مەککە ( اني لا املك لكم ضرا ولا رشدا ) بەڕاستی من هیچم بەدەست نی‌یە بۆ ئێوە کە

قُلْ اِنّی لَن یُجیرَنی مِنَ اللهِ اَحَدٌ ، وَلَنْ اَجِـد مِنْ دُونِهِ مُلْتَحَداً (٢٢)

بڵێ : بێ گومان کەسێك نی یە کە من بپارێزێ لە (سزای) خوا ، وە بێجگە لەوی ، پەنایەك شك نابەم (٢٢)

پێتان بکەیەنم ، نە زیانو نە قازانج ، هەروەك بەدەستم نی یە بۆ ئێـوە نەگومڕایی و نەگـەیاندنتان بەڕێی ڕاست ، بەڵـکو ئەمـانە هـەمووی بەدەست خوایە ، وە مـن یەکێـکم وەك ئێـوە ، بەڵام خـوا ناردوومی بۆئەوەی کـە سـرووشی ئەوتان پێ بـگەیەنم ، وە ئـەو ڕێـگایەتان نیشان بدەم کـە ئەتان گەیەنێ بە خوا ، بەڵـکو (قل) پێیان بڵێ : ئـەی محمـد ، سـەرەڕای قسەکـانی پێشوو (انی) من لەگـەڵ ئەوەی کـە پێغەمبەرێـکم لەلایەن خواوە بۆسەر ئادەمیی ، ئەگەر گوناهێك بـکەم یا سستی یەك بنوێنم لــە کاروباری خـوادا (لن یجیرنی من الله احـد) کەسێك نی یە کـە بمپارێزێ لـە سزای خـوا ( ولن اجـد مـن دونـه ملتحدا ) وە ئەگەر بمەوێ هەڕا بکەم لە سزای ئەو پەنایەك شك نابەم بێجگە لە خوا کە پەنای بۆ بەرم .

لەلایەك پێغەمبەری ئیسلامو دواترینی پێغەمبەران حەزرەتی محمـد «درووودی خوای لێ بێ» ئەگـەر گوناهێك بـکات ، یا سستی یەك بنوێنێ لـە پێویستانی پێغەمبەرێتی خوا بەسەریەوە ناڕوات ، وە تۆڵەی لێ بسێنێ ، ئەبێ یەکێـکی تر چۆن بێ ئەگـەر گوناحو دەستدرێژیی بکات ، یا گوێ بۆ فەرموودەو فەرمانی خوا نەگرێ .

اِلاّ بَلاغاً مِنَ اللهِ وَرِسالاتِهِ ، وَمَنْ يَعْصِ اللهَ وَرَسُولَهُ ، فَاِنَّ لَهُ نارَ جَهَنَّمَ خالِدِينَ فيها اَبَداً ( ٢٣ )

( وە هیچم بەدەست نی‌یە ) مەگـــەر ڕاگـــەیاندن نەبێ لـــە خواوەو فەرموودەکانی ئەو نەبێ ، هەرکەسێك بێفەرمانیی خواو پێغەمبەر بکات ، بێ‌گومان ئاگری دۆزەخ بۆئەوە ، تیا ئەمێنێتەوە بە تێجگاریی (٢٣)

ئائێستا فەرمووی کـە پێغەمبەر هیچی بەدەست نی‌یە ، وە ناتوانێ هیچ سوودو زیانێك بە کەس بـگەیەنێ ، ئنجا ئەفەرموێ مەگـەر ئاقـە شتێك نەبێ بەدەستێتی کـە ئەویش ڕاگەیاندنی فەرموودەی خوایە بـە بەندەگـان ، وەکو ئەفەرموێ ( الا بلاغا من الله ) مەگـەر گـەیاندنی سرووشێك نەبێ ، کـە بۆم دێ لەخواوە ( ورسـالاته ) وە فەرموودەو فەرمانەکانی ئـەو نەبێ ، کـە بە سرووش بۆم دێ ، ئنجا هەرکەسێك گوێی بۆ بـگرێو کـاری پێبـکات بەهەشت بۆ ئەوە ، تیا ئەبێ بـە تێجگاریی ( ومن یعص الله ورسوله ) وە هەرکەسێك بێفەرمانیی خواو پێغەمبـەر بـکات ( فان له نار جهنم ) بێ‌گومان ئاگری دۆزەخ بوئـەوە ( خالدین فیها ابدا ) تیا ئەمێنێتەوە بەتێجگاریی ، بەڵام ئەم بێ‌بڕوایانی

حَتّی اِذا رَأَوْا مـا یُوعَدُونَ ، فَسَیَعْلَمُونَ مَنْ اَضْعَفُ ناصِراً ، وَأَقَلُّ عَدَداً ( ٢٤ ) ،

( ئەم بێبڕوایانە لەسەر بێبڕوایی‌یەکەیان ئەمێننەوە ) تا ئەو سزایەی کە بەڵێنیان پێدراوە ئەی‌بینن ، ئنجا ئەوکاتە تێ‌ئەگەن کـە کێ یارمـەتی دەری کەمترو زەبوونترە (٢٤)

قورەیشە لەسەر بێبڕوایی خۆیان ئەمێننەوە ( حتی اذا رأوا ما یوعدون) تا بە چـاوی خـۆیان ئەبینن ئـەو سزایانەی کـە بەڵێنیان پێدراوە ( فسیعلمون ) ئنجا ئەوکاتە تێ‌ئەگەن ( من اضعف ناصرا ) کـە تۆو ئەوان کامتان یارمەتی‌دەرتان زەبوونتر ( واقل عـددا ) وە لەشـکرتان کەمترە ، واتە ئەوکاتەی کـە بە چاوی خۆیان تۆڵەیان‌دیی ، تێ ئەگەن ئایا ئەوان بەدەسەڵات‌ترن یا پێغەمبەر ، وە ئەوان لەشکریان زۆرترە یا پێغەمبەر ، دیارە پێغەمبەر بەهێزترە ، چونکە یاریدەدەرەکەی خوایە ، وە ئەو لەشکری زۆرترە ، چونکە لەشکری ئەو فریشتەو مسڵمانانی بە ڕاستین •

ئنجا لەبەرئەوەی ئەگونجێ لێرەدا یەکێك بڵێ ئەم سزای ڕۆژی

قُلْ : إِنْ أَدْرِي : أَقَرِيبٌ مَا تُوعَدُونَ ، أَمْ يَجْعَلُ لَهُ رَبِّي أَمَداً ؟ ( ٢٥ ) عَالِمُ الْغَيْبِ فَلا يُظْهِرُ عَلَى غَيْبِهِ أَحَداً ( ٢٦ ) إِلاَّ مَنِ ارْتَضَى مِنْ رَسُولٍ ،

---

بڵێ : من نازانم ئایا نزیکە ئەو ڕۆژی دوایی‌یەی کە بەڵێنتان پێ دراوە ، یا پەروەردگارم ماوەیەکی دووری بۆ داناوە ؟ (٢٥) هەر خوایە ئاگادار بە نهێنی ، وە کەس ئاگادار ناکا بەسەر نهێنی خۆیا (٢٦) مەگەر پێغەمبەرێکی هەڵبژێرراو ،

---

دوایی‌یە کەی ئەبێت ؟ فەرمووی (قل) پێیان‌بڵێ ئەی محمد ( ان أدری ) من نازانم ( أقریب ما توعدون ) ئایا نزیکە ئەو بەڵێنەی کە پێتان‌دراوە ( أم یجعل له ربی امدا ) یا خوای من ماوەیەکی دووری بۆ داناوە ، واتە نازانم زوو ئەبێ یا درەنگ ئەبێ .

ئنجا خوا بە خۆی ئەفەرموێ ( عالم الغیب ) هەر خوایە ئاگادار بەنهێنی ( فلا یظهر علی غیبه احدا ) کەس ئاگادار ناکات بەسەر نهێنی خۆیا ( الا من ارتضی من رسول ) مەگەر پێغەمبەرێك کە خوا هەڵی‌بژاردبێ بۆ ناردنی سرووشی خۆی بە دەستوورو ئایینێك کە بی‌گەیەنێ بە بەندەکانی خوا ، لەم‌کاتەدا سرووشەکەو هاتنی فریشتەو سەرباسی ئەو سرووشە هەمووی نهێنی‌و نادیارن ، وە کەس نابێ بیانزانێ تا پێغەمبەر بڵاوی ئەکاتەوە ، وەك لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێ « ولا

فَإِنَّهُ يَسْلُكُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ رَصَدًا (٢٧)

بێ گومان خوا ئەنێرێ لە بەردەمی‌و لە پشتی‌یەوە ، ئاگادار (٢٧)

يحيطون بشيء من علمه الا بما شاء »[١] .

( فانه يسلك من بين يديه ومن خلفه رصدا ) ئەوسا بێ گومان خوا ئەنێرێ‌و بڵاوئەکاتەوە لە بەردەمی ئەو پێغەمبەرە ، وە لە دەورو پشتی ، ئاگادارو پاسەوان لە فریشتە ، تا ئاگاداری بکەن لەبیرچوونەوەو تێك‌چوون‌و تێك‌دانی ئەو سرووشە بەرێی ئارەزووی پێغەمبەرەکە ، واتە خوا کە پێغەمبەرێکی نارد ، یەکێکی وا هەڵئەبژێرێ کە بتوانێ ئەم بارە گرانە هەڵگرێ بەتەواویی ، وەك لە ئایەتێکی‌ترا ئەفەرموێ « الله اعلم حيث يجعل رسالته/٦/٢٤ »[٢] بەم‌رەنگە ئەبێ زۆر دەست‌پاك‌و دڵپاك‌و زیرەك‌و بەبیربێ بەجۆرێکی‌وا ئەگەر سرووشێکی دوورودرێژی بۆ هات لێی تێك نەچێ ، وە پاش‌و پێشی نەخات ، وە ئارەزووی خۆی تێکەڵ نەکات ، چونکە زۆر رێ ئەکەوێ کە سرووشەکە سەرکۆنەی پێغەمبەرەکە ئەکات ، کە ئەم رەوشتەش ناوبراوە لە علمی عقائدا بە « عصمة وامانة » ئنجا ئەم ئایەتە بریتی‌یە

(١) واتە کەس ناسوورێتەوە بە گردی زانیینی خوادا مەگەر بە شتێك کە خۆی بی‌یەوێ (بە سرووش بی‌نێرێ بۆ پێغەمبەرێك ) .
(٢) واتە خوا داناترە بەوجێ‌یەی کە پێغەمبەریەتی خۆی تیا دائەنێ .

لِيَعْلَمَ أَنْ قَدْ أَبْلَغُوا رِسَالَاتِ رَبِّهِمْ ، وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيْهِمْ ، وَأَحْصَى كُلَّ شَيْءٍ عَدَداً (٢٨)

---

تا بزانێ کە سرووشی خوای خۆیان گەیاندووە ، وە خوا ئاگادارە بەوەی کە لەلایانە وە هەموو شتێکی هەڵژماردووە بە هەڵژماردن (٢٨)

---

لەمەی کە ووتمان ، ئەمەش کە خوا ئەیکات ( لیعلم ان قد ابلغوا رسالات ربهم ) بۆئەوەیە کە خواستەکەی خوا بێتەدیی ، وەك ڕاگەیاندنی نامەکانی خوا بێ ، وە زانینی کۆن « علمی قدیم »ی خوا پەیوەستی پەیدا بکات لەگەڵ ئەو ڕاگەیاندنەدا بەئاشکرا ، وە نمایان بێ بۆ مەردوم کە سرووشەکانی خوای خۆیان گەیاندووە ، ئەگینا خوا لە ئەزەلدا ئاگادارە بەمانە ، وەکوئەفەرموێ ( واحاط بما لدیهم ) خوا ئاگادارە بەوەی کە لەلای فریشتەی سرووشیش‌و پێغەمبەرانیشە ، بەڵکو لەمەش زیاتر وەکو ئەفەرموێ ( واحصی کل شیء عددا ) وە هەموو شتێکی هەڵژماردووە بە هەڵژماردن لە ئاسمان‌و زەوییدا ٠

# سوورەی ( مزمل )ە

**مەککی‌یە ، ٢٠ ئایەتە ، ١٩٩ ووتەیە ، ٨٣٨ پییتە**

## بسم الله الرحمن الرحيم

**بە ناوی خـوای بەخشندەی میهرەبان**

کاتێك کە خوا پێغەمبەری ئامادەکرد لە تەمەنی چل ساڵیدا بۆئەوەی بیـکا بە پێغەمبەرو سرووشی بۆ بنێرێ ، فریشتەی سرووشی نارد بۆلای لـە ئەشکەوتی «حراء» لەکاتێـکا کـە بە دڵ بێدارو بەچـاو نوستبوو ، وە ئایەتی « اقرأ باسم ربك الذی خلق ، خلق الانسان من علق ، اقرأ وربك الاکرم • الذی علم بالقلم • علم الانسان ما لم یعلم »[1]ی بە سرووش بۆ نارد ، پێغەمبـەر لەترسانا بەدەم لەرزەوە چووەوە بۆ ماڵەوەو فەرمووی «زملونی» واتە دامپۆشن[2] ، دوای ئەوە سـەرەتای سوورەی «قەڵەم»ی

---

(١) واتە بخوێنە بە ناوی پەروەردگارێکتەوە کە هەموو شتی دروست کـردووە لـە خوێن‌پـارە • بخـوێنە هـەر پەروەردگاری تـۆیە بەخشندەیەکی بێ‌پایانی‌وا کە ئادەمیی فێری نووسیین کردووە بەهۆی قەڵەمەوە • ئادەمیی زانا کردووە بەوشتانەی کە نەی‌ئەزانی •

(٢) ئەم ترس‌و لەرزی پێغەمبەرە لە یەکەم جاری سرووش بۆ هاتنیا ، وەك ترس‌و لەرزێك وایە کـە لـە باپیرە گەورەی خۆی ابراهیم

بۆ هات ، دوای ئەوە بەلای زۆر لە تەفسیرنووسەکانەوە سەرەتای سوورەی «مزمل» هات ، ئنجا سەرەتای سوورەی «مدثر» . بەلام سید قطب لە تەفسیری في ظلال القراندا ئەفەرموێ : بەڵام قورئان خۆی وا ئەگەیەنێ کە سەرەتای سوورەی «مدثر» زۆر لەپێش سوورەی «مزمل»ەوە هاتووە ، کە ئەمەش ئەبێ وابێ چونکە خوا بە سەرەتای سوورەی «علق» تەنیا پێغەمبەری بێدارکردەوە بۆ پێویستێکی تێجگار گەورە کە پێویستی پێغەمبەریەتی‌یە ، بە سرووشی دووهەم ـ کە سەرەتای سوورەی «قەلەم»ە قسەی بێ‌بڕواکانی مەککەی بەدرۆخستەوە کە وتیان محمد شێت بووە ، ئەبێ لە سرووشی سێهەمدا بەسەرەتای سوورەی « مدثر » پێغەمبەر تێبگەیەنێ کە تۆ پێغەمبەری خوایت وە پێویستانی پێغەمبەرێتی پێ‌بڵێ ، وە ئەو حەوت ئامۆژگاری‌یە لە ئایەتی «قم فانذر»ەوە تا ئایەتی «ولربك فاصبر» بدا بە گوێچکەی پێغەمبەرا ، دوای ئەوە دەرگای سرووش داخرا تا دوو ساڵونیو ئنجا سەرەتای

---

پێغەمبەر نیشتووە لەکاتێکا کە یەکەمجار سرووشی بۆ هاتووە ، دکتۆر پۆست لە تەرجەمەی ابراهیمی خلیل لە فەرهەنگی کتێبی مقدسدا ئەڵێ : « ابراهیمی خەلیل لە تەمەنی نەوەدونۆ ساڵیدا خوای بۆ دەرکەوت بەجۆرێکی زۆر سەیر ، کە ترساو بێهۆش‌کەوت ، لە نزیبك نیوەڕۆدا خەوێکی پڕ لە ترسی لێکەوت ، لەو خەوەدا سرووشی بۆ کرا بە هێندێك شتی زۆر بەنرخ لەبابەت پاشەڕۆژی خۆی‌و نەوەی دوای خۆی » هەتەد .

ســـوورەی «مزمل»ی بۆ هـاتو دەرگـــای سرووش کرایەوە ، وە بەیدەرپەی ئایەت ئەهـاتە خوارەوە ، وەك دەرئەکەوێ لە ئایەتی « انا سنلقی علیك قولا ثقیلا » لەم سوورەتەدا ، هەروەك ئەبوو پێغەمبەر خۆی ئامـــادە بـکات بۆ لەبەرکردنی ئـەو ئایەتانەو دەوورکردنەوەیان لـە نوێژانی شـەویا ، وەك دەرئەکەوێ لـە ئایەتی « ورتل القرآن ترتیلا » هـەر لـەم سوورەتەدا ، هەروەك ئەبوو پێغەمبەر « دروودی خوای لێ بێ » بـکەوێتە هاتوچۆو گـەڕانو خەڵق ببینێو قسەکردن لەگـەڵیانا بۆ سڵمان بوونیان ، وەك دەرئەکەوێ لە ئایەتی « وان لك فی النهـار سبحا طویلا » هـەر لەم سوورەتەدا ، جگە لەوە کە لەم ڕێـگایەدا پێغەمبـەر تووشی هەزاران تەنـگانەو دەردیسەریی‌و مەردومی لاسارو سەهندەو بێشەرم ئەبێ کـە قسەی ڕەقی لەگەڵ ئەکـەن ، وە ئەبێ دان بەخۆیا بـگرێو لێڵ نەبێ وەك خوا فەرمانی پێئەدا لـەم سوورەتەدا بە ئایەتی « واصبر علی مـا یقولون واهجرهم هجـــرا جمیـلا » بەمڕەنـگە وە بەمسوورەتە پێغەمبەر ئامـادە ئەکات بۆ هەڵـگرتنی باری پێغەمبەریەتی ، وە بۆ وەرگرتنی قورئانو لەبیرنەچوونەوەی ، واتـە دوای سرووشی یەکـەمو دوهـەم قورئان ئەوەندە نەهـاتۆتە خوارەوە کـە پێغەمبـەرو هاوڕێـکانی لـە نیوەشەوەوە هەستن بۆ دەوورکردنەوەی ، کەواتە ئەبێ سوورەی «مزمل» کاتێك هاتبێتە خوارەوە کـە دەرگای سرووش لـــە پێغەمبـەر کرابێتەوە ، کـە ئەویش دوای دووسـاڵو نیو بووە ، لـــە

# سورة المزمـل

## بسم الله الرحمن الرحيم

يَا أيُّهَا الْمُزَّمِّلُ (١) قُمِ اللَّيْلَ ، إلاَّ قَلِيلاً : (٢) نِصْفَهُ ،
أوِ انْقُصْ مِنْهُ قَلِيلاً (٣)

---

# سوورەی ( مزمل )ە

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەی ئەوکەسەی کە خۆت پێچاوەتەوە (١) شەو هەستە ، مەگەر کەمێکی(٢)
نیوە بێ ، یا تۆزێ لە نیوە کەمتر (٣)

---

یەکـــەم سرووشەوە فەرمووی ( یا ایهـا المزمل ) ئـەی ئەوکەســەی کـەوا خۆت داپۆشیوە ، وەك بتـەوێ خۆت بشاریتەوە ، وە لەدەست جێبەجێ کردنی سپاردەیەکی زۆر گـەورە خۆت ڕزگار بـکەیت ( قم اللیل الا قلیلا) شەو هەستە بۆ شەونوێژو دەورکردنەوەی قورئان مەگەر کەمێکی نەبێ ، واتە هـــەمووی هـەڵمەستە ، ئنجـــا باسی مـــاوەی خواپەرستی‌یەکە ئەکات کە ئەبێ لە سێ‌یەکی شەو کەمتر ، وە لە دوو بەش لـە سێ بەشی زیاتر نەبێ ، ئەفـەرموێ بەشی خواپەرستی‌یەکەت ( نصفه ) نیوەی شەو بێ لەکاتێـکا کـە شەووڕۆژ بەقـەد یەك بن ( او انقص منه قلیلا ) یا کەمێك لە نیوەکەی کەمبکەرەوە تا ئەبێ بە سێ‌یەکی شـەو لەکاتێکا کـە شەوگار کورت بێ ، وە لەمە نابێ کەمتر بێ نەوەك

أَوْ زِدْ عَلَيْهِ ، وَرَتِّلِ الْقُرْآنَ تَرْتِيلاً (٤)

يا تۆزێ زیاتر ، وە بەئاهیستە دەوری قورئان بکەرەوە (٤)

جەستەو گیانت بەهرەی لێ وەرنەگرێ ( او زد علیه ) یا لــە نیوەی شــەو زیاتری بــکە تا نزیك ئەکەویتەوە لە دوو بەش لە سێ بەشی شەو لەکاتێکا کە شەوگار درێژ بێ ، وە لەمــە زیاتر نەبێ نەوەك نەتوانیت‌و زەبوونت بــکات بە ڕەنگێك کــە یارای هەڵــگرتنی باری پێغەمبەرییەتییت نەمێنێ ( ورتل القرآن ترتیلا ) وە دەوری قورئان بکەرەوە بەووردیی ، وە بەئاهیستەو لەسەرخۆ ، تا بچێتــە دڵتــەوە ، وە هیچت لێ وون نــەبێ • ئاشکرایە کە ساڵ چوار وەرزە ، دەمێ شەوگار درێژو ، دەمێ ڕۆژگار ، دەمێکیش شەووڕۆژ بەرابەرن ، ئنجــا بەمپێیە هــەستان بۆ شــەو نوێژ ئەگۆڕا لە سێیەکی شەوەوە بۆ نیوەی‌و بۆ دوو بەش لە سێ بەشی •

بەڵێ پێغەمبەر لەپێشەوە زۆر بە جەختێ ئەم فەرمانەی گرتەبەر ، وە هاوڕێــکانیشی چاویان لــەو ئەکرد ، وە ئەوەندە لە نوێژا ئەوێستان تا قاچیان ئاوسا ، ئنجا سرووش هاتەخوارەوە بۆ پێغەمبەر فەرمووی (طه ، ما انزلنا علیك القرآن لتشقی ، الا تذکرة لمن یخشی)(١) دوای ئــەوە نیتر هەمووشەوێك یانزە ڕکات نوێژی وەتری‌ئەکرد لــە بەشی دوایی شەوا ،

(١) واتە ئەی پێغەمبەر ئێمە قورئانمان بۆ نەناردوویت کــە تۆ خۆت بخەیتــە ئازارەوە : تەنها بۆئەوەمــان ناردووە کــە مەردومی پێ بێدار بــکەیتەوە •

اِنَّا سَنُلْقِی عَلَیْکَ قَولاً ثَقِیلاً (٥)

ئێمە لەمەولا بۆت ئەنێرینە خوارەوە فەرموودەی قورس‌و گران (٥)

وە بە یەك دووسەعات تەواوی ئەکرد ، وە قورئانی زۆری تیا ئەخوێند بەهێواشی ، وە بە بێ‌نقام ، بەڕەنگێك ئەگەر یەكێك لەودیو دەرگاوە گوێی لێ بگرتایە گوێ‌ی لە قورئان خوێندنەکەی ئەبوو .

مەبەس لـەم فەرمانی خوایە ، بە هەستانی شەوو دەورکردنەوەی قورئان ، بەهێزکردنەوەی گیانی وەرزش‌و دارشتنی جەستەی پێغەمبەرو ئومەتەکەیەتی ، لـە قاڵبێـکی قایمی‌و بەهێزیی‌و توندو تۆڵیی‌دا ، بە ڕەنگێك کـە جەستەو گیانیان بەهێز بێ ، وە بتوانن لەبەر باری ڕۆزگارا بوێستن ، ئێمـە ئەگـەر ووردبینەوە تێ‌ئەگەین هەرچی پێویستانی ئاینی هـەیە ، لە نوێژو ڕۆژوو دەست‌نوێژ شتن‌و مەلەکردن بە ئاوی ساردو چوون بۆ حەج‌و سووڕانەوە بە دەوری کعبەو هاتوچۆ لەبەینی « صفا »و «مروه»دا هەمووی بۆ پەروەردەکردنی گیان‌و لەش‌و بەهێزکردنیانە .

لەپاش ئەوەی کـە خوا فەرمانی دا بە پێغەمبەر بەدەست هەڵگرتن لە نوستن‌و ڕاپەڕین بۆ شەونوێژو دەوورکردنەوەی قورئان‌و ووردبوونەوە لە ئایەتەکانی ، ئنجا باسی هۆی ئەمانەمان بۆ ئەکات ئەفەرمووێ ( انا سنلقی علیك قولا ثقیلا ) ئێمە لەمـەولا بۆت ئەنێرینە خـوارەوە فـەرموودەی قورس‌و گران ، واتە ئایەتانی قورئان تا بڵاوی بکەیتەوە بەناو مەردومـا ، وە ئیشێکی‌وا بـکەیت کە مەردوم دەست‌هەڵگرن لە هەموو بیروباوەڕێکی پووچی باوو باپیرانی کۆنیان ، وە لە چوارچێوەی ئـەم ئاینە تازەیە

إِنَّ نَاشِئَةَ اللَّيْلِ هِيَ أَشَدُّ وَطْئًا وَأَقْوَمُ قِيلًا ( ٦ )

بەڕاستی هەستانی شەو دوای خەو قورسترە لە ڕووی کردارو باشترە لە ڕووی گوفتارەوە (٦)

نەچنە دەرەوە ، کـە ئەمەش زۆر گرانە ، وە ڕێـگایەکی زۆر دوورو درێژو سەختە ، تۆ چۆن ئەتوانیت ئەم بارە قورس‌و گرانە هەڵگریت ، بەم ڕەنـگە کــە لە ماڵەوە خۆت بشاریتەوە ؟ بۆئەوەی کــە داوێن هەڵکەیت لـە خواپەرستی‌و دەورکردنەوەی قورئان‌و ووردبوونەوە لـە سرووشی ئاسمان ، کـەواتە بە شـەو هەستە ، وە بەشی زۆری بێـدار بە ، وە ئەو سرووشانەی کـە بۆت دێن بە شـەو دەوریان بـکەرەوەو لێیان وورد بـەرەوە ، بۆئەوەی لەگـەڵ بیروباوەڕتا تێـکەڵ بین ، وە ڕێی ژیانت بۆ ڕوون‌بکەنەوە •

وەك لێرەدا یەکێك بڵێ : ئاخۆ ، شـەو هەستان‌و خەریك‌بوون بە نوێژو دەورکردنەوەی قورئانەوە یارمـەتی پێغەمبـەر بدات لەسـەر هەڵـگرتنی باری پێغەمبەرێتی ، ئنجـا لـە وەڵامـا ئەفەرموێ ( ان ناشئة اللیل ) هەستانی شـەو دوای خـەو بۆ خواپەرستیی ( هی اشـد وطئا ) قورسترو گرانترە لـە هی ڕۆژ ، هەروەك دەورکردنەوەی قورئان لـە شـەوا باشتر ئەچێتە دڵەوە لـە هـی ڕۆژ ، وە زووتر لەبەرئـەکرێ ، وەکو ئەفەرموێ ( واقوم قیلا ) دروستترە لە ڕووی وتنەوەوە ، واتــە هـەستان لـە شـەوا بۆ شەونوێژو خواپەرستیی باشترین وەرزشـە بۆ ئـەندام ، وە دەوور کردنەوەی قورئانەکـەشی مـایەی قورس بەستنێتی لــە دڵا •

اِنَّ لَكَ فِي النَّهَارِ سَبحاً طَوِيلاً ( ٧ ) وَاذكُرِ اسمَ رَبِّكَ ، وَتَبَتَّل اِلَيهِ تَبتِيلاً ( ٨ ) رَبُّ المَشرِقِ وَالمَغرِبِ ، لا اِلَهَ اِلا هُوَ ،

بەڕاستی تۆ لە ڕۆژدا زۆر هاتوچۆ ئەکەیت (٧) هەمیشە ناوی پەروەردگارت بەرە ، وە خۆت بپچڕەرەوە ( لە هەموو شتێك ) بەپچڕینەوەیەکی تەواو (٨) ( چونکە هەر ئەوە ) خوای ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوا ، هیچ خوایەکی بەڕاستی نی‌یە تەنیا ئەو نەبێ ،

دووبارە هۆیەکی‌تر باس ئەکات بۆ هەستانی شەوو دەورکردنەوەی قورئان لە شەوا ، ئەفەرموێ ( ان لك في النهار سبحا طويلا ) بەڕاستی تۆ لە ڕۆژدا لە هاتوچۆکردنێکی دوورو درێژایت ، بۆ بینینی مەردومو بانگ‌کردنیان بۆ مسڵمان بوون‌و کێشەکردن لەگەڵیانا ، واتە لەبەرئەوەی بە ڕۆژ وەختی دەورکردنەوەی قورئانت نی‌یە ، بە شەو هەستە بۆ شەونوێژ ، وە هەموو شەوێك لە نوێژەکانتا تا ئەتوانیت دەوری قورئان بکەرەوە بە هۆش‌و گۆشەوە ( واذكر اسم ربك ) وە ناوی پەروەردگاری خۆت بەرە لە هەموو شوێنێك ، وە باسی سیفەتەکانی بکە بۆ مەردومو پێیان ڕابگەیەنە ( وتبتل اليه تبتيلا ) وە خۆت لە هەموولایەك بپچڕەرەوە بۆ ڕووکردنە خوا بە پچڕینەوەیەکی تەواو ، چونکە هەر ئەوە ( رب المشرق والمغرب ) خوای ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوا ، وە پەروەردگاری بوونەوەر لەم‌بەری تا ئەوبەری ( لا اله الا هو ) هیچ خوایەکی بەڕاستی

فَاتَّخِذْهُ وَكِيلاً (٩) وَاصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُونَ ، وَاهْجُرْهُمْ هَجْراً جَمِيلاً (١٠)

کەوابوو بیکە بە بریکاری خۆت (٩) دان‌بەخۆتا بگرە لەسەر ئەو قسانەی کە ئەیکەن ، وە دەستیان لێ هەڵگرە بە دەست هەڵگرتنێکی جوان (١٠)

نی‌یە تەنیا ئەو نەبێ ( فاتخذه وكيلا ) کەوابوو بیکە بە بریکارو کارسازی خۆت ، واتە لە هەمووکارێکا هەر پشت بەو ببەستە .

لەم ئایەتانی پێشووەوە زانرا کە خوا ڕێ‌نموونیی پێغەمبەری کرد ، بۆ شەونوێژو دەورکردنەوەی قورئان لە شەوا ، وە بۆ هەڵسووڕان‌و هەوڵ‌و تەقەلا دان بۆ بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلام لەڕۆژا ، دیارە لە هەڵسووڕانی ڕۆژیا زۆر کەس بەهەڵستی ئەوێستن ، وە قسەکانی ئەبەنە دواوە ، وە چاووڕاوی دەربارە ئەکەن ، وە قسەی ناشرین لەڕوویا ئەکەن ، وە ئازارو سزای ئەدەن ، نەخوازەلا کە پێغەمبەریش بێ‌پشتیوان بووە ، وە بێ‌بڕوایانی مەککە زۆر دەوڵەمەندو دەست‌دارو بەفیزو دەعیەو دەمار بوون ، بەڵام خوا ئامۆژگاری پێغەمبەر ئەکات کە دان بەخۆیا بگرێ‌و گوێیان نەداتێ ، ئەفەرموێ ( واصبر على ما يقولون ) دان‌بەخۆتا بگرە لەسەر ئەو قسانەی کە ئەیکەن ( واهجرهم هجرا جميلا ) وە دەستیان لێ هەڵگرە بەدەست هەڵگرتنێکی جوان ، واتە ئەوان هەزار قسەی ناشرین بکەن تۆ لە ئامۆژگاریی خۆت زیاتر هیچی‌تر مەڵێ ، تووڕە مەبە ، قسە مەکە ، تا بەهێز ئەبیت ، ئەوکاتە هەرچی هات بەگژتا بجۆرەوە بەگژیا ، یا هەرچی لە بەردەمی ئاینەکەتا

وَذَرْنِی وَالْمُکَذِّبِینَ أُولِی النَّعْمَةِ وَمَهِّلْهُمْ قَلِیلاً ( ١١ ) اِنَّ لَدَیْنا اَنْکالاً وَجَحِیماً ( ١٢ ) وَطَعاماً ذا غُصَّةٍ ، وَعَذاباً اَلِیماً ( ١٣ )

---

وازبێنە لە منو ئەو خاوەن نازو نیعمەتانەی کە ئایینی من بەدرۆ ئەزانن ، وە کەمێك مۆڵەتیان بدە (١١) بێگومـان لای ئێمـە هەیە پێوەندەهای قورسو گران ، وە ئاگری هەڵگیرساو (١٢) وە خواردنی گەروگیرو سزای پڕلە ئازار (١٣)

---

ویستا لێی دەو بیرووخێنە ، بەڵام ئێستا وازیان لێبێنەو بۆمنیان بەجێبێڵە ، ئنجا لەسەر ئاهەنـگی گوفتوگۆی ئادەمیی و شێوەی هەڕەشەکردنیان خوا بە پێغەمبەر ئەفەرموێ ( وذرنی والمکذبین أولی النعمة ) وازبێنە لـە منو ئەم خاوەن نازو نیعمەتانەی کـە ئایینی من بەدرۆ ئەزانن ، واتە با ئـەوان بـە ژیانی خۆشی خۆیانەوە خـەریك بن ، وە ئێـوەش بـە وەرزشو شەوبێداریی و دەورکردنەوەی قورئانی خۆتانەوە خەریك بن ، تاکـاتی خۆی دێتە پێشەوە وەکو ئەفەرموێ ( ومهلهم قلیلا ) کەمێك مۆڵەتیان بدە تا بەپێی دەستوورو باوێك کـە دامناوە لـە جیهانا ئەیانڕووخێنم ، وە لە ڕۆژی دواییشا ئەیانسووتێنم بـە ئاگری دۆزەخ ، وەکو ئەفـەرموێ ( انّ لدینـا انـکالا ) بێگومـان لای ئێمـە هەیە کۆتو پێوەندی زۆر قورسو گران ( وجحیما ) وە ئاگری گـەورەی هەڵـگیرساو ( وطعامـا ذا غصة ) وە خواردنی تیژو تاڵی گەروگیر ( وعـذابا الیما ) وە سزای

یَوْمَ تَرجُفُ الأرْضُ وَالْجِبالُ ، وَكانَتِ الْجِبالُ كَثِيباً مَهِيلاً ( ١٤ )

لەرۆژێکا کە زەویی‌و شاخەکان دێتە لەرزە ، وە کێوەکان ئەبن بە کۆمەڵە لمی هەڵڕژاو (١٤)

بڕ لە داخ‌و دەردو سوێ ، ئەم سزایانەش (یوم ترجف الارض والجبال) لە ڕۆژێکا ئەبن ـ وەك ڕۆژی دوایی بێ ـ کە زەویی‌و شاخەکان دێنە لەرزە ( وکانت الجبال کثیبا مهیلا ) وە کێوەکان ئەبن بە کۆمەڵە لمی هەڵڕژاو •

بەپێی فەرموودەی قورئان ڕۆژێك ئەبێ کە ئەم جیهانە ڕێك‌وپێکە تێك‌بچێ ، بەم‌پەنگە زەویی لە شوێنی خۆی ئەترازێ‌و ئەبێ بە لم‌و ڕێیکی ڕەوان ، هەر بەوڕەنگە ڕۆژو ئەستێرە گەرۆکەکانی‌تریش ئەترازێن ، وەك لە ئایەتێکی‌ترا ئەفەرموێ « اذا السماء انفطرت • واذا الکواکب انتثرت »[1] ئەمرۆ زانایانی ئاسمان ئەڵێن ئەوڕۆژەی کە بەئاسمانەوەیە شەوو ڕۆژی ٣٦٠،٠٠٠ ملیۆن تەنی لێ کەم ئەبێتەوە لە ڕێی ڕووناکبی‌دانەوە «اشعاع»[2] وە لەبەرئەوە هەموو چاوەڕوانیی کوژانەوەی ئەکەن ، ئنجا ئاخۆ لەگەڵ جیهانی ئێمە تێکچوو ، هەموو ئەستێرەکانی‌تریش هەڵبوەرێن ، یا ئەوان ئەمێنن تا نۆرەیان دێتە سەر ، ئەوە هەر خوا خۆی ئەزانێ •

---

(١) واتە کاتێك کە ئاسمان لەت‌بوو ، وە دەمێك کە ئەستێرەکان هەڵوەریین •

(٢) الکون العجیب • ل ، ٣٩ •

اِنّا اَرْسَلْنا اِلَیْکُمْ رَسولاً شاهِداً عَلَیْکُمْ ، کما اَرْسَلْنا اِلی فِرعَونَ رَسُولاً (١٥) فَعَصی فِرعَونُ الرَّسولَ ، فَاَخَذْناه اَخْذاً وَبیلاً (١٦) فکَیفَ تَتَّقُونَ اِنْ کفَرْتُمْ ،

ئێمە پێغەمبەرێکمان بۆ ناردن بە شاهید لەسەرتان ، هەروەك پێغەمبەرێکمان نارد بۆ فیرعەون (١٥) ئنجا فیرعەون بێفەرمانیی ئەو پێغەمەرەی کرد ، ئێمەش گرتمان بە گرتنێکی سەخت (١٦) ئەگەر بێبڕوایی بکەن چۆن خۆتان ئەپارێزن.

لەپاش ئەوەی کە باسێکی کورتی ڕۆژی دوایی کرد ، وە دای بە گوێچکەی بێبڕواکانی عەرەبا سەرەتای ئەوڕۆژەو وێران بوونی زەویی ، ئنجا ئەو سزایانەیان بیرئەخاتەوە کە لە جیهانا تووشی گەلانی پێش ئەوان بوون لەپێناوی بڕوانەکردن بە پێغەمبەرەکانیانا ، ئەفەرموێ ( انا ارسلنا الیکم رسولا شاهدا علیکم ) ئێمە پێغەمبەرێکمان بۆ ناردن ـ وەك محمد بێ ـ کە شاهیدە لەسەرتان لەلای خوا ، کە ئەوی ئەو پێی سپاردووە ، ئەم گەیاندوویەتی بە ئێوە ( کما ارسلنا الی فرعون رسولا ) هەروەك مووسا پێغەمبەرمان نارد بۆسەر فیرعەون ( فعصی فرعون الرسول ) ئنجا فیرعەون بێفەرمانیی ئەو پێغەمبەرەی کرد ( فاخذناه اخذا وبیلا ) ئێمەش گرتمان بە گرتنێکی سەخت .

( فکیف تتقون ان کفرتم ) ئنجا ئەگەر هەروا بمێننەوە لەسەر

يَوْماً يَجْعَلُ الْوِلْدانَ شيباً ؟ ( ١٧ ) السَّماءُ مُنْفَطِرٌ بِهِ ، كانَ وَعْدُهُ مَفْعُولاً ( ١٨ ) انَّ هٰذِهِ تَذْكِرَةٌ ، فَمَن شاء اتَّخَذَ الى رَبِّهِ سَبِيلاً ( ١٩ )

له ڕۆژێکا که (به ترس و سامی خۆی) منالآن پیر ئەکات (١٧) ئاسمان لەت ئەبێ بەهۆی (سەختیی) ئەو ڕۆژەوە ، بەڵێنی خوا تێپەڕیوە (١٨) بەڕاستی ئەم ئایەتانی پێشووە پەندن ، ئینجا هەرکەسێك ویستی ڕیگایەك ئەگرێ بۆلای خوای خۆی (١٩)

بێبڕوایی ، چۆن خۆتان ئەپارێزن لـە سزای ( یوما یجعل الولدان شیبا ) ڕۆژێك کـە بەسـامو ترس و بیمی خـۆی منالآن پیر ئەکـات ، بەڵـکو لەمەش کـاری گـەورەتر ئەکـات ، وەکو ئەفەرموێ ( السماء منفطر به ) ئاسمان لەت ئەبێ بەهۆی سەختیی ئەوڕۆژەوە (کـان وعده مفعولا ) بەڵێنی خوا بـە بوونی ئەوڕۆژە دراوەو تێپەڕیوە ، وە ئـەبێ بێتـەدیی .

( ان هذه تذکرة ) بەڕاستیی ئەم ئایەتانی پێشووە لە باسی ڕۆژی دوایی و تۆڵەو سزای فیرعەون لە هەردو جیهـانا ــ پەندن بۆ مـەردوم ( فمن شـاء اتخذ الی ربه سبیلا ) ئنجـا هـەرکەسێك ویستی ڕێـگایەك ئەگرێ بۆ لای پەروەردگاری خۆی .

★ ★ ★

لـە سـەرەتای سوورەتەکـەوە تا ئێرە ، وەختی خۆی ـ هـاتۆتە خوارەوە ، وە شەونوێژو دەووزکردنەوەی قورئانی پێویست کردووە

إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَى مِنْ ثُلُثَيِ اللَّيْلِ ، وَنِصْفَهُ وَثُلُثَهُ ،

خوای تۆ ئەزانێ کە تۆ (ئەی محمد) لەگەڵ دەستەیەك لە مسڵمانەکان هەڵئەستیت (بۆ شەونوێژ) نەختێك کەمتر لە دوو بەش لە سێ بەشی شەو ، نیوەی ، یا سێ یەکی ،

لەسەر پێغەمبەرو یارانی ، بە نیشانەی ئایەتی پاشوو کە ئەفەرموێ « وطائفة من الذين معك » ئەمەشی کە پێویست کرد بۆ ئەوە بوو کە گیانیـکی وەرزشیان بداتێ ، وە ئەو ئایەتانەی کە دێنە خوارەوە ، بە شەو دەوری بکەنەوەو لێی ووردبنەوە ، بەڵێ پێغەمبەرو یارانی شانیان دایە بەر ئەم شەونوێژە ، وە چەند ساڵێك لەسەر یەك لە نیوەشەوەوە هەڵئەستان تا بەیانیی ، بە خواپەرستیی و دەووركردنەوەی قورئانەوە خەریك ئەبوون ، لەدوای ئەوەی کە گیانیـکی وەرزشیان پەیداکرد ، وە ئەو ئایەتانەی کە هاتبوونە خوارەوە لەبەریان کرد ، وە لەمماوەیەدا زۆر کەسیش مسڵمان بوون ، وە لەمانە زۆریان تەواناى ئەم شەوهەستانەیان نەبوو ، ئنجا خوا ویستی ئەم بارە هەڵگرێ لەسەریان ، وە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە فەرمووی ( ان ربك يعلم انك تقوم ادنى من ثلثي الليل ، ونصفه وثلثه ) خوای تۆ ئەزانێ کە تۆ ـ ئەی محمد ـ دەمێك کەمتر لە دوو بەش لە سێ بەشی شەوو دەمێك نیوەی و دەمێك سێ یەکی شەو ، هەڵئەستیت بۆ خواپەرستیی .

وَطائِفَةٌ مِنَ الَّذينَ مَعَكَ وَاللهُ يُقَدِّرُ اللَّيْلَ وَالنَّهارَ ، عَلِمَ اَنْ لَنْ تُحْصُوهُ

وە دەستەیەك لەوانەی كە لەگەڵتان وە خوا دای ئەنێ ئەندازەی شەووڕۆژ، (خوا) زانیی كـە ئێوە ناتوانن ئەندازەی شەونوێژ ڕابگرن ،

سەرەتای ئـەم سوورەتە قسـە بوو لەگەڵ پێغەمبەرا بەتایبەتیی ، بەڵام مەبەس ،سڵمانەكانیش بوو ، بە نیشانەی ئـەوەی كـە ئەفەرموێ (وطائفة ،ن الذين معك ) وە لەگـەڵ تۆدا هەڵئەستن دەستەیەك لەوانەی كـە لەگەڵتانو بڕوایان پێ هێناویت ، لەگـەڵ ئەمیشە كە شەوگار وەك یەك نی‌یە ، دەمێك كورتو دەمێك درێژە ، وە ڕاگرتنی ئـەم سێیەكە بەدرێژایی ساڵ گرانە ، نەخوازەلا ، كە لەودەمەشا سەعات نەبووە ، ئنجا هی‌ڕا بووە لە سێیەكی كەمتر هەڵئەستاو گوناهبار ئەبوو ، وە هی وابووە زۆرتر هەڵئەستاو ناڕەحەت ئەبوو ، وە ئەمەش بەدەست كەس نی‌یە ، بەڵـكو دەستوورو باوی خوایە لە جیهانا بۆ كورتی‌و درێژیی شەو ، وەكو ئەفەرموێ ( والله يقدر الليل والنهار ) هەر خوا خۆی دای‌ئەنێ بۆ هـەر یەك لە شەوو ڕۆژ ئەندازەی خۆی بەپێی چوار وەرزە ، وەئەم دەستوورە نایێ بـگۆڕێ ، چونـكە ئەگەر گۆڕا ئەبێ ژیانی ئادەمیش بـگۆڕێ ( علم ان لن تحصوه ) خوا زانی كـە ئێوە ناتوانن ئەندازەی شەونوێژ ڕابـگرن ، چونـكە ئەوكاتە سەعات نەبووە ، وەكـات هـەر بەگوترە ڕاگیراوە ، گوترەش زیادو كـەمی ئەبێ ، زیادەكەی قورس‌و گران‌و كەمەكـەی گوناهو بێفەرمانی‌یە ، وە پێویست بە لێخۆشبوونە ، بۆیە

فَتَابَ عَلَيْكُمْ ، فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنَ الْقُرْآنِ عَلِمَ أَنْ سَيَكُونُ مِنْكُمْ مَرْضَى ، وَآخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِي الْأَرْضِ ، يَبْتَغُونَ مِنْ فَضْلِ اللهِ ،

---

ئیتر خـوا لێتان خۆشبوو ، وە ئەوەندەی بۆتان ئاسـانە ، لـە قورئان دەوری بکەنەوە ، (خوا) زانیی کـە لەمەولا نەخۆشتان زۆر ئەبێ ، وە هی‌تری واتان ئـەبێ ، کـــە ڕێ‌ئەکوتن‌و بەشوێن ڕۆزیی خـــوادا ئەگـەڕێن ،

---

فەرمووی ( فتاب علیکم ) خوا لێتان خۆشبوو ، واتە ئەوانەی کە تائێستا لە سێ‌یەکی شەو کەمتر هەستابن خوا لێ‌یان خۆشبوو ، وە لەمەولاش پێویست نەما بە هەستان بۆ شەونوێژو دەوری قورئان کردنەوە ، وەکو ئەفەرموێ ( فقرءوا ما تیسر من القرآن ) ئەوەندەی بۆتان ئاســـانە لـــە قورئان دەوری بکەنەوە ، واتە ئەو قورئانەی کـە لـە پێنج فـەرزەی نوێژا ئەیخوێنن بەسە •

لەگـەڵ ئـەو هۆیەی کـە باس‌کرا بۆ هەڵـگرتنی شـەونوێژ ، چـەند هۆیەکی‌تریش هەن کەوا باسیان ئەکات ئەفەرموێ :

١ ـ ( علم ان سیکون منکم مرضی ) خوا زانیی کـە لەمـەولا نەخۆشیی زۆرتان ئەبێ ، کـە ئەو نەخۆشانە ناتوانن هەموو شـەوێك هەستن بۆ شەونوێژو دەوورکردنەوەی **قورئان** •

٢ ـ ( واخرون یضربون في الارض ) وە هی‌تری واتان ئەبن کە ڕێ‌ئەکوتن ، وە لە هاتووچۆی کڕین‌و فرۆتن‌و بازرگانیی ، یا خوێندنا ئەبن ( یبتغون من فضل الله ) ئەگەڕێن بەشوێن بەشی خوادا لە قازانج‌و

وَآخَرُونَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللهِ ،

وە هیتری واتان ئەبن کە ئەجەنگن لە ڕێی خوادا ،

سـوود ، یا لەخوێندنو زانیـاریی کـە ئەمانە لەبەر ماندوێتی ڕۆژیان ناتوانن شەونوێژ بـکەنو دەوری قورئان بکەنەوە .

٣ ـ ( واخرون یقاتلون في سبیل الله ) وە هیتری واتان ئەبن کە ئەجەنـگن لـە ڕێی خـوادا ، وە لەبەر جەنـگیین شەونوێژیان بۆ ناکرێ .

بازرگـانو ئەوانەی کـە بۆکڕینو فرۆتن ئەچن بۆ وولاتانی دوور ، پێش جەنگ‌کەرانی خست تا نیشان‌بدات کە پایەی بازرگانیو بازرگـانان لـە ئاینی ئیسلامـا تا چـەندە بـەرزە ، چونـکە مـایەی دەوڵەمـەندیی گـەلو بەرزبوونـەوەیانو بلاوبوونـەوەی بیروباوەڕو ئاینیانن ، وابزانم بلاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام لە وولاتە دوورەکانا ، ئەخـوازەلا لـە ئەفریقـاو ڕۆژهـەلاتی ئاسیادا زۆرتر بەهۆی بازرگانانەوە بووە ، چونـکە هەروەك ماڵی بازرگـانی‌یان بلاوئەکردەوە ، تێـکەڵی دانیشتووانی ئـەو شوێنانەش ئەبوون ، کـە هەموو بت‌پەرست بوون ، وە باسی ئاینی ئیسلامو بیروباوەڕی خۆیانیان بۆ ئەکردن ، وە لەمـەوە بەرە بەرە ئاینی ئیسـلام لـەو وولاتانـەدا بلاوبۆتەوەو ئەنیوەتەوە .

ئەگەر ئاوڕێك بدەینەوە بۆ دواوە ئەبینین لە دووسەد تا سێ‌سەد

فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ ، وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ ،

ئنجا بخوێننەوە لە قورئان ئەوەندەی کە بۆتان ئاسانە ، وە نوێژ بکەن‌و زەکات بدەن ،

ســـاڵ لەمـــەپێشەوە بازرگـــانیی لای دەوڵەتانی داگیرکەر « مستعمر » پێش‌ڕەوی داگیرکەریی «استعمار» ووڵاتان بووە ، بازرگانیان ناردووە بە کووتاڵ‌و شتی نایاب‌و جوانەوە ، بۆ ووڵاتانی دوور ، وە کردوونیـان بە پێش‌ڕەوی داگیرکردن ، وە دوابەدوای ئەوان جاسووسیان هـاتووە ئنجا لەشکر •

ئنجـا لەبەر ئەم سێ هۆیە خـوا شەونوێژی هەڵگرت ، وە پێنج فـەرزی لە شوێن دانا کـە نوێژی شێوان‌و خەوتنان‌و بەیانیان بە دەنـگی بەرز قورئانی تیا دەورئەکرێتەوە ، ئەفەرموێ ( فاقرءوا ما تیسر منــه ) کـەواتە لـــە قورئان بخوێننەوە ئەوەندەی کـە لاتان ئاسانـە ( واقیموا الصلاة ) وە نوێژ بـکەن بە بیرو هۆشەوە ( واتوا الزکاة ) وە زەکـات بـدەن •

لـە هـەموو شوێنێك قورئان کـە ناوی نوێژ بهات ناوی زەکاتیش ئەهات ، مەگەر بەدەگمەن ، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کـە نوێژ ڕیشتەیەکی بەهێزە لـە ناوەندی خواو بەندەگانا ، هەروەك زەکات ڕیشتەیەکی زۆر بەهێزە لە ناوەندی بەندەگانا •

لەدوای هانەهانەی مـەردوم لەسەر زەکات‌دان کـە پێویستیـکی دینی‌یە ، ئنجا بەجۆرێـکی‌تر دەستی ئادەمیی ئەگرێ بۆ پلەیەکی بەرزتر

وَاَقْرِضُوا اللهَ قَرْضاً حَسَناً ، وَمَا تُقَدِّمُوا لاَنْفُسِكُمْ مِنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِنْدَ اللهِ هُوَ خَيْراً وَاَعْظَمَ اَجْراً ، وَاسْتَغْفِرُوا اللهَ ،

وە قەرزبدەن بە خوا بە قەرزێکی باش ، ئەوی پێشی بخەن بۆ خۆتان لە چاکە ، لای خوا دەستتان ئەکەوێتەوە بە باشترو گەورەتر لە ڕووی پاداشەوە ، وە داوای لێخۆشبوون بکەن لە خوا ،

کە ئەویش بەخت‌کردنی دارایی‌یە لە ڕێی چاکەو دەست‌گیرۆیی‌دا ، با وەك زەکاتیش پێویستێکی دینی نەبێ ، ئەفەرموێ (واقرضوا الله قرضا حسنا) قەرزبدەن بە خوا بە قەرزێکی باش ، واتە دەست‌گیرۆیی هەژارانو لێقەوماوان بکەن بە هەموو ڕەنگێك بە بێ قازانجو سوود .

لەدوای ئەم پلەیە ئنجا ئەیەوێ پلەیەکی بەرزتر بە ئادەمیی ببڕێ کە ئەویش پلەی چاکەو کردەوەی باشە ، بە گوفتار بێ یا بە کردار ، فەرمووی ( وما تقدموا لانفسکم من خیر ) ئەوی پێشی بخەن بۆ خۆتان لە چاکە ( تجدوە عند الله ) دەستتان ئەکەوێتەوە لای خوا (هو) ئەوەی لای خوا دەستتان ئەکەوێتەوە ( خیرا واعظم اجرا ) گەلێ باشترو گەورەترە لەڕووی پاداشەوە لەوەی کە خۆتان لە جیهانا کردووتانە ، چونکە کردەوەکەی خۆتان بڕاوەتەوە ، بەڵام پاداشەکەی خوا نابڕێتەوە .

لەبەرئەوەی کە مەردوم زۆر زەبوونە ، وە زۆر جار لە کردەوەی باشی خۆیا ڕووپامایی ەریاە تێکەڵ ، وە هاوبەش بۆ خوا پەیدا ئەکات ، فەرمووی ( واستغفروا الله ) داوای لێخۆشبوون بکەن بەرانبەر بە هەڵەو

اِن اللهَ غَفُورٌ رَحیمٌ ( ٢٠ )

بەڕاستی خوا لێخۆشبوویەکی میهرەبانە (٢٠)

ناتەواوییەك كــە بتــانبێ ( ان الله غفور رحیم ) بەڕاستی خـــوا خۆشبوویەکی میهرەبانە •

بەڵێ خوا شەونوێژی هەڵـگرت ، بەڵام پێغەمبەر دەستی هـەر لێ هەڵنەگرت ، وە تا کۆچی دوایی کرد ، هەموو شەوێك لە نیوەی شەو بەدواوە هەستاوە تا بانگی بەیانیی بە شەو نوێژو خواپەرستیو پاڕانەوەوە خەریك بووە ، وە هەموو شەوێك دووسێ جزمی قورئانی لـــە نوێژا دەور کردۆتەوە ، وە زۆر جـار چارەكو نیوســەعات لـە سەجـدەدا ماوەتەوەو سەری بەرز نەکردۆتەوە •

# سوورەی ( مدثر )ە

**مەککی‌یە ، ٥٦ ئایەتە ، ٢٥٥ ووتەیە ، ١٠١٠ پیتە**

## بسم الله الرحمن الرحیم

**بە ناوی خـوای بەخشندەی میهرەبان**

وەك لە سەرەتای سوورەتی «علق»ەوە باسمان‌کرد کاتێك کـە خوا ویستی دڵی پێغەمبەر ڕووناك‌بکاتەوە بە چرای پێغەمبەریەتی یەکـەم‌جار فریشتەی سرووشی بۆ نارد لـە ئەشکەوتی «حراء» لەکاتێکا کـە بە دڵ بێـدارو بە چاو نوستبوو ، وە ئایەتی « اقرأ باسم ربك الذی خلق »ی بۆهـات تا « علم الانسان ما لم یعلم » پێغـەمبەر نەیزانی کـە ئەمـە فریشتەی سرووشـە ، لەبەر ئەوە ترسـاو بەدەم لـەرزەوە چووەوە بۆ ماڵەوەو فەرمووی «دثرونی» واتـە دامپۆشن ، دوای ئـەوە سـەرەتای سوورەی «قەڵەم»ی بۆ هـات ، ئیتر سرووش وێستا ماوەی دوو ساڵو نیو بۆئەوەی پێغەمبەر ئەو ترس‌و لەرزەی نەمێنێ ، وە خۆی ئارەزووی هاتنەوەی سرووش بـکات ، پاش ماوەیەك پێغەمبەر ئەو ترسەی نەمـا ، وە ئارەزووی سرووشی ئەکرد ، بەڵام بۆی نەئەهات تا زۆر خەمبـارو خەفەتبار بوو ، وە بە ڕۆژ ئەچووەوە بۆ ئەشکەوتی «حراء»و ئەمایەوە ، ناوبەناو لە ئەشـکەوتەکە ئەهـاتە دەرەوە ، وە بەسـەر شاخـەکەدا ئەسووڕایەوە ، وەك شتێـکی زۆر بەنرخی لێ وون‌بووبێ ، هێندێ جار وا دڵی توند ئەبوو ئەیویست خۆی فڕێ‌بداتە خوارەوە لەو سەرشاخە ، تا ڕۆژێ لـەپڕ فریشتەی سرووش پەیدابوو ، دیسـان مووچرکێـکی

# سورة المدثــر

## بسم الله الرحمن الرحيم

يا ايُّها الْمُدَّثِّرُ (١) قُمْ فَاَنْذِرْ (٢)

---

## سوورەی ( مدثر )ه

### بە ناوی خـوای بەخشندەی میهرەبان

ئەی ئەوکەسەی کە خۆت پێچاوەتەوە (١) هەستە (مەردوم) بترسێنـە (بە سزای خوا) (٢)

---

پیاهات ، وە بە هەڵبزرکاویی گەڕایەوە بۆماڵەوە ، فەرمووی «دثرونی» واتـە دامپۆشن ، دوای ئارامگرتنی ، فریشتەی سرووش بانـگی‌کرد بە ( یا ایها المدثر ) وە سەرەتای ئەم سوورەتەی بۆ هێنا تا ئایەتی « ولربك فاصبر » واتە ئەی ئەوکەسەی کـە خۆت پێچـاوەتەوە لەترسـانا ، وەك بتـەوێ خۆت بشاریتەوە لە پێویستێکی زۆر گەورە ( قم فانذر ) هەستە ئامۆژگاریی مەردوم بـکە بە ئایینی ئیسلام ، وە بی‌یان‌ترسێنە بـە سزای خوا ئەگەر بڕوایان نەهێنا ، واتە ئەی پێغەمبەر هەستە بۆ پێویستێکی زۆر گـەورەو پیرۆز کـە چاوەڕوانیت ئەکـات ، هـەستە بۆ هـەوڵ‌و تەقەلادان بە شـەوو بە ڕۆژ ، بۆ خزمـەتی ئادەمیی ، هەستە بۆ دانانی دەسـتووری ژیانی ئادەمیی ، بـە یەکێتیی‌و خێزانیی‌و بـە کۆمـەڵیی‌و

تێکڕایی ، هەستە چونکە کاتی نوستن‌و پاڵکەوتن‌و حەسانەوە نەما ، ئەوانەی کە هەر بۆخۆیان ئەژین ئەتوانن بە خۆشیی بژین ، بەڵام بە بچووکیی ئەژین ، وە بە بچووکیی ئەمرن ، وەلێ پیاوانی گەورە ، وە ئەوانەی کە باری شانی هەزاران هەزار مەردومان هەڵئەگرن ، ئەوانە نوستنیان نی‌یە ، حەسانەوەیان نی‌یە ، خۆشیی‌و ڕابواردنیان ئەوەیەکە مەردوم بخەنە خۆشی‌یەوە .

بەڵێ پێغەمبەر هەستا بە تاقی تەنیا ، دەستی‌کرد بە ڕاگەیاندنی فەرموودەو فەرمانی خوا ، بە دەستێك بناغەی دەستوورو باوی کۆنی ئەڕووخاند ، بە دەستێکی‌تر بناغەی بیروباوەڕی ئیسلامیی دائەمەزراند لە دڵو دەروونی مەردوما .

بەڵێ پێغەمبەر ڕاست‌بووەوەو وێستا ، بیست‌وسێ ساڵ لەسەریەك بەرانبەر بە گەلێکی سەهندەی ، لاساری ، دەوڵەمەندی ، بەدەعیەو دەداری ، کەللەپووت ، کە خۆی بە خاوەنی دینی ابراهیم پێغەمبەرو کەعبەو خانەی خوا ئەزانیی ، کە چل پەنجا ڕۆژ لەوەپێش خوا «ئەبرەهە»ی بۆ لەناوبرد بە خۆی‌و لەشکرو فیلی‌یەوە .

بەڵێ پێغەمبەر هەستا بیست‌وسێ ساڵ لەسەر یەك خەریك بوو بێ‌ووچان ، وە بە گوفتارو کردار هەوڵی‌دا ، تا بوو بەهۆی بڵاوبوونەوەی ئیسلام لە ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوادا ، وە بوو بەهۆی ڕێکخستنی گەلێك لە هەموو ئادەمیی بە هەموو تیرەو ڕەگەزێکی‌یەوە بێ‌ئەوەی یەکێکیان خۆی بە گەورەتر بزانێ لە یەکێکی‌تر .

دیارە هەستانی پێغەمبەر بۆ ئەم ئیشە گەورەیە ، وە ڕاوێستانی

وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ (٣) وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ (٤)

وە خوای خۆت بە گەورە بگرە (٣) وە کالآت بە پاك ڕابگرە (٤)

بەرانبەر بە گەلێکی سەرڕەق ، بەڵکو بەرانبەر بە هەموو کۆمەڵی ئادەمیی ، بە بێپشتیوانو یارمەتیدەر ، وە بە بێ چەكو قەڵغانو لەشکر نابێ ، ئنجا با بزانین پێغەمبەر ئەمانەی بووە ؟ نەء هیچی نەبووە ، تەنیا خوا نەبێ ، وە چەند ئامۆژگاریيەکی ئەو نەبێ ، کە ئەمانەن :

١ ـ ( وربك فكبر ) پەروەردگاری خۆت هەمیشە بە گەورە ڕابگرە ، وە هەرگیز هاوبەشی بۆ پەیدا مەکە ، وە هەر لە خوا بترسە ، وە بزانە ئەو خوایەی کە تۆی بە پێغەمبەر ناردووە ، ئاگاداریيت ئەکاو ئەتپارێزێ .

٢ ـ ( وثيابك فطهر ) کالآت پاك ڕابگرە ، چونکە تا بەرگ‌و کالآ پاك‌و تەمیزتر بێ ، دڵ‌و دەروونیش پاك ، وە ڕەووشت‌و خووش جوان ئەبێ ، جگە لەوە کە لەناو مەردومانیشا بەنرخ‌و قسەڕەوا ئەبێ ، لەبەرئەوە ئەمڕۆ لە ئەورووپاو وولآتە پێشکەوتووەکانا ، فەرمان دراوە کە ئەبێ بەندیی «حبس» زۆر خۆی بشواو خۆی بگۆڕێ بۆئەوەی ڕۆژێك کە بەربوو ، فێری پاك‌و تەمیزیی ببێ ، تا ڕەووشت‌و خووشی جوان بێ ، دەستنوێژو مەلەو خۆشتن لە ئیسلاما کە پێویست کراوە ئەو مەبەستەی تیایە .

وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ (٥)

وە دەست لە گوناه هەڵگرە (٥)

٣ ـ ( والرجز فاهجر ) دەست لە گوناه هەڵگرە ، واتە نابێ گوناه بکەیت نە بە دەست نە بە دەم ، نە بە چاو ، نە بە گوێ ، نە بە قاچ ، نە بە هیچ ئەندامێکی‌تر •

ئەم ئایەتانە واناگەیەنێ کە پێغەمبەر ـ خوا نەخواستە ـ بت‌پەرست ، یا گوناهکار بووبێ ، حاشا لەپێش پێغەمبەرێتیشیا بتی نەپەرستووە ، وە ڕەووشت‌و خووی ناشرینی نەبووە ، وە گوناهی نەکردووە ، ئەگینا بێ‌بڕواکان هەروەك پێیان ووتووە شێت‌و جووکیی‌و جادووگەر ، ئەنگێکی‌تریشیان لێ ئەدۆزی‌یەوە ، کەچی مێژوو نیشان‌نادا کە هیچ ئەنگێکی‌تری لێ گیرابێ ، بەڵکو مانای ئایەتەکان وایە کە لەسەر ئەم ڕەووشتە جوانانەی کە هەتە بمێنەرەوە ، ئەمە وەك ئەوە وایە کە بە کوڕێکت بڵێیت ـ کە لە هەموو شتێکی دڵنیا بیت ، وە بتەوێ بی‌نێریت بۆ دەرەوە بۆ بازرگانی‌یەکی قورس ، وە کوڕەکەشت پرکێشی نەکا بۆ چوون ـ : کوڕی خۆم مەترسە تۆ دەست‌پاك‌و ڕاست‌گۆو بەئایین‌و لە خوا ترس بە ، ئەوکاتە سەر ئەکەویت ، تۆ ئەمەی پێ‌ئەڵێیت لەکاتێکا کە خۆت ئەو کوڕەت هەڵبژاردووە بۆ ئەوکارە ، وە لە هەموو ڕەووشت‌و خوویەکی دڵنیایت •

وَلا تَمْنُنْ تَسْتَكْثِرُ (٦) وَلِرَبِّكَ فَاصْبِرْ (٧)

و شت مەبەخشەو بە زۆری بزانیت (٦) وە لە ڕێی خـوادا خۆت ڕابگرە (٧)

٤ ـ ( ولا تمنن تستكثر ) شت مەبەخشەو بە زۆری بزانیت ، واتە هـەر خزمەتێك بـكەیت ، وە هـەر شتێك بدەیت بە یەكێك نە منـەتی بـكە بەسەراو نە بە زۆری بزانە ، بەڵكو ئەبێ خۆت لەبیربچێتەوە ، وە منو منێتی بە دڵو بە دەمتا نەیەت •

٥ ـ ( ولربك فاصبر ) بۆ خوا دان بە خۆتا بـگرە ، واتـە لـەم ڕێیەدا تووشی هـەر ئازارو سزایەك ببیت ئەبێ خۆت ڕابگریت ، وە كۆڵ نەدەیتو پشتت سارد نەبێتەوە •

بەڕاستی هیچ كەسێك سەرۆكـایەتی دینی ، یا دنیایی ، یا سیاسی یا كۆمـەڵایەتیی بێ ناكرێ لەگـەڵ چرووكیی و دەستقووچاوییدا ، هەروەك سەرۆكایەتیی ناكرێ بە مەردومی بێئارام «صبر»ی كەمچێكڵدانە، كـە بە هەموو شتێك دڵی ساردببێتەوە ، زۆر دەعوەتی ناڕەوا بووە سەری گرتووەو بەری گرتووە ، هەر لەبەرئەوەی كـە سەرۆكەكەی دەستكراوەو لەسەرخۆ بووە ، وە منێتی بەكـار نەهێنـاوە ، وە زۆر دەعوەتی ڕەواش بووە ڕووخاوەو نەماوە بەهۆی چرووكیی یا بێئارامیی سەرۆكەكەیەوە •

★ ★ ★

فَإِذَا نُقِرَ فِي النَّاقُورِ (٨) فَذَلِكَ يَوْمَئِذٍ يَوْمٌ عَسِيرٌ (٩) عَلَى الْكَافِرِينَ غَيْرُ يَسِيرٍ (١٠)

کاتێك کە فووکرا بە کەڕەنادا (٨) ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی سەختو گرانە (٩) لەسەر بێبڕوایان سووكو ئاسان نی‌یە (١٠)

دوای ئامۆژگاریی پێغەمبەر ، ئنجا هەڕەشە لە بێبڕوایان ئەکات ، ئەفەرموێ ( فاذا نقر في الناقور ) کاتێك کە فووکرا بە کەڕەنادا ، وە ڕۆژی دوایی هات ، ناخۆشیی تاوئەسێنێو خەمو خەفەت زۆر ئەبێو سزای خوا ئەکەوێتە کار ، وەکو ئەفەرموی ( فذلك ) ئەو دەمە کە فووکرا بە کەڕەنادا ( يومئذ يوم عسير ) ئەوڕۆژە ڕۆژێکی سەختو گرانە ( على الكافرين غير يسير ) لەسەر بێبڕوایان سووكو ئاسان نی‌یە ، واتە هەموو تەنگانەیەك لە جیهانا ئاسانیی‌ەکی لەدواوەیە ، تەنگانەی ڕۆژی دوایی نەبێ ، کە هەرچی ئاسانیی بێ لەگەڵیا نی‌یە ، مەبەس لە فووکردن بە کەڕەنادا باس کراوە لە سوورەی «الحاقة»دا .

★ ★ ★

لە گەورەکانی قورەیش «ابو لهب»و «ابو جهل»و «ابو سفيان»و «وليد»ی کوڕی «مغيرە» زۆر دوژمنی پێغەمبەر بوون ، وە زۆر ئازاریان ئەدا ، ئەخوازەلا «وليد»یان کە لە هەموویان دەوڵەمەندترو دەستدارتر بووە ، وە دە کوڕی گەورەی بووە هەمیشە لەگەڵیا بوون ، ئەم سەرۆکانە زۆر تەنگەتاو بووبوون بەدەست پێغەمبەرەوە ، کە ئەیانبینی وا ڕۆژبەڕۆژ مەردوم دوای ئەکەوون ، وە قسەکانی لە دڵیانا جێ‌گیر ئەبێ ،

نەخوازەلا کـە کاتی حەجیش نزیك ئەکەوتەوە ، وە هـەرچی تیرەی عـەرەب بوو هـەموو لـە «مەککە» کۆئەبوونەوە ، وە پێغەمبەر ئەچووە ناویانەوەو قسەی بۆ ئەکردن ، ئەم سەرۆکانە ووتیان پێویستە هەموو یەك بین ، وە خـاوەنی یەك قسـە بین ، نەك هـەر یەکێکمان قسەیەك بکەین ، ناچـار کۆبوونەوە بۆئەوەی شتێك بدۆزنەوە تا بیـدەنە پاڵ پێغەمبەر ، یەکێکیان ووتی : با بڵێین شاعیرە ، «ولید» ووتی : نـە بـە خوا شاعیر نی‌یە ، چونـکە کەستان بەقەد من شارەزای شعر نین ، یەکێکیان ووتی : با بڵێین شێتە ، «ولیـد» ووتی : نـە بەخـوا شێت نی‌یە ، چونـکە شێت ترسنۆکە ، بەڵام محمـد لـە کـەس ناترسێ ، یەکێکیان ووتی : با بڵێین درۆزنە ، «ولید» ووتی : نە بەخوا درۆزن نی‌یە ، چونکە ئەوەتی هـــەیە کەس درۆیەکی لێ نەبیستووە ، یەکێکیان ووتی : با بڵێین جووکیی‌یە ، «ولید» ووتی : نە بەخوا جووکیی نی‌یە ، چونـکە جووکیی زۆر قسـەی بەدرۆ دەرئەچێ ، بەڵام محمد هیچ قسەیەکی بەدرۆ دەرنەچووە ، لەپاشا ووتیان : ئەی چی‌بڵێین ؟ ووتی : با بیرێکی لێ بکەمەوە ، لەپاشا ماوەیەك مات بوو ، ئنجا بە چاوێـکی کراوە تەماشایەکی کردن ، واتە دۆزیمەوە ، دوای ئەوەی کـە هەموو چاویان تێ‌بڕیی‌و گوێ یان بۆ گرت ، ئنجـا بەدەعیەو دەمارێـکەوە ناوچەوانی خۆی گرژ کردو ڕووی لێ ترش‌کردن بۆئەوەی زۆر چاوەڕوانیی بکەن ، ئنجا بەفیزێکەوە تەنشتێکی تێ‌کردن‌و ووتی : ئەم قورئانە جادوویەکـە ، لـە جادووی کۆنەوە وەرگیراوە . هەموو دانیشتووان قسەکەیان پەسەند کرد ، وە لەخۆشیانا بڵاوبوونەوە ، هەر یەکە بە کەس‌و کارو دەست‌و پێوەندی خۆی ووت کە وا بڵێن ، پێغەمبەر بەم دەنگ‌و باسـە کـە بیستی‌یەوە زۆر دڵگیر بوو ، وە بـە

ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيداً (١١) وَجَعَلْتُ لَهُ مَالاً مَمْدُوداً ( ١٢ ) وَبَنِينَ شُهوداً ( ١٣ )

---

واز له من‌و ئه‌وکه‌سه بێنه که دروستم‌کردووه به‌ته‌نها (١١) وه دارایی (زۆری) یان‌وپۆڕم پێ‌داوه (١٢) وه کوڕانی ئاماده‌و به‌رده‌ست (١٣)

---

خه‌م‌و خه‌فه‌ته‌وه گه‌ڕایه‌وه بۆ ماڵه‌وه ، فه‌رمووی دام‌پۆشن ، ته‌نانه‌ت هێندێك له خاوه‌ن ته‌فسیره‌كان ئه‌ڵێن ئه‌م خه‌م‌و خه‌فه‌تی پێغه‌مبه‌رو خۆداپۆشینه‌ی بوو که بوو به هۆی هاتنه خواره‌وه‌ی سه‌ره‌تای ئه‌م سووره‌ته ، ئنجا خوا به پێغه‌مبه‌ر ئه‌فه‌رموێ كه داخی « ولید » له دڵی خۆت ده‌ركه ، وه خۆتی پێوه ماندوو مه‌كه ، وه بۆ منی به‌جێ‌بێڵه تا تۆڵه‌ی لێ ئه‌سێنم ، فه‌رمووی ( ذرنی ومن خلقت وحیدا ) واز له من‌و ئه‌وكه‌سه بێنه كه دروستم‌كردووه له سكی دایكیا به‌ته‌نها به بێ‌هاوده‌م ، وه كه‌سی له‌گه‌ڵ نه‌بووه ته‌نیا میهره‌بانیی‌و چاودێریی من نه‌بێ ، له‌پاشا ئنجا هاتۆته جیهانه‌وه به‌ته‌نیا به بێ‌ماڵ‌و منال ، تا ئه‌م هه‌موو داراییه‌م به‌سه‌را ڕشت ، كه‌وا یه‌كه یه‌كه باسیان ئه‌كاو ئه‌فه‌رموێ ( وجعلت له مالا ممدودا ) دارایی زۆری یان‌وپۆڕم پێ‌دا •

ئه‌گێڕنه‌وه كه باخاتی له مه‌ككه‌وه دایگرتبوو تا «طائف» به هاوین‌و به زستان میوه‌یان نه‌ئه‌پسایه‌وه ، جگه له مه‌ڕو ماڵات‌و ووڵاخ‌و ئاژاڵ‌و به‌نده‌و كه‌نیزه‌كی زۆر ( وبنین شهودا ) وه كوڕانی دیارو ئاماده كه

وَمَهَّدْتُ لَهُ تَمْهِيداً ( ١٤ ) ثُمَّ يَطْمَعُ اَنْ اَزِيدَ ( ١٥ )
كَلاَّ : اِنَّهُ كَانَ لِآيَاتِنَا عَنِيداً (١٦) سَأُرْهِقُهُ صَعُوداً ( ١٧ )

وە دنیام بۆ ڕاخستووە بە چۆن ڕاخستنێك (١٤) دوای ئەمانەش هێشتا بەتەمـایە زیاتری بدەمێ (١٥) نـەء (با بەتەمـا نەبێ) بەڕاستی ئـەو دەربارەی ئایەتانی ئێمە بێبڕوایەکی سەرسەختە (١٦) سزای سەختی بێ ئەچەژێنین (١٧)

هەمیشە وەك غولام لە بەردەستیا بن و لێی دوورنەکەونەوە ( ومهـدت لـە تمهیدا ) وە دنیـام بۆ ڕاخست بە چۆن ڕاخستنێك ( ثم یطمع ان ازید ) لەدوای ئەم هەموو شتانەی کـە پێمانداوە ، هێشتا بەتەمایە کە زیاتریشی بدەمێ (کلا) نەء با ئەمە لـە مێشکی خۆی بـکاتە دەرەوە ( انە کان لآیاتنا عنیدا) بەڕاستی ئەو بەرانبەر بە ئایەتانی ئێمـە بێبڕوایەکی سەرسەخت بوو ، واتە پێغەمبەری ئێمەو قورئانەکەی ـ کە بە خەڵات بۆمان ناردووە ـ بە درۆی ئەزانێ ، لەبەرئـــەوە ئەفەرموێ ( سارهقـە صعــودا ) بێی ئەچەژێنین سزایەکیوا کـە دەرەقەتی نەیەت ، وەك یەکێك کـــە بـــە شاخێکی سەختی کووڕی زۆر بەرزا سەرکەوێ چۆن دەرەقەتی نایەت ئەمیش وا .

لـەم ئایەتانی پێشووەوە زانرا کە «ولید» زۆر دژی ئایەتانی خـوا بووە ، وە خواش سزایەکی زۆر سەختی ئەدا کە لە توانایا نەبێ ، ئنجـا وەك یەکێك لێرەدا پرسیار بـکات بڵێ : «ولیـد» چۆن بووە لە کـــاتی دژایەتەکەیا ؟ وە سزاکەی چییە ؟ ئەمیش وەڵامی یەکەم ئەداتـەوە بـە

اِنَّـهُ فَـكَّرَ وَقَدَّرَ (١٨) فَقُتِـلَ ، كَيْفَ قَـدَّرَ ( ١٩ )
ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَـدَّرَ ( ٢٠ )

---

(چونکه) بیری کردەوەو ئەندازەی (قسەکەی خۆی) گرت (١٨) دەك بەکوشتچێ چـۆن ئەندازەیەکی گرت ( ١٩ ) دووبـارە بەکوشتچێ چـۆن ئەندازەیەکی گرت (٢٠)

---

« انه فكر وقدر » تا ئایەتی ٢٦ ، وە وەڵامی دووهەم ئەداتەوە بە (سأصليه سقر ) تا ئایەتی ٣١ ، کەواتە ئەم ئایەتانە درێژە پێدانی « انه كـان لآياتنـا عنيدا . سأرهقه صعودا »[1] یە ، واتە سـزای سـەختی پێ ئەچەژێن ، چونـکە ( انه فكر ) وليد بیری کردەوە کـە چی بڵێ دەربارەی قورئان ( وقدر ) وە ئەندازەی قسەکەی گرت لە دڵی خۆیا کە لەمەولا ئەیـکات ، ئنجا لەپێش ئەوەی کـە بـگاتە قسەکەی خوا پێی ئەفەرموێ لـەڕووی سەرکۆنەوە ( فقتـل كيف قـدر ) بەکوشت چێ چـۆن بڕیارێـکی دا دەربارەی قورئان ( ثم قتل كيف قدر ) دووبارە بەکوشتچێ بۆ خـۆیو

---

(١) ئەمە وەك سوورەی « اخلاص » وایە کە لەپێشەوە ئەفەرموێ « الله احد ، اللـه الصمد » لەپاشا بە « لم يلد ولـم يولد » بەیانی « اللـه احد » ئەکات ، وە بە « لم يكن له كفوا احد » بەیانی «الله الصمد» ئەکات .

ثُمَّ نَظَرَ ( ٢١ ) ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ ( ٢٢ ) ثُمَّ اَدْبَرَ وَاسْتَكْبَرَ ( ٢٣ ) فَقَالَ : انْ هذا الاَ سِحْرٌ يُؤْثَرُ ( ٢٤ ) اِنْ هذا اِلاّ قَوْلُ الْبَشَرِ ( ٢٥ ) سَأُصْلِيهِ سَقَرَ ( ٢٦ )

لەپاشا تەماشایەکی کرد ( ٢١ ) ئنجا ناوچەوانی گرژو ڕووی ترش کرد (٢٢) لەپاشا بەفیزێکەوە پشتی هەڵکرد (٢٣) ئنجا ووتی ئەم قورئانە جادوویەك نەبێ کە وەرگیراوە هیچی‌تر نی‌یە ( ٢٤ ) ئەم قورئانە هەر گوفتاری ئادەمی‌یە (٢٥) زوو ئەیخەمە دۆزەخەوە (٢٦)

بڕیارێك کە دای دەربارەی قورئان (ثم) لەپاش بیرکردنەوەو بڕیاردان (نظر) تەماشایەکی دانیشتووانی کرد ، واتە قسەیەکی زۆر کوشندەو کاریی گەرم دۆزی‌یەوە ، دەربارەی قورئان (ثم) لەپاش ئەوەی کە هەموو چلویان تێبڕیی‌و گوێیان بۆ گرت ( عبس وبسر ) ناوچەوانی خۆی گرژکردو ڕووی ترش کرد ، بۆئەوەی کە وەلامەکەی زۆر بەنرخەو لێی وەرگرن ( ثم ادبر واستکبر ) لەپاشا پشتی هەڵکردو سەرکێشی کرد ( فقال ان هذا الا سحر ) ئنجا ووتی : ئەمەی محمد ئەیخوێنێتەوە لە قورئان جادوو نەبێ هیچی‌تر نی‌یە ، کە نموونەی ئەم جادووەش (یؤثر) ئەگێڕرێتەوە لە ئاشووریی‌و بابلی‌و میسریی‌و هیندیی کۆنەوە ، نابینیت ئەمیش وەك ئەوان ژن‌و مێردو باوك‌و کوڕو خوشك‌و برا لە یەك ئەکات ( ان هذا ) ئەم قورئانە هیچێکی وا نی‌یە ( الا قول البشر ) ووتەی ئادەمیی نەبێ ، واتە وەك گوفتاری ئەو ئادەمی‌یانە وایە کە لە کۆنا ژیاون ، وە بە جادووەوە خەریك بوون •

لەپاش باسی «ولید»و کردەوەی ئنجا باسی ئەو سزایە ئەکات کە تووشی ئەبێ ، ئەفەرموێ ( سأصلیه سقر ) ئەیخەمە دۆزەخەوە

وَما اَدْراكَ ما سَقَرُ (٢٧) لا تُبْقى وَلا تَذَرُ (٢٨) لَوّاحَةٌ لِلْبَشَرِ (٢٩) عَلَيْها تِسْعَةَ عَشَرَ (٣٠)

تۆ چووزانیت کە دۆزەخ چی‌یە ؟ (٢٧) هیچ ناهێڵێتەوەو دەست هەڵناگرێ (٢٨) (بە یەکەم هاڵاو) پێست ڕەش دائەگیرسێنێ (٢٩) نۆزدەی بەسەرەوەن (٣٠)

(وما ادراك ما سقر) تۆ چووزانیت ئەی محمد «سقر» چی‌یە ؟ واتە کەس پێ ناگاتو هیچی لێ نازانێ مەگەر ئەوەندە نەبێ کە قورئان خۆی باسی لێ ئەکات ، ئەفەرموێ ( لا تبقی ) هیچ ناهێڵێتەوە لە پێستو ئێسكو گۆشتو چەوریی ، هەمووی دائەماڵێو ئەیسووتێنێو ئەی‌بڕژێنێو ئەی‌توێنێتەوە ، وە هەموو جارێك زیندوو ئەکرێتەوەو بەئاگری دۆزەخ ئەسووتێنرێتەوە ، وەکو ئەفەرموێ ( ولا تذر ) هیچ جارێك دەستی لێ هەڵناگرێ ، وە هەر ئەیسووتێنێو ئەیسووتێنێتەوە ( لواحة للبشر ) بە یەکەم هاڵاو پێستی ئەندام ڕەش دائەگیرسێنێ[1] ( علیها تسعة عشر ) نۆزدەی بەسەرەوەن ، ئیتر نازانین ئەمانە نۆزدە فریشتەن ، یانۆزدە دەستەن لە فریشتە ، یا نۆزدە تەحرن ، یا نۆزدە سەرۆکن کە هەریەکێکیان فریشتەی زۆری لەژێر دەستایە ، وەك دەرئەکەوێ لە

(١) یا مانای وایە دۆزەخ ئەوەندە بەگڕو کلپەیە ، هەر لەدوورەوە دەرئەکەوێ بۆ ئادەمیی ، وەك لە ئایەتێکی‌ترا ئەفەرموێ « وبرزت الجحیم لمن یری » .

وَمَا جَعَلْنَا اَصْحَابَ النَّارِ اِلاَّ مَلاَئِكَةً ،

هەر فریشتەمان گێڕاوە بە کاربەدەستی دۆزەخ ،

ئایەتی پاشوەوە کە ئەفەرموێ «وما یعلم جنود ربك الا هو»(١) .

بێبڕواکانی عەرەب لە ژمارەی ئەم فریشتانەدا کەوتبوونە مقۆمقۆ ، وە ئەیانووت : بۆچی نۆزدەن‌و زیاتر نین ، وە نۆزدە فریشتە چیین بەرامبەر بە هەموو دۆزەخی‌یان ، ئنجا لەڕووی سەرکۆنەوە قسەکانیان ئەباتە دواوە ئەفەرموێ ( وما جعلنا اصحاب النار الا ملائكة ) کاربەدەستانی دۆزەخمان گێڕاوە هەر بە فریشتە ، واتە ئەوانەی کە بەسەر دۆزەخەوەن ئادەمیی نین ، تا وەك ئێوە زەبوون‌و دڵنەرم بن ، بەڵکو هەموو فریشتەی بەهێزو دڵڕەقن ، ئەو فەرمانەی کە پێیان بدرێ خێرا ئەیکەن ، ئەگەر حەزئەکەن بپرسن لە گەلی «عاد»و «ثمود»و «لوط» تا بزانن کە تووشی چهێزێکی بێپایان بوون ، وە چۆن چۆنیی قڕبوون‌و لەناوچوون ، یا وولاتیان سەربەرەوژێر بوو بەسەریانا ، کەواتە تەماشای ژمارەی ئەم هێزانە مەکەن ، بەڵکو تەماشایان بکەن لەمڕووەوە کە لە یەکدەما چۆن وولاتێك ژێروژوور ئەکەن یا سەدهەزار میل چوارگۆشە ئەهێننە جونبووش‌و جووڵەجووڵی بوومەلەرزە .

تەماشاکەن تاقە دەستوورێکە لە هەموو جیهانا کە بارانی پێ

(١) واتە کەس ئەندازەی لەشکرانی پەروەردگاری تۆ نازانێ مەگەر خۆی نەبێ .

ئەبارێ کـە بە زبانی شەرع پێی ئەڵێن فریشتەی هەورو باران ، وە هەر تاقـە دەستوورێـکە کە بای پێ هەڵئەکـا کـە پێی ئەڵێن فریشتـەی با(۱) ، وە هـەر تاقـە دەستوورێـکە کە هاتن‌و کشانەوە «مد وجزر» ی دەریای پێ ئەبێ ، کـە پێی ئەڵێن فریشتەی دەریا ، هەروا بەم ڕەنگە ، کەوابوو هـەرچی بارانی جیهان هـەیە بەدرێژایی ساڵ ، وە هـەرچی باو گێژەڵووکە هـەیە ، وە هەرچی هـاتن‌و کشانەوەی دەریا هەیە لـە جیهانا هەمووی بە سێ‌جۆر هێز بەجێ‌دێ کـە پێی‌ئەڵێن فریشتـە ، ئنجا وەرە ئەبێ دەستوورو باوی دۆزەخ چۆن بێ کـە نۆزدە فریشتەی ئاوای بەسەرەوە بێ •

ئنجا باسی ئەوە ئەکـات کـە ئەم بێ‌بڕوایانە لەجیاتی ئەوەی کـە لەم ئایەتانەوە پەندو ئامۆژگاریی وەرگرن ، وە لە سزای دۆزەخ خۆیان بپارێزن ، کەچی بەپێچەوانەی ئەوە لـە پەندو ئامۆژگاری‌یەکەی دوور ئەکەونەوە ، وە بەشتی هیچ‌وپووچەوە خۆیان خەریك ئەکـەن ، وەك ئەمەی کـە ئەڵێن ئـەم فریشتانە بۆچی نۆزدەن‌و بیست نین ؟ لەکاتێکا کـە ئـەم جۆرە شتانە ئیش‌وکاری ڕۆژی دواین ، ئادەمیی لـە جیهانا تێیان‌ناگـەن بەڵـکو لێ ووردبوونەوەیان بەزیریی‌و بیری جیهانی‌یەوە

(۱) تەماشای شێخی سعدیی کەن کە لە گولستانا ئەڵـێ :

فریشتەئی کە وکیـل‌است بـر خزائن بـاد
چە غەم خورەد کە بمیرد چراغی پیرەزەنێ

واتە ئەو فریشتەیەی کە وەکیلە بەسەر خەزێنەی ( بـا )وە لـە جیهانا هیچ خەفەتێك ناخوات کە چرای پیرێژنێك بکوژێتەوە •

وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلاَّ فِتْنَةً لِلَّذِينَ كَفَرُوا ، لِيَسْتَيْقِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ ، وَيَزْدَادَ الَّذِينَ آمَنُوا إِيمَاناً ،

وە ژمارەی ئەو فریشتانەمان نەگێڕاوە مەگەر بە مایەی سەرلێشێوانی ئەوانەی کە بێ‌بڕوان ، تا خاوەن‌نامەکان بێ‌گومان بن ، وە بڕوادارەکان بڕواکەیان زۆرتر بێ ،

سەریان لێ ئەشێوێنێ‌و گومڕایان ئەکات ، وەکو ئەفەرموێ ( وما جعلنا عدتهم الا فتنة للذين كفروا ) .

زمارەی ئەو فریشتانەمان نەگێڕاوە مەگەر بە مایەی سەرلێشێوانی بێ‌بڕوایان ، واتە ئەم ژمارەیە بووە بە مایەی گومڕایی ئەوان ، نەك بۆ گومڕا کردنی ئەوان ، خوا ئەم ژمارەیەی فەرمووە ، واتە ئەم ژمارەیە بۆ بێ‌بڕوایان مایەی گومڕایی‌یە ، وە بۆ خاوەن‌نامەکان مایەی بڕوایانە ، چونکە شتی‌وا زۆرە لە تەورات‌و ئینجیلەکەیانا(١) ، وەکو ئەفەرموێ : ئەم ژمارەیە بۆ ئەوەیە ( ليستيقن الذين أوتوا الكتاب ) تا خاوەن نامەکان بێ‌گومان بن لە ڕاستیی قورئان ، کەوا ڕێکی نامەی ئەوانە ( ويزداد الذين آمنوا ايمانا ) وەتا بڕوادارەکانیش بڕواکەیان زیاد بکات کەوا ئەبینن خاوەن‌نامەکان بڕوای پێ ئەهێنن .

(١) وەك خەوەکەی « دانیال » لە ئەسفاری عهدی قدیم‌و خەوەکەی « یوحنا » لە ئەسفاری عهدی جدیدا .

وَلا يَرْتابَ الّذينَ أوتوا الكِتابَ وَالمُؤمِنونَ ، وَلِيَقولَ الّذينَ في قُلوبِهِمْ مَرَضٌ ، وَالكافِرونَ : ماذا أرادَ اللهُ بِهذا مَثَلاً ؟

وە هیچیان دوودڵ نەبن خاوەن‌نامەو مسلمانەکان ، وە ئاەوانەی کـە نەخۆشیی (ناپاکیی)یان لەدڵایەو بێ‌بڕواکان بڵێن : خوا چی ئەوێ بـەم ژمارەیە کە لە غەریبیدا ئەڵێی مەسەلە ؟

بڕوای خاوەن‌نامەکان بەم ژمارەیەو زیادبوونی بڕوای بڕوادارەکان پێی ، وەك لـە ئایەتی پێشووەوە دەرکەوت ، ئەمە ئەگەیەنێ کـە ئەم دوو دەستەیە هیچ گومانێکیان نییە ، کەچی لەگەڵ ئەمەشا فـەرمووی : ( ولا يرتاب الذين أوتوا الكتاب والمؤمنون ) تا دوودڵ نەبن خاوەن‌نامەو مسلمانەکان . ئەمە وەك ئەوە وایە کـە بە یەکێك بڵێیت « من قیتم لێنەو خۆشم ناوێت » دیارە یەکێك کـە قیتی لە یەکێك بێت ، خۆشیشی ناوێ، بەڵام باوە لە قسەو گوفت‌وگۆدا ئەم جۆرە شتانە ئەووترێن هەر بۆ بەهێز کردنەوەی مەبەستەکە .

هـەر بەم‌ڕەنگە ئەم فەرموودەی خوایە کـە ئەفەرموێ ( وليقول الـذين في قلوبهم مرض ) وە تا بڵێن ئـەوانەی کـە نەخۆشیی ناپاکیی‌یان لەدڵایە ( والكافرون ) وە بێ‌بڕواکان ( ماذا اراد الله بهذا مثلا ) خوا چی مەبەستە بەم‌ژمارەیە، کـە لە غەریبیدا ئەڵێی مەسەلە، واتـە پەندی

كَذلِكَ يُضِلُّ اللهُ مَنْ يَشاءُ ، وَيَهْدِي مَنْ يَشاءُ ،

خوا گومڕا ئەكات ئەوكەسەی كە بیەوێ ، وە ڕێنموونیی ئەكات بۆ ئەوكەسەی كە بیەوێ ،

پێشەبینانە(١) وە لەوانەیە كە دەماودەم بڕوا .

واتە ئەم قسەیەیان شوێنەوار « أثر » یێكە لە شوێنەوارانی تافیكردنەوەكەی پێشوو(٢) وە پێویست نەبوو بە ووتن ، بەلام كە ووتراوە هەر بۆ بەهێزكردنەوەی مەبەستەكەی پێشووە ، لەگەڵ ئەمیشە كە ئەیەوێ ڕەخنەیەكی ئەوانمان نیشان‌بدات ، هەروەك ئەیەوێ دەستەیەكی‌تریش ناوبەرێ لەگەڵ بێ‌بڕواكانا ، كە ناپاكانن (كذلك) وەك سەرلێشێوانی بێ‌بڕوایان‌و ناپاكان ، وە بێ‌گومانیی خاوەن‌نامەو مسلمانەكان ، كە دوانەكەی یەكەم لە گومڕایی‌و دوانەكەی دووهەم لە ڕێنموونی‌دان ، واتە ئاوا ( يضل الله من يشاء ) خوا گومڕا ئەكات هەركەسێك كە بیەوێ ( ويهدي من يشاء ) وەڕێ نموونیی ئەكات بۆ هەركەسێك كە بیەوێ ، بە وێنەی ئەو سەرلێشیوان‌و ڕێنموونی‌یەی كە بوون بە بەشی ئەو دوودەستەیەی كەناوبران .

خوا ئادەمیی دروست‌كردووە بە سەربەخۆ لە هەموو كاروبارێكیـ ، بەڕەنگێك كە هەر خۆی بەرپرسیار «مسئول» لە كردەوەی خۆی بەبێ‌ی هەموو دەستووری ئاسمان‌و زەویی ، لەبەرئەوە هەموو

(١) پەندی پێشیینان لەبەر جوانیی‌و غەریبی زۆر زوو بلاو ئەبێتەوەو ئەكەوێتە سەرزبانان وەك پەندی ( پارەی سپی بۆ ڕۆژی ڕەش ) .
(٢) كە فەرمووی : « وما جعلنا عدتهم الافتنة للذين كفروا » .

ئادەمی‌یەك ئەتوانێ بە پلەی باشیی‌و چاکیی‌دا سەرکەوێ تا ئەگاتە بەرزترین پایەی ئادەمێتی ، هەروەك ئەتوانێ بە دەرەی خرابی‌دا بچێتە خوارەوە ، تا ئەگاتە خوارترین پلەی جانەوەریی ، وەك لە گەلێ لاوە قورئان ئەفەرموێ « کل نفس بما کسبت رهینة »(١) وە ئەفەرموێ « ذلك بما قدمت یداك ، وان الله لیس بظلام للعبید »(٢) .

بەلێ لە هێندێ ئایەتا ئەگەیەنێ کە خوا دەستەیەك گومڕا ئەکاو دەستەیەك ڕێ‌نموونیی ئەکات ، وەك ئەم ئایەتی ئێرەیە ، بەلام ئەمە مانای وا نی‌یە کە خوا ئەویان بە زۆر ئەخاتە سەر ڕێی خراپەو ئەمیان ئەخاتە سەرڕێی چاکە ، چونکە ئەگەر وابووایە ناردنی پێغەمبەران‌و دروست‌کردنی بەهەشت‌و دۆزەخ بێ‌هوودە ئەبوو ، وە کەس لە پاشەڕۆژا شایستەی پاداش یا تۆلە نەئەبوو ، واتە ئەمە ئەگەر وابێ نە لەگەل دادی خوادا یەك‌ئەگەوێ‌و نەلەگەل فەلسەفەی تشریعی ئاسمانی‌دا یەك‌ئەگرێ ، بەلکو مانای وایە کە دەستوورو باوی خوا لەسەر ئەوەیە کە هێزی چاکەو خراپە بدات بەئادەمیی ، وە ڕێگای هەردوولای بۆ بکاتەوە ، بەجۆرێك کە بتوانێ بیانکات ئنجا ژیریی‌یەکی‌وای بداتێ کە بە سروشت چاکەو خراپەی لە یەك پێ جیابکاتەوە ، وە دوای ئەمانە پێغەمبەرێك‌و نامەیەکیشی بۆ بنێرێ کە هەردووکی بۆ باس‌بکات ، وە قازانج‌و سوودی چاکەو زەرەرو زیانی خراپەی بۆ ڕووناك بکاتەوە ، دوای ئەمانە ئیتر هەمووکەسێك ئەتوانێ

---

(١) واتە هەمووکەسێك بارمتەی کردەوەی خۆیەتی .
(٢) واتە چوونە دۆزەخی دۆزەخی‌یان بەهۆی کردەوەی خۆیانەوەیە ، وە خوا ستەم لە بەندەگان ناکات .

وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ ، وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكْرَى لِلْبَشَرِ (٣١)

وە کەس ئەندازەی لەشکرانی پەروەردگاری تۆ نازانێ مەگەر هەر ئەو ، وە ئەم ئایەتانە هەر پەندن بۆ ئادەمیی (٣١)

بەپێی ئەو بیروباوەڕەی کە وەری گرتووە لە خێزانو ناوچەو قوتابخانەو هاوڕێی خۆی ، کام ڕێیان ئەگرێ بیگرێ •

بەڵێ خوا لەپێش دروستکردنی ئادەمییدا ، ئەزانێ کە فیسارکەس کە هاتە جیهانەوە بە ئارەزووی خۆی ڕێی گومڕایی ، یا ڕێنموونیی ئەگرێ ، بەڵام ئەمزانینی خوایە سەربەخۆیی ئەو ئادەمیی‌یە ناگۆڕێ ، وە دەخلی لە کردەوەکەیا نی‌یە ، چونکە زانینەکەی خوا ، وەك زانینی زانایەکی ئاسمانیی وایە کە بڵێ بیست ڕۆژی تر مانگ یا ڕۆژ ئەگیرێ ، کە لەگەڵ گیرا ، گیرانەکەی بەهۆی سووڕانەوەی مانگ‌و زەویی‌یەوەیە ، نەك بەهۆی زانینی زانا ئاسمانیی‌یەکەوەیە ، چونکە زانین هەر زانینە ، با زانینی خواش بێ ( وما یعلم جنود ربك الا هو) وە کەس ئەندازەی لەشکرانی پەروەردگاری تۆ نازانێ تەنیا ئەو خۆی نەبێ ، واتە مأمورانی دۆزەخ هەرچەند بەدیمەن نۆزدە بن ، بەڵام بە هەزاران هەزار فریشتەیان لە ژێر دەستایە ( وما هی الا ذکری للبشر ) وە ئەم ئایەتانەی پێشووە کە باسی دۆزەخی کرد هەموو پەندن بۆ ئادەمیی •

★ ★ ★

كَلاَّ ! وَالْقَمَرِ ( ٣٢ )

نەء (پەشیمان بنەوە) ســـوێند بە مانگ (٣٢)

ئنجـــا سێ چـــەشمەندازی بوونەوەرمان بیرئەخـاتەوە ، لـــە چـــەشمەندازی مانگ‌و چـــەشمەندازی دوایی شـــەوو چـــەشمەندازی دەمەدەمی بەیان ، کـــە تاریکی شـــەوی بەرەبەرە تیا ڕووناك ئەبێتەوە ، ئنجا جیهان سپی ئەبێ‌و ســـوور هەڵئەگەڕێ‌و کزنگ ئەداو تیشکی ڕۆژ بڵاو ئەبێتەوە ، کـــە ئەمانە سێ چەشمەندازی زۆر دڵکەش‌و گرنگن ، کە هەریەکێکیان چـــەند چەشمەندازێکی جوان‌و دڵفرێنی لەناوایە ، ئەگـــەر قورئان بیرمان نەخاتەوە ، بەدرێژایی ساڵ بیرمان ناکەوێتەوە ، وە لێ‌ی ووردنابینەوە ، ئەفەرموێ (کلا) نەء پەشیمانبنەوە لـــە گاڵتەکردن بـــە دۆزەخ‌و بە ژمـارەی کاربەدەستانی (والقمر) سوێند بە مانگ کە پەیکی زەوی‌یە ، وە هەمیشە بەدەوریا ئەسوڕێتەوە ، وە ڕووناکیی لەڕۆژەوە وەرئەگرێ ، ئنجا دەمێ باریك‌و دەمێ نیوەو دەمێ پڕ ، لەپاشا دەست‌ئەکا بە بچووك‌بوونەوە تا دواشەو کـــە بەتەواوی ڕووی لای زەویی هـــەموو تاریك ئەبێ ، وە بەمڕەنـــگە ساڵ دابەش‌ئەکا بە دوانزە بەش ، وە هـــەر بەشێکی بە ٢٩ یا ٣٠ ڕۆژ کـــە ئەمـــە حسابێـــکی ڕێك‌وپێکە بۆ ئادەمیی ، جگە لـــە ڕووناکیی‌و چـــەشمەندازە جوانەکەی ، وە جـــگە لـــە قازانج‌و سوودی بۆ دانیشتووانی سەرزەویی .

بەڕاستی هەرکەسێك لە شەوێـــکی پاکی بێ گـــەردی مانـــگەشەوا دانیشێ‌و ووردبێتەوە لەو ڕووناکی‌یە نـــەرم‌و شـــل‌و لەســـەرخۆیە ، وەك

وَاللَّيْلِ إِذْ أَدْبَرَ (٣٣) وَالصُّبْحِ إِذَا أَسْفَرَ (٣٤) إِنَّهَا لَإِحْدَى الْكُبَرِ (٣٥) نَذِيراً لِلْبَشَرِ (٣٦) لِمَنْ شَاءَ مِنْكُمْ أَنْ يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ (٣٧)

---

وە بە شەو کە پشت هەڵئەکا (٣٣) وە بە دەمەدەمی بەیان کە ڕوون ئەبێتەوە (٣٤) بێ گومان دۆزەخ یەکێکە لە شتە سامدارە گەورەکان (٣٥) ترسێنەری ئادەمی‌یە (٣٦) بۆ ئەوکەسەی کە ئەیەوێ پێشکەوێ (لە چاکەدا) یادواکەوێ (٣٧)

---

حەمام بە نوور بکاو خۆی بە ڕووناکیی بشوا ، وە لەپێش چڵکی ئەنداما چڵکی دڵو دەروون لابیا وایە ، کێ هەیە ماوەیەك لەبەر تریفەی مانگەشەو دانیشێ ، وە لەگەڵیا بکەوێتە ڕازو نیازو قسەو گوفتوگۆ ، وە لەو میانەدا مانگ نەچرپێنێ بەگوێچکەیا ، وە لەبابەت خواو ڕێكوپێکیی دەستووری جیهانەوە دەرسێکی زۆر قووڵی نەداتێ ، وە پەندێکی کاری گەری نەدا بەگوێدا ( والليل اذ ادبر ) وە شەو کە پشت هەڵئەکاو جیهان بێدار ئەبێتەوە ، وە پێخەفی ڕەش لەسەر خۆی لائەدا ( والصبح اذا اسفر ) وە بە دەمەدەمی بەیان کە ڕووناك ئەبێتەوە ، وە بەدەم هەموو شتێکەوە پێ ئەکەنێ ، واتە سوێند بەمانە ( انها لاحدى الكبر ) دۆزەخ یەکێکە لە شتە سامناکە گەورەکان کە ئادەمیی ئەبێ خۆی لێ بپارێزێ ( نذيرا للبشر ) ترسێنەری ئادەمی‌یە ، نەخوازەلا ( لمن شاء منكم ان يتقدم ) بۆ ئەوکەسەی کە ئەیەوێ پێش‌کەوێ لە چاکەدا کە بەمە ڕزگاری ئەبێ ( او يتأخر ) یا پاشکەوێ بۆ کردنی خراپە کە تیا نەچێ .

كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ ( ٣٨ ) إِلَّا أَصْحَابَ الْيَمِينِ ( ٣٩ ) فِي جَنَّاتٍ يَتَسَاءَلُونَ ( ٤٠ ) عَنِ الْمُجْرِمِينَ ( ٤١ )

هەموو کەسێك بارمتەی کردەوەی خۆیەتی (٣٨) مەگەر یارانی دەستی ڕاست (٣٩) کە لە باخاتی بەهەشتا پرسیار لــە یەکتری ئەکەن (٤٠) لە گوناهباران (٤١)

ئـەم چـەند ئایـەتی پێشووە ئادەمیی ترساند ، ئیتـر کـەیفی خۆیەتی پێش ئەکـەوێ لـە چاکـەدا ، یا دوائەکەوێ بۆ خرابە ، بەڵام ئەبێ ئەمـە بزانێ ئەگـەر بۆ خـرابە دواکـەوت ڕزگـاربوونی نییە لەدەست خـوا ، وەکو ئەفـەرموێ ( کـل نفس بمـا کسبت رهینـة ) هەموو کەسێك بارمتەی کردەوەی خرابی خۆیەتی ( الا اصحاب الیمین ) مەگـەر یارانی دەستی ڕاست کـە چاکانن ، کـە ئەمـانە بـە خۆشیی ڕائەبوێرن ( فی جنات ) لە بەهەشتانی پاکو تەمیزی خۆشا ، ئنجـا ئـەم بەهەشتییانە ( یتساءلون عن المجرمین ) پرسیار لە یەکتریی ئەکەن لەو گوناهبارانەی کە لە دنیادا بڕوایان بە ئایەتانی قورئان نەبووە ، وە پشتیان هەڵکردووە لە ئایینی ئیسلام .

ئنجا کـە پرسیاریان بکردایە هـەر لە هاوڕێـکانی خۆیان لــە بەهەشتا وەڵامیان ئەدانەوە کـە لەمەپێش چاومان پێیان کەوتووەو لێمان

ماسَلَكَكُمْ في سَقَرَ (٤٢) قالُوا : لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ (٤٣) وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ الْمِسْكِينَ (٤٤) وكُنَّا نَخُوضُ مَعَ الْخائِضِينَ (٤٥) وكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ الدِّينِ (٤٦)

---

(هەر لە خۆیان وەڵام ئەداتەوە کە چاوەان پێیان کەوتووەو پێمانووتوون) چی ئێوەی دووچاری دۆزەخ کرد ؟ (٤٢) (ئەوانیش) ووتیان : ئێمە لە نوێژکەران نەبووین (٤٣) وە خواردەمەنیمان نەئەدا بە هەژاران (٤٤) وە ڕۆئەچووین (لە قسەی خراپەو بێشەرعیدا) لەگەڵ ئەوانەی کە ڕۆئەچوون (٤٥) وە بڕوامان بە ڕۆژی دوایی نەئەکرد (٤٦)

---

پرسیوونو پێمانووتوون ( ما سلككم في سقر ) چی ئێوەی خستۆتە دۆزەخەوە ، ئەوانیش وەڵامیان داوەتەوە (قالوا) ووتیان : ئەم سزایەمان لەبەر چوار شتە :

١ ـ ( لم نك من المصلين ) ئێمە لە نوێژکەران نەبووین ، واتە لە بڕواداران نەبووین ، چونکە بڕوامان بە نوێژ نەبوو .

٢ ـ ( ولم نك نطعم المسكين ) وە خواردەمەنیمان بە هەژاران نەئەداو دەستمان نەئەگرتن .

٣ ـ ( وكنا نخوض مع الخائضين ) وە تێکەڵی غەیبەتو بوختان ئەبووین لەگەڵ ئەوانەی کە تێکەڵی ئەم جۆرە شتانە ئەبوون .

٤ ـ ( وكنا نكذب بيوم الدين ) وە بڕوامان بە ڕۆژی دوایی نەئەکرد

حَتّىٰ أَتانا الْيَقِينُ (٤٧) فَما تَنْفَعُهُمْ شَفاعَةُ الشّافِعِينَ (٤٨) فَما لَهُمْ عَنِ التَّذْكِرَةِ مُعْرِضِينَ ؟ (٤٩) كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُسْتَنْفِرَةٌ (٥٠) فَرَّتْ مِنْ قَسْوَرَةٍ (٥١) بَلْ يُرِيدُ

---

تا مردین و بەچاودیمان (٤٧) ئیتر تکای تکاکەران هیچ قازانجێکیان پێ نادا (٤٨) ئیتر بۆ ڕوو وەرئەگێڕن لە ئامۆژگاریی (قورئان) ؟ (٤٩) ئەڵێی کەرەکێویی سڵن (٥٠) و لە شێر ، ڕەوئەکەن ؟ (٥١) بەڵکو هەموو

---

(حتی اتانا الیقین) تا مردین و بە چاوی خۆمان ئەم ڕۆژەمان دیی ، ئیتر نە تکاکەرێکیان هەیە تکایەکیان بۆ بکات ، نە ئەگەر تکاشیان بۆ بکەن تکاکە قازانجیان پێ ئەدات ، وەکو ئەفەرموێ (فما تنفعهم شفاعة الشافعین) ئیتر تکای تکاکەران هیچ جۆرە قازانجێکیان پێ نادات .

ئنجا لەکاتێکا کە تکای تکاکەران قازانج نەدا بە گوناهباران (فما لهم عن التذکرة معرضین) ئیتر بۆچی ڕوو وەرئەگێڕن لە قورئان کە بۆ پەندو ئامۆژگاریی ئەوان نێرراوەتە خوارەوە ، وە هەرچەند چاویان بە پێغەمبەر ئەکەوێ کە قورئانیان بەسەرا ئەخوێنێتەوەو ئامۆژگاری یان ئەکات ، سڵ ئەکەن و لاتروسکە ئەوێستن و نیی پێوە ئەنێن (کأنهم حمر مستنفرة ، فرت من قسورة) ئەڵێی کەرەکێویی سڵن ، کە لە شێر ، ڕەوئەکەن ، بەڵکو لەمەش سەیرترن ، وەکو ئەفەرموێ (بل یرید

كُلُّ امْرِئٍ مِنْهُمْ اَنْ يُؤْتى صُحُفاً مُنَشَّرَةً ( ٥٢ ) كلاَّ بَلْ لا يَخافونَ الْآخِرَةَ ( ٥٣ ) كَلاَّ ! اِنَّهُ تَذْكِرَةٌ ( ٥٤ )

---

یەکێك لەوان ئەیەوێ نامەهای کراوەی بۆ بنێررێ ( لە خواوە کە بڕوا بە محمد بێنێ ) (٥٢) با بەتەمای ئەمە نەبن بەڵکو هەر ناترسن لە ڕۆژی دوایی (٥٣) با پەشیمان بنەوە بەڕاستیی قورئان پەندو ئامۆژگاری‌یە (٥٤)

---

کل امریء منهم ) بەڵکو هەموو یەکێك لەوبێ‌بڕوایانە ئەیەوێ ( ان یؤتی صحفا منشرة ) نامەهای کراوەی لە خواوە بۆ بنێررێ ، وە فریشتەیەك بۆی بێنێ لەپێش ئەوەی مەرەکەبەکەی ووشك‌بێتەوەو کاغەزەکەی قەدکرێ ، وە لە کاغەزەکەدا نوسرابێ : « لەخواوە بۆ فلانی کوڕی فلان ، محمدی کوڕی عبدالله پێغەمبەرەو بڕوای پێ بێنە » .

(کلا) با پەشیمان بنەوە لەم جۆرە قسانە ، بەڵام بەڕاستیی ئەوان ئارەزووی پەندوەرگرتنیان نی‌یە ( بل لا یخافون الاخرة ) بەڵکو هەر ناترسن لە ڕۆژی دوایی تا خۆیان بۆ ئامادە بکەن‌و ئامۆژگاریی بۆ وەرگرن (کلا) با ئەوەندە بێ بڕوا نەبن بە ڕۆژی دوایی ، وە ئەوەندە پشت هەڵنەکەن ( انه تذکرة ) بێ‌گومان قورئان پەندو ئامۆژگاری‌یە ، خواپەرستی‌یان نیشان‌ئەدات ، وە جڵەوگیری‌یان ئەکات لە پەرستی

فَمَنْ شاءَ ذَكَرَهُ (٥٥) وَمَا يَذْكُرُونَ إِلاَّ أَنْ يَشاءَ اللهُ ،

---

ئنجا هەرکەسێك حەزئەکا با پەندی لێ وەرگرێ (٥٥) ( بەڵام لەبەر لاساریی خۆیان ) پەندی لێ وەرناگرن مەگەر خوا حەزبکات ( وە بەزۆر ناچاریان بکات ، کە ئەمەش باوی خوا نی‌یە ) ،

---

غەیری خوا ( فمن شاء ذکره ) ئنجا هەرکەسێك حەزئەکات با پەندو ئامۆژگاریی لە قورئان وەرگرێ ، وە دڵی بۆ بکاتەوە ، وە لە هەموو شەوو ڕۆژێکا ماوەیەکی کەم تەرخان بکات بۆ خوێندنەوەو لێووردبوونەوەی ، بەڵام ئەم بێ‌بڕوایانە دڵیان ڕەش‌بووەو پەردەی بەسەرا هاتووە ، ئارەزووی هیچ ناکەن گومڕایی نەبێ ، وەکو ئەفەرموێ ( وما یذکرون ) یادی فەرموودەکانی قورئان ناکەن بە یادێکی باش کە بەهرەی لێ وەرگرن ( الا ان یشاء الله ) مەگەر خوا حەزبکات ، واتە مەگەر بەزۆر ناچاریان بکات بۆ بڕوابێ‌کردنی ، کە ئەمەش باوی خوا نی‌یە ، بەڵکو باوی خوا لەسەر ئەوەیە کە ئادەمیی دروست بکات ، وە هۆش‌و گۆش‌و ژیریی‌و بیرو هەست‌و تێگەیشتنی بداتێ ، ئنجا پێغەمبەران‌و نامەی ئاسمانیی بۆ بنێرێ ، وە لەم نامانەدا ، وە لەسەر زمانی ئەم پێغەمبەرانە بە هەموو ڕەنگێك ئامۆژگاریی بکات ، وە بە هەموو زمانێك ڕێی ڕاست‌و چەوتی بۆ باس‌بکات ، وە لەسەر هەموو ڕێگاو گۆشەیەك گوڵۆپێکی هەزار نمرەیی بۆ داگیرسێنێ ، وە لەسەر هەموو

هُوَ اَهْلُ التَّقْوى وَاَهْلُ الْمَغْفِرَةِ (٥٦)

خوا شایستەی لێ ترسانە ، وە شایستەی خۆشبوونە (٥٦)

شوێنێکی بیمناك «خطر» گولۆپێکی سووری بۆ هەلواسێ ، تا هەموو کەسێك بە ئارەزووی خۆی ڕێی دواڕۆژی خۆی هەلبژیرێ ، وە بە پێی کردەوەی خۆی پاداش بدرێتەوە .

دەستووری قورئانە لەدوای هەموو هەڕەشەیەك چەند فەرموودەیەکی نەرمو شل بەکاردێنێ وەك لێرەدا کە ئەفەرموێ ( هو اهل التقوی ) خوا شایستەی ئەوەیە کە لێی بترسن ، وە لە دەستوورو باوی لانەدەن ، تا خۆتان بپارێزن لە سزای ئەو ، کەواتە بۆ لێی ناترسن ( واهل المغفرة ) وە ئەوە شایستەی خۆشبوون لەو کەسانەی کە لێی بترسنو خۆیان بپارێزن ، کەواتە بۆ تۆبە ناکەن ، وە کردەوەتان چاك ناکەن ؟

# سورة القيامة

بسم الله الرحمن الرحيم

لا اُقْسِمُ بِيَوْمِ الْقِيامَةِ (١) وَلا اُقْسِمُ بِالنَّفْسِ اللَّوّامَةِ (٢)

---

## سوورەی ( قیامە )ە

**بە ناوی خـوای بەخشندەی میهرەبان**

سوێند ناخۆم بە ڕۆژی دوایـی ( ١ ) وە سوێنـد ناخـۆم بـە نـەفسی سـەرزەنشت کەر ( لەسەر خراپە ) (٢)

---

## سوورەی ( قیامە )ە

**مەککی‌یە ، ٤٠ ئایەتە ، ١٦٥ ووتەیە ، ٦٥٢ پیتە**

بسم الله الرحمن الرحيم

**بە ناوی خـوای بەخشندەی میهرەبان**

سـەرەتای ئـەم سوورەتەی دامەزراند بە باسی زیندووبوونەوەی ڕۆژی دوایی ، کە خوا مەردومی تیـا زیندوو ئەکاتەوە بۆ لێ پرسینەوە ، وەسوێندی لەسەر ئەخوات هـەر بە ڕۆژی دوایی ، بۆئەوەی نیشان بدا کـە ئەوڕۆژە ڕۆژێـکی بێ گومانە ، ئەفەرموێ ( لا اقسم بيوم القيامـة ) سوێند ناخۆم بە ڕۆژی دوایی[1] ( ولا اقسم بالنفس اللوامة ) وە سوێند

(١) لە سوورەی « الحاقة »دا مەبەس لە « لا اقسم »مان لێـکدایەوە .

أَيَحْسَبُ الْإِنْسانُ أَنْ لَنْ نَجْمَعَ عِظامَهُ ؟ (٣) بَلَى ! قادِرِينَ عَلَى أَنْ نُسَوِّيَ بَنانَهُ (٤)

ئایا ئادەمیی وائەزانێ کە ئێسقانە (ڕزیوە)کانی یەك ناخەینەوە (٣) نەء وانییە ! بەتەواناین لەسەر ڕێکخستنەوەی (نەقشی) سەرپەنجەکانی(٤)

ناخۆم بەو نەفسە پاکەی کە لەسەر هەموو خراپەکردنێك سەرزەنشتێکی خۆی ئەکات •

مەبەس لەم نەفسە ، زەمیرو وجدانی پاكو زیندووە ، کە وەك پاسەوان وایە بۆ ئادەمیی ، بەڕاستی نەفسی پاك هەمیشە ئاگای لە هەڵەی خۆیەتی ، وە لەگەڵ هەموو گوناهێکیا پەشیمان ئەبێتەوە ، وە سەرکۆنەیەکی خۆی ئەکات ، وە ئەڵێ ئەم قسەیەم بۆ ووت ، یا ئەو کارەم بۆ کرد ، یا ئەو قسە باشەم بۆ نەکرد ، یا ئەو چاکەیەم بۆ لەدەست خۆم دا ، بەڵام نەفسی خراپ بە هیچ گوناهێك داناچڵەکێ ، وە لەسەر هیچ شتێك پەشیمان نابێتەوە ، واتە سوێند بەمانە هەموولایەکتان زیندوو ئەکرێنەوەو پرسیارتان لێ ئەکرێ ، وە پاداشی چاکەو خراپەتان ئەدرێتەوە ، وەك دەرئەکەوێ لەم ئایەتەوە کە ئەفەرموێ ( ایحسب الانسان أن لن نجمع عظامه ) ئایا وائەزانێ ئادەمیی کە دوای مردنو ڕزینی زیندووی ناکەینەوەو ئێسقانەکانی یەك ناخەینەوە (بلی) نەخێر ، کۆی ئەکەینەوە وەك جارانو ڕێکی ئەخەینەوە ، لەگەڵ ئەمیشە ( قادرین علی ان نسوی بنانه ) بەتەواناین کە سەری پەنجەکانی بە خۆیو هەموو نەقشەکانی یەوە دروست بکەینەوە ، کە نەقشی سەرپەنجەی هیچ کەسێك

بَلْ يُرِيدُ الْإِنْسَانُ لِيَفْجُرَ أَمَامَهُ ( ٥ )

بەڵکو ئادەمیی ئەیەوێ هەر بەدکاریی بکاتا ماوە (٥)

لـە هی کەسێکی‌تر ناچێ ، کـە ئەمـە گەورەترین بەڵـگەیە لەســەر گەورەیی‌و تەواناییی خـوا ، هـەروەك ئـەم ئایەتە گـەورەترین بەڵگەیە لەسـەر ئەوەی کـە قورئان فەرمووده‌ی خوایە ، ئەگینا پانزە چـەرخ لەمـەپێش محمدێـکی نەخوێندەوار لە شوێنێـکی دواکـەوتووی وەك مەککەدا ، ئەمەی لەکوێ زانیوە ؟

لـە ئایـەتی پێشوودا سـەرکۆنەی ئادەمیی کرد لەسەر بێ‌بڕوایی بە زیندووبوونەوە ، ئنجـا باسی چۆنێتی‌یەکی‌تری ئادەمیـی ئەکـات ، ئەفەرموێ ( بل یرید الانسان لیفجر امامه ) بەڵـکو ئادەمیی ئەیەوێ تـا مـاوە هـەر بەدکاریی بـکات ، وە لـە هیچ شتێك نەگەڕێتەوە ، واتـە ئادەمیی نابێ ئـەوەندە تێنەگەیشتوو بێ بڕوای بە دەسەڵاتی خـوا نەبێ لەسـەر زیندووکردنەوە ، بەڵام ئەیەوێ بـەم بێ‌بڕوایی‌یە خـۆی نەبەستێتەوە بەم بیرو باوەڕەوە ، بۆ ئەوەی تا مـاوە بەر بەرەڵڵا بێ ، وە هەرچی ئارەزوو بـکات بیکات .

ئەم ئادەمیی‌یە خراپە ئەیەوێ خۆی کەڕو کوێر بـکات ، وە هـەر چـەند یەکێك ئامۆژگاریی بـکات‌و بێ‌ترسێنێ بە سزای ڕۆژی دوایی

يَسْأَلُ : أَيَّانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ ؟ ( ٦ ) فَاذا بَرِقَ الْبَصَرُ
(٧) وخَسَفَ الْقَمَرُ ( ٨ ) وَجُمِعَ الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ ( ٩ )
يَقُولُ الْإِنْسانُ يَوْمَئِذٍ : أَيْنَ الْمَفَرُّ ؟ ( ١٠ ) كَلَّا !
لا وَزَرَ ( ١١ )

---

(بەگاڵتەوە) ئەپرسێ : کەیە ڕۆژی دوایی ؟ (٦) کاتێك کە چاو ئەبڵەق
بوو (٧)وە مانگ تاریك بوو (٨)وە ڕۆژو مانگ کۆکرانەوە (٩)
ئەوکاتە ئادەمیی ئەڵێ : بۆکوێ سەردەرکەم ؟ (١٠) هیچ پەنایەك نییە
(١١)

---

گاڵتەی پێ بکات ، وەکو ئەفەرموێ (یسأل) پرسیار ئەکات لە
ئامۆژگارەکەی بەگاڵتەوە ، ئەڵێ ( ایان یوم القیامة ) کەیە ئەو ڕۆژی
دوایییە ؟ ئنجا خوا ئەفەرموێ ( فاذا برق البصر ) کاتێك کە چاو ئەبڵەق
بوو لەبەر سامی ئەوڕۆژە ( وخسف القمر ) وە مانگ گیرا ، واتە لە
شوێنی خۆی ترازاو ڕووناکیی نەما ( وجمع الشمس والقمر ) وە ڕۆژو
مانگ کۆکرانەوە ، واتە هەڵوەرینو بوونەوە بە یەك کۆمەڵە وەك جاران
( یقول الانسان یومئذ این المفر ) ئادەمیی لەوڕۆژەدا ئەڵێ : لەکوێیە
دەربازگە ، واتە بۆکوێ بچم ، وە چۆن دەرباز بم ؟ ئنجا ئەوکاتە
~~بەهیچ~~ ، چونکە ( لا وزر ) هیچ پەنایەك نییە کە پەنای بۆ بەریت
ئەمە لەبارەی ئایەتی خواوە ئەفەرموێ ((کلا)) دەرچوون نییە

اِلى رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ اَلْمُسْتَقَرُّ (١٢) يُنَبَّؤُا الاِنْسانُ يَوْمَئِذٍ بِما قَدَّمَ وَاَخَّرَ (١٣) بَلِ الاِنْسانُ عَلى نَفْسِهِ بَصِيرَةٌ (١٤) وَلَوْ اَلْقى مَعاذِيرَهُ (١٥)

هەر لای پەروەردگاری تۆیە ئارامگا (١٢) لەوڕۆژەدا مەردوم ئاگادار ئەکرێ بەوەی کە پێشی خستووەو دوای خستووە ( لە چاکەو خراپە ) (١٣) بەڵکو ئادەمیی ئاگادارە بە حاڵی خۆی (١٤) با هەرچی برو بیانوویەکیشی هەیە هێنابێتی‌یەوە (١٥)

( الی ربك یومئذ المستقر ) لەوڕۆژەدا ئارامگا هەر لای پەروەردگاری تۆیە ، واتە بە فەرمانی ئەو مەردوم جێگای یا بەهەشتە یا دۆزەخ ، ئنجا لەوڕۆژەدا پەردە لەسەر کردەوەی مەردوم هەڵئەگیرێ ، وە ئاگادار ئەکرێ بەو شتانەی کە کردوویەتی ، وەکو ئەفەرموێ ( ینبأ الانسان یومئذ بما قدم واخر ) لەوڕۆژەدا مەردوم ئاگادار ئەکرێ بەو چاکەو خراپانەی کە لەپێش خۆیا ناردوویەتی ، وە بەوانەی کە بەدوویا ئەچێ .

ئنجا باسی ئەوە ئەکات کە مەردوم لە ڕۆژی دوایی‌دا خۆی ئەبێ بە شاهید لەسەر خۆی ، وە پێویست بە هیچی‌تر ناکات ، ئەفەرموێ ( بل الانسان علی نفسه بصیرة ) بەڵکو ئادەمیی ئاگادارە بە حاڵی خۆی ( ولو القی معاذیره ) با هەرچی بروبیانوویەکیشی هەیە هەمووی هێنابێتەوە .

ئەمڕۆ کە جیهانی ڕووناکە ، زانین گەیشتووە بەئەندازەیەك جێگا

لا تُحَرِّكْ بِهِ لِسانَكَ

زمانت مەجوولێنە بە خوێندنەوەی سرووش ،

دەستی دزو پیاوکوژ ، ئەخوێنرێتەوە بەسەر دارو دیوارو مێزو کەتۆرو دەرگاو مشتووی خەنجەرەوە ، وە جێگا پێی ئەدۆزرێتەوە ، وە ئەمانە هەموو شاهیدن لەسەر دزیەتی یا پیاوکوشتن یا هەر کارێکی‌تر ، ئنجا ئەبێ سبەینێ لە بارەگای خوادا چۆن بێ ؟ ئەگونجێ هەرچی قسەو گوفتو گۆمان هەیە هەمووی تۆمارکرابێ‌و مابێتەوە بەرێك‌وپێكی .

★ ★ ★

ئەگێرنەوە کە پێغەمبەر « دروودی خوای لێ بێ » لە سەرەتاوە زۆر ئەترسا لەوەی کە ئەو ئایەتانەی بە سرووش بۆی دێ‌و جبریل ئەیخوێنێتەوە بەسەریا ، بە یەکەمجار بۆی لەبەرنەکرێ ، ئەخوازەلا کە ئایەتەکەش درێژ بێ ، یا چەند ئایەتێك بێ پێکەوە ، جالەبەرئەوە پێغەمبەریش بۆئەوەی ئایەتەکەی بیر نەچێتەوە ، لەگەڵ جبریل دەستی‌ئەکرد بە خوێندنەوەی سرووشەکە ، ئەمیش دوابەدوای ئەو ، ووتەکانی یەك‌بەیەك ئەووتەوە ، ئنجا بەم‌بۆنەیەوە لە سوورەی « طه » دا بە ئایەتی « ولا تعجل بالقرآن من قبل ان یقضی الیك وحیه »(۱) جڵەوگیریی پێغەمبەر ئەکا لە پەلەکردن‌و ووتنەوەی ووتەی سرووش ، هەروەك لێرەشا جڵەوگیریی لێ ئەکات ئەفەرموێ ( لا تحرك به لسانك )

(۱) واتە تۆ ( ئەی پێغەمبەر ) پێش‌ئەوەی سرووشی قورئان بەتەواویی بە تۆ بگات ، پەلەپەل ( لە خوێندنەوەیان ) مەکە .

لِتَعْجَلَ بِهِ ( ١٦ ) انَّ عَلَيْنا جَمْعَهُ وَقُرآنَهُ ( ١٧ ) فَإِذا قَرَأْناهُ فَاتَّبِعْ قُرآنَهُ ( ١٨ )

---

تا پەلەی تیا بکەیت (١٦) بەڕاستیی ( بەپێی بەڵێنێك کە داومانە ) لەسەر ئێمەیە کۆکردنەوەی لە سنگتاو خوێندنەوەی (١٧). ئنجا کە قورئانمان بۆ خوێندیتەوە (بەهۆی جبریلەوە) پەیڕەویی خوێندنەوەی ئەو بکە(١٨)

---

زمان مەجووڵێنەوە بە خوێندنەوەی ئەو قورئانەی کە بە سرووش بۆت دێ ( لتعجل به ) بۆ ئەوەی بەپەلە وەری گریت ، ئنجا بەڵگە لەسەر ئەم جڵەوگیری یە ئەهێنێتەوە ئەفەرموێ ( ان علینا جمعه ) چونکە بەڕاستیی بەڵێنێکە لەسەر ئێمە کۆکردنەوەی قورئان لە سنگی تۆدا ( وقرآنه ) وە خوێندنەوەی ، واتە یارمەتیدانت بۆ خوێندنەوەیو زانینیو لەبەرکردنی بەڕەنگێك کە لەبیرت نەچێتەوە ، بەڵێنێکە پێمان داویت لە سوورەی «اعلی» دا بە ئایەتی «سنقرئك فلا تنسى»[1] . (فاذا قرأناه) ئنجا کاتێك کە قورئانمان بۆ خوێندیتەوە بەهۆی جبریلەوە ، گوێی بۆ بگرە تا لێ ئەبێتەوە ، ئەوکاتە ( فاتبع قرآنه ) پەیڕەویی خوێندنەوەی ئەو بکە ، واتە بی لێرەوە وەك ئەو .

پێغەمبەر «درووودی خوای لێ بێ» هەروەك لە سەرەتاوە چاوی ئەبڕی یە دەمی جبریلو وەهەرچی ئەخوێندەوە خێرا ئەمیش بەپەلە ئەیخوێندەوە ، دەمو زمانی ئەجووڵانەوە تا جڵەوگیریی کرا لێی ،

---

(١) واتە قورئانت بەسەرا ئەخوێنینەوە، وەتۆش لەبیرت ناچێتەوە.

ثُمَّ اِنَّ عَلَیْنا بَیانَهُ ( ١٩ )

لەپاشا ڕوونکردنەوەی لەسەر ئێمەیە (١٩)

هەروا بە چاوێکی پڕ لە سەرسامیی‌و پرسیاریشەوە تەماشای چاوی جبریلی ئەکرد کە تێ‌بگات لە مەبەستەکانی ، ئنجا خوا لەمەش جڵەوگیریی کرد ، وە بەڵێنی پێدا کە هەرشتێکت نەزانی لە مەبەستەکانی ئێمە پێت‌ئەڵێین ، دوای‌ئەوەی کە ئایەتەکانت هاتەبەر ، وەکو ئەفەرموێ ( ثم ان علینا بیانه ) لەدواییدا ئێمە بۆت ڕاڤە ئەکەین .

دوای ئەم ئایەتە ئیتر پێغەمبەر کە سرووشی بۆ بهاتایە ، سەری دائەخست‌و گوێی بۆ ئەگرت تا لێ‌ئەبووەوە ، ئنجا لە بەر خۆیەوە دەوری ئەکردەوە ، کە تەماشای ئەکرد ، هەمووی لەدڵیا چەسپ بووە .

بەڵام پێشەوای بەناوبانگ «قفال» لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ئەڵێ : ئەم ئایەتە پەیوەندیی هەیە بە ئایەتەکانی پێشووەوە کە باسی ئەو بێ‌بڕوایەی کرد کە ئەیویست تا ماوە هەر بەدکاریی بکات ، وە فەرمووی « بل یرید الانسان لیفجر امامه » واتە ئادەمیی ئەیەوێ تا ماوە بەدکاریی بکات . وە ئەگەر یەکێك بی‌ترساندایە بە ڕۆژی زیندووبوونەوە ، بەگاڵتەوە ئەی‌ووت : ئەوڕۆژە کەی ئەبێت ؟ تا لووت‌و بزووت تووشی ئەبێ ، ئەوساکە تەماشا ئەکات ڕاستەو جێی دەرچوونی نی‌یە ، تەنیا بۆ لای خوا نەبێت ، وە هەر چیشی پێش‌خستبێ لە چاکە یا لە خراپە هەمووی دێتەڕێی ، وە هەرچی کردبێ بە نامەی کرداری ئەیدەنە دەستی ، وە پێی‌ئەڵێن : « اقرأ کتابك کفی بنفسك الیوم علیك

حسیبا » واتە نامەی کردارت بخوێنەرەوە ، ئەمڕۆ هەر خۆت بەسییت کە کردەوەکانت لەسەر بژمێرێ ، ئنجا کە دەستی کرد بە خوێندنەوەی نامەکەی ، هەرچی پێ ناخۆش بێو بە دڵی نەبێ خێرا بەسەریا تێ ئەپەڕێ بۆئەوەی زۆر زوو ڕزگاری بێ لێی ، ئنجا لەودەمەدا پێی ئەووترێ « لا تحرك به لسانك » پەلەپەل مەکەو زمانت هەڵمەسووڕێنە بە خوێندنەوەی کردەوەکانت « لتعجل به » بۆئەوەی کە تاڵووکەو دەستوبردی لێ بکەیتو خۆتی لێ ڕزگار بکەیت « ان علینا جمعە وقرآنە » بەپێی بەڵێنێك کە داومانە ، لەسەر ئێمەیە کۆکردنەوەی کردەوەکانتو خوێندنەوەی « فاذا قرأناه » ئنجا کە خوێندمانەوە بەسەرتا « فاتبع قرآنە » دوای خوێندنەوەکانی بکەوەو دانبێ بە گوناهەکانتا « ثم ان علینا بیانە » لەپاشا ڕوونکردنەوەی ئەو کردەوانەو تۆڵە بۆدانانیان لەسەر ئێمەیە .

ئنجا بەمپێیە ڕاناو «ضمیر»ی «بە»و ئەوانەی کە بەدوایا دێن هەموو ئەچنەوە بۆ کردەوەی ئادەمیی ، کە لەناو نامەکەیا نوسراوون ، وە فەرموودەی « کلا بل تحبون العاجلة » گوفت وگۆیە لەگەڵ ئەو بێ ڕوایەی کە بەدرێژایی تەمەنی ئەیەوێ هەر خراپە بکات ، وە جڵەوگیریی ئەویشو وێنەکانێتی لەو چۆنێتییەی کە تیاینی لە خۆشەویستی دنیای بێوەفا ، وە بەمڕەنگە باسەکە ئەمێنێتەوە لە یەك جوار چێوەدا ، وە شێوەکەش ئەمێنێتەوە بە پەیوەندیی لەناوا .

ئەمە تەفسیری ئایەتەکەیە بە هەر دوو ماناکە ، بەڵام من بەش بەحاڵی خۆم ماناکەی «قفال»م پێ باشترە ، چونکە مەبەست لە جڵەوگیریی پێغەمبەر لە پەلەپەل کردنو دەمجووڵانەوە لەکاتی سرووشا ،

كَلاَّ بَلْ تُحِبُّونَ الْعَاجِلَةَ ( ٢٠ )

دەست هەڵگرن ( ئەی ئادەمیی لە پەلەكردن ) بەڵكو حەزتان لە دنیایە(٢٠)

بە یەكجار پێكدێ وەك لــە سوورەی « طه » دا كرا ، ئیتر پێویست بــە دووبارە كردنەوە ناكات لە دوو سوورەتــا ، چونــكە ئەم باسە باسێــكی ڕەووشت و خوویی نی یە ، تا لە چــەند شوێنا بووترێتەوە ، هەر شوێنــەی بەجۆرێك بەڵام من لەگەڵ ئەمیشە هەردوو ماناكەیم نووسیی •

لەپێش ئــەم باسەدا ئەوەبوو باسی ئەوانەی كرد كە بڕوایان بــە ڕۆژی دوایی نەبوو ، وە بەتەوسەوە ئەیانووت : « أیان یوم القیامة » ئنجا لەدوای ئەوەی كــە نیشانی پێغەمبەر درا كە لە كاتی سرووشا چۆن بێ و چی بــكات ، وە ویستی بچێتەوە سەر باسەكەی پێشووی خۆی ، هــات بەجۆرێك دایمــەزراند ، ئەوی كــە پێغەمبەری لێ جڵەوگیر كرابوو ، ئەویشی تێوەپێچا فەرمووی (كلا) دەستهەڵگرن ـ ئەی ئادەمیی ـ لــە پەلەپەل كردن لــە كاروبارتاناو هەڵپەكردن بۆ گەیشتن بەمەبەستان ، وە ئەمــە بووە بە ڕەووشت بۆ هەموولایەكتان ، تەنانەت بۆ ئەوەشتان كە لە هەمووتان كامڵترو چاكترو بەرزترە ، كە پێغەمبەرە ، كــە ئەویش لــە هێندێ كاتا بێبەش نی یە لە پەلەپەل كردن •

تێوە ئەی ئادەمیی كــە باوەڕناكەن بە سرووشی خوا ، لەبەر ئــەوە نی یە كــە ڕاستپەرستن وەك خۆتان ئەڵێن ( بل تحبون العاجلة ) بەڵــكو حەزتان لە دنیــای بێبەقایە ، وە هــەر چــاوتان لە خۆشیی و ڕابواردنی ئەوەوەیە ، وە هەر خۆشەویستی دنیاشە سەرچاوەی هەموو خراپەیەك ، وە هــەر ئــەوە كــە ڕۆژی دوایی تان لەبیرئەباتەوە ، وەكو ئەفــەرموێ

وَتَذَرُونَ الْآخِرَةَ ( ٢١ )

وە دەست لە ڕۆژی دوایی هەڵئەگرن (٢١)

( وتذرون الاخـرة ) وە دەست لـــە ڕۆژی دوایی هـــەڵئەگرن ، وە پشتئەکەنە هەموو کردەوەیەکی باش ، ئەمانەش هەمووی لەبەرئەوەیە کـە بە سرووشت پەلەتان تیایە •

تۆش ـ ئەی پێغەمبەر ـ هەرچەند پەلەئەکەیت لەکاتی وەرگرتنی سرووشا بە ووتنەوەی ووتەکانی ، وە بەهۆی پەلەتەوە بەڵێنی خوا کـــە پێی داویت بە ئاگاداریی قورئانو ، تەواو کردنیو قورس بەستنی لـە سنگتا ، بە ڕەنگێك کە هەرگیز لەبیرت نەچێتەوە ـ فەرامۆش ئەکەیت ، وە تۆش وەك دەستەی یەکـەم پەلەپەل کەریت ، بەڵام پەلەی بێبڕواکان لە خـــراپەو کـاری ناپەسەندایە ، وە پەلەی تۆ ـ ئەی پێغەمبەر ـ لـە چاکـەو کاری پەسەندایە ، لەگەڵ ئەمیشە پێغەمبەر جڵەوگیر کرا لـــە پەلە ، وە ئاگادارکرا بە دڵنیایی لە پاشەڕۆژا کە بەئارەزووی دڵی ئـــەو نەبێت •

ئەوی باسمانکرد لە تەفسیری ئایەتەکەدا ڕووبەڕووی بێبڕواکان، ئـەوە وەرئەگیرێ لـە دیمەنی ئایەتەکـــە بەئاشکرا ، بەڵام ئـــەوی ڕووبەڕووی پێغەمبـــەر باسمانکرد ، ئەوە وەرئەگیرێ لـــەلاوە ، وە ئایەتەکە لەودیو پەردەوە ئەیگەیەنێ •

لەدوای ئەوەی کـە فەرمووی ئادەمیی حەزی لە خۆشیی دنیـایە ، وە باوی ئەدا بەســـەر ڕۆژی دواییو خۆشیی ئێجگاریی ئەوا ، ئنجا باسی

وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ ( ٢٢ ) إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ( ٢٣ ) وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ بَاسِرَةٌ ( ٢٤ ) تَظُنُّ أَنْ يُفْعَلَ بِهَا فَاقِرَةٌ ( ٢٥ )

زۆر ڕوخسار لەوڕۆژەدا پاراوە (٢٢) تەماشای خوای خۆی ئەکات (٢٣) وە زۆر ڕوخساریش لەو ڕۆژەدا ترش‌و تاڵە (٢٤) ئەزانن کە سزای پشت‌شکێن ئەدرێن (٢٥)

ئەوە ئەکات کە مەردوم لەوڕۆژەدا ئەبن بە دوو دەستە : چاکان‌و خراپان ، ئەفەرموێ ( وجوه يومئذ ناضره ) زۆر ڕوخسار لەو ڕۆژەدا پاراوو تابان‌و شادمانە بەهۆی ئەوەی کە بە بەری کردەوەی جوانی خۆی ئەگات ( الی ربها ناظره) تەماشای پەروەردگاری خۆی ئەکات ( ووجوه يومئذ باسرة ) وە زۆر ڕوخساریش لەوڕۆژەدا تاڵ‌و ترش‌و تاریکە ، چونکە ( تظن ان يفعل بها فاقرة ) ئەو خاوەن ڕوخسارانە وائەزانن کە بەڵایەکی وا قورسیان بەسەرا ئەهێنرێ کە موورەغەی پشتیان بشکێنێ بەهۆی ئەو گوناهانەی کە لە جیهانا کردوویانە .

★ ★ ★

بە ئایەتی « كلا بل تحبون العاجلة » جڵەوگیریی کرد لە خۆشەویستی دنیاو باودانی بەسەر ڕۆژی دوایی‌دا ، وە باسی بەشی چاکان‌و خراپانی کرد لەوڕۆژەدا ، ئێستا دووبارە جڵەوگیریی ئەکاتەوە لە ئارەزووی دنیا ، بە باسێکی مردن ، واتە ئەگەر ڕۆژی دوایی بە دوور ئەزانن ، خۆ مردن دوور نی‌یە ، وە ئەزانن کە هەموو ئەمرن ، وە تووشی ئەو گیانەڵاوو جەناگە کوتانە ئەبن ، کە مردنیش دەرگای

کَلاّ ! اِذا بَلَغَتِ التَّراقِیَ ( ٢٦ ) وَقِیلَ : مَنْ راقٍ ؟ ( ٢٧ ) وَظَنَّ اَنَّهُ الْفِراقُ ( ٢٨ ) وَالْتَفَّتِ السّاقُ بِالسّاقِ ( ٢٩ ) اِلی رَبِّكَ یَوْمَئِذٍ الْمَساقُ ( ٣٠ )

بەشیمان بنەوە ! کاتێك کە گیان گەیشتە قوڕقوڕاگە (٢٦)وە ووترا : کێیە چارەکەر ؟ (٢٧) وە ( نەخۆشەکە ) زانی ئەوە(ی تووشی بووە مردنو ) جیابوونەوەیە (٢٨) وە قاچ لە قاچ ئاڵا (٢٩) بۆلای پەروەردگارتە ڕاپێچکردن لەوڕۆژەدا (٣٠)

ڕۆژی دواییە ، فەرمووی (کلا) دەستهەڵگرن لە خۆشەویستی دنیاو باودانی بەسەر ڕۆژی دواییدا ، وە بیربکەنەوە لەو تەنگانەیەی کە دێ بەسەرتانا ( اذا بلغت التراقی ) کاتێك کە گیان گەیشتە قوڕقوڕاگە ، وە کەس‌وکارو خزمو خوێشی نەخۆش بەدەوریا دەستە ئەژنۆ دائیشتن ، وە هیچ هیوایەك نەما نوشتەو ئەفسون نەبێ ، وەکو ئەفەرموێ ( وقیل من راق ) ووترا لەلایەن کەس‌وکاری نەخۆشەوە : کێی واهەیە نوشتەیەکی بۆ بکات ( وظن انه الفراق ) وە نەخۆشەکە زانی کە ئەوەی تووشی بووە مردنو جیا بوونەوەیەتی لە ماڵو منداڵو ئەو دارایی‌یەی کە هەیەتی ( والتفت الساق بالساق ) وە قاچ لە قاچ ئاڵا ، هێزی جووڵانەوەی نەما .

کاتێك کە مردن هاتو فڕانتی لەناو کەس‌وکارتا ، ئەوکاتە ئێ ئەگەیت کە بۆ کوێت ئەبات؟ ( الی ربك یومئذ المساق ) بۆلای پەروەردگارتە ڕاپێچکردن لەوڕۆژەدا بۆ لێپرسینەوە ، لەکاتێکا کە

فَلا صَدَّقَ وَلا صَلّی ( ٣١ ) وَلٰكِنْ كَذَّبَ وَتَوَلّی ( ٣٢ ) ثُمَّ ذَهَبَ اِلی اَهْلِهِ يَتَمَطّی ( ٣٣ ) اَوْلی لَكَ فَاَوْلی ( ٣٤ )

نە بڕوای هێناو نە پاڕایەوە (٣١) بەڵکو ئاینی بەدرۆ ئەزانیو پشتی تێئەکرد (٣٢) لەپاشا بە لەنجەو لارەوە چووەوە بۆ لای ماڵو منالی (٣٣) وای بۆ تۆ ( ئادەمیی بێبڕوا ) ئنجا وای بۆ تۆ (٣٤)

هەرچی چاکە بێ نییەتی ، وەکو ئەفەرموێ ( فلا صدق ) نە بڕوای هێنا بە نامەی خواو پێغەمبەرانی ( ولا صلی ) وە نە ڕووی‌کردە خواو تەوبەی کردوو پاڕایەوە ( ولکن کذب ) بەڵکو بڕوای بە زیندوو بوونەوە نەکرد ، هەروەك بڕوای بە دینی خوا نەبوو ، وە ئەمانەی هەموو بەدرۆ ئەزانی ( وتولی ) وە پشتی تێ‌کرد ( ثم ذهب الی اهلە یتمطی ) لەپاشا بە فیزو دەعیەو لەنجەولارەوە گەڕایەوە بۆلای کەس‌وکاری .

ئەگێڕنەوە کە مەبەست بەم ئایەتە « ابو جهل » ە کە ناوبەناو چۆتە لای پێغەمبەر ، وە گوێی ئەگرت لە قورئان خوێندنەکەی ، لەپاشا دەستی‌ئەکرد بە گاڵتەکردن بە خۆیو بە قورئانەکەی ، ئنجا بەدەعیەو دەمارەوە ئەگەڕایەوە ، چونکە لە خزمەت پێغەمبەرا بێ‌ئەدەبیی کردووە ، خۆی بە درۆزنو قورئانەکەی بە درۆ زانیوە .

لەدوای باسی ئەو بێ‌بڕوای بەدەعیەو دەمارە ، وە لەدوای باسی کردەوەی ناشرینی ، ئنجا ڕووبەڕوو پێی‌ئەڵێ ( اولی لك فأولی ) وای

ثُـمَّ اَوْلٰى لَكَ فَاَوْلٰى ( ٣٥ )   اَيَحْسَبُ الْاِنْسَانُ اَنْ يُتْرَكَ سُدىً ؟ (٣٦ )

دووبارە وای بۆ تۆ ، ئنجا وای بۆ تۆ (٣٥) ئایا وائـەزانێ ئادەمی کـە هەروا بەرەڵلا ئەکرێ ( و پشت گوێ ئەخرێ) (٣٦)

بۆ تۆ ئـەی ئادەمیی بێبڕوا ، ئنجـا وای بۆ تۆ ( ثم اولی لك فاولی ) دووبارە وای بۆ تۆ ، ئنجا وای بۆ تۆ ، واتە نزیکە تووشی ڕۆژی ڕەشی خۆت ببیت ، پێش ئەوەی سزای خوا یەخەگیرت بێ •

ئەگێڕنەوە کـە ڕۆژێ پێغەمبـەر بە « ابو جهل » ئەگات وە یەخەی ئەگرێو ڕای ئـەوەشێنێو پێیئەڵێ : « اولی لك فأولی ، ثـم اولی لك فأولی » ئەبوجهل ئەڵێ : ئەوە هەڕەشەم لێ ئەکەیت ئەی محمد ؟ بەخـوا نە خۆتو نە خواکەت ناتوانن هیچم لێ بکەن ، وە لە من گەورەتر نییە لەم شوێنەدا ، دوای ئەوە ئەوەندەی پێنەچوو ئەبوجهل کوژرا لە جەنگی «بدر» دا ، وە فڕێدرایە چاڵەقووتەیەکەوەو داپۆشرا •

★ ★ ★

دوای ئەو هەڕەشە بەتینەی کـە بە ئایەتی پێشوو کردیی ، ئنجـا بەم ئایەتە نەرمو شلە ئاووڕێك بە ئادەمیی ئەداتەوە بۆ ئەو میهرەبانییەی کـە خوا کردوویەتی لەگەڵیا لە یەکەم ڕۆژی پەیدا بوونییەوە لە سکی دایکیا تا ڕۆژی هاتنە جیهانی ، ئەفەرموێ ( ایحب الانسان ان یترك سدی) ئایا وائەزانێ ئادەمیی کـە هەر وا بەرەڵلا ئەکرێو پشت گوێ ئەخرێ

اَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِنْ مَنِيٍّ يُمْنَى (٣٧) ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّى (٣٨)

ئایا دڵۆپێك نەبوو لە ئاوێکی هەڵڕژاو (٣٧) لەپاشا بوو بە خوێن پارەیەك ئنجا دروستی کردو ڕێکی خست (٣٨)

وەك گیانلەبەرانی تر ، بێئەوەی لە جیهانا پێغەمبەرێکی بۆ بنێررێ بە چەند سرووش و دەستوورێکەوە ، تا ڕێنموونیی بکات بۆ ئەو پایە بەرزەی کە خوا پێی سپاردووە ، وە بێئەوەی دوای مردن زیندوو بکرێتەوە بۆ لێپرسینەوەو پاداش دانەوە ، نەء هیچ وەخت ئادەمیی نابێ وابزانێ ، چونکە چاوی تێوەیە کە خوا وەك لەلایەکی میهرەبان دەستی بە پشتییەوەیە ، لەکاتێکەوە کە دڵۆپە ئاوێکی بێوێنەی بێژیریی و بیرو دەسەڵات بووە ، تا ئەبێ بە مرۆڤێکی ژیری بە بیر ، وەك ئەفەرموێ ( الم يك نطفة من مني يمنى ) ئایا دڵۆپێك نەبوو لە ئاوێکی هەڵڕژاو ، وە تاقە بۆشەك «خلیە»یێك نەبوو کە دوای متوربەبوونی خێرا ڕووی کردە مناڵدان ( ثم كان علقة ) لەپاشا بوو بە خوێنپارەیەکی پچووك بەقەد زەرروویەك ، ئنجا چوو نووسا بە دیواری مناڵدانەوە ، تا خوێن وەرگرێ و بژیی ، کێ ئەم جووڵانو ڕۆینەی خستە دڵییەوە ؟ کێ ئەم هێزو تەواناییەی دایی ؟ کێ ئەم ڕێگایەی نیشاندا ؟.

لەپاشا کێ کردیی بە مناڵێکی ڕێك و پێك لە سکی دایکیا ؟ وەکو ئەفەرموێ ( فخلق فسوى ) ئنجا ئەندامی لێ دروست کردو ڕێکی خست ،

فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ : الذَّكَرَ وَالْأُنْثى ؟ ( ٣٩ )
أَلَيْسَ ذلِكَ بِقادِرٍ عَلى أَنْ يُحْيِيَ الْمَوْتى ؟ (٤٠)

ئنجا لەو ئاوە دوو جۆری دروستکرد ، نێرو مێ ( ٣٩ )
ئایا ئەو خوایە توانا نی‌یە لەسەر ئەوەی کە مردووان زیندوو بکاتەوە ؟(٤٠)

وە هەر ئەندامەی بەقەد خۆی ، وە بە ئەندازەی خۆی بە بێ‌زیادوکەم ( فجعل منه الزوجین )[1] ئنجا لەو ئاوە هەڵرژاوە دوو جۆری لێ دروستکرد ( الذکر والانثی ) نێرو مێ •

واتە ئەم بۆشەکە چۆن بوو بە نێرو ئەو بۆشەکە چۆن بوو بە مێ ، وە خۆیان چ‌دەسەڵاتێکیان هەیە لەم بوونەدا ؟! کەواتە بەناچاریی ئەبێ بڵێین بەنجەیەکی پەنهانیی هەیە کە ئەم بۆشەکانە ئەبابەڕێوە لە یەکەم قۆناغی بوونیانەوە تا دواقۆناغیان •

ئەمە بناغەی ئادەمیی بوو کە باس‌کرا ، ئنجا با بەئینسافەوە وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە کەخوا لێی ئەکات و ئەفەرموێ ( الیس ذلك بقادر علی ان یحیی الموتی ) ئایا ئەو خوایەی کە ئەمە کردارو دەسەڵاتێتی ، تەوانا نی‌یە لەسەر ئەوەی کە مردووان زیندوو بکاتەوە ؟!

بەڵێ بەتەوانایە لەسەری •

بەڵێ زیندووی ئەکاتەوە •

بەڵێ هیچ جیاوازی‌یەك نی‌یە لە ناوەندی دروستکردنی یەکەم و دووهەما •

(١) عەرەب بە ژن و مێردێك ئەڵێن : زوجین : هەروەك بە مێرد ئەڵێن : زوج وە بە ژن ئەڵێن : زوج •

# سورة الانسان

## بسم الله الرحمن الرحيم

هَلْ اَتى عَلَى الْاِنْسانِ حينٌ مِنَ الدَّهْرِ ، لَمْ يَكُنْ شَيْئاً مَذْكُوراً ( ١ )

---

# سوورەی ( ئینسان )ە

**بە ناوی خـوای بەخشندەی میهرەبان**

بێ گومان ماوەیەکی تێجگار زۆر لە ڕۆزگار هات بەسەر ئادەمیی‌دا کـە شتێـکی وانەبوو ناوببرێ (١)

---

# سوورەی ( ئینسان )ە

**مەککی‌یە ، ٣١ ئایەتە ، ٢٤٢ ووتەیە ، ١٠٥٢ پیتە**

## بسم الله الرحمن الرحيم

**بە ناوی خـوای بەخشندەی میهرەبان**

ئـەم سوورەتە هـەمووی بانـگ‌کردنێکی نەرم‌وشلە لە خواوە بۆ ئادەمیی بە سێ پلە ، کـە فەرمانبەریی خوا بـکات‌و پەنای بۆ بەرێ •

یەکەم ئەدا بە گوێچکەی دڵیا کـە ئادەمیی لەپێش بوونیـا لـەکوێ بووە ؟ وە کێ هێناویەتە ڕووی کار ؟ ئەفەرموێ ( هل اتى على الانسان ) بێ گومان هاتووە بەسەر ئادەمی‌دا ( حين من الدهر ) ماوەیەك لە ڕۆزگار ( لم يكن شيئا مذكورا ) کە ئەو ئادەمی‌یە لەو ماوەیەدا شتێکی وا نەبووە

اِنّا خَلَقْنا الْاِنْسانَ مِنْ نُطْفَةٍ اَمْشاجٍ

بەراستیی ئێمە ئادەمیمان دروستکرد لە دڵۆپێك ئاوی تێکەڵ لەگەڵێ توخم

کە ناوبرێ ، بەڵکو شتێکی وا بێ‌نموود بووە کە کەس بیری بەلایا نەچووە ، ئنجا سا یا میکرۆبێك بووە لە پشتی باوکیا ، وە یا شتێکی پەراگەندە بووە لەناو توخمەکانی ئەم بوونەوەرەدا ، وە ئەگەر مەبەس لە ئادەمیی تەحر «نوع»ە ئەویش ڕۆژێك بووە کە شتێکی وا نەبووە کە ناوبرێ ، بەڵکو شتێکی نادیاری داپۆشراوی وا بووە کە کەس ئاگای لێ نەبووە تەنیا ئەو خوایە نەبێ کە ویستوویەتی دروستی بکات .

خوا بەم ئایەتە ئاووڕێك ئەداتەوە بە ئادەمیی بۆ دواوە ، واتە بۆ پێش پەیدابوونی لە جیهانا ، کە لەو ماوە دوورو درێژەدا لەکوێ بووە ؟ وە کێ دروستی کردووە ؟!.

دووهەم ئەدا بەگوێچکەیا کە چۆن دروستبووە ، لەگەڵ فەلسەفەی دروستکردنەکەی‌و ئارایش‌دانی بە چاوو گوێ‌و ڕێگای هەست‌و تێگەیشتنی ، ئەفەرموێ ( انا خلقنا الانسان ) ئێمە ئادەمی‌مان دروستکرد ( من نطفة امشاج ) لە دڵۆپێك ئاوی تێکەڵ لە گەلێك توخم «عنصر»و شێوەو ڕەووشتانی سرووشتی «طبائع»ی جیاجیا ، واتە ئەو توخمانەو ڕەووشتانی سرووشتی‌یەی کە لە لەشی ئادەمیی‌دا هەن پاش ئەوەی کە بوو بە زەلامێکی تەواو ، لەناو ئەو دڵۆپە ئاوەشا بوون کە ئەو ئادەمی‌یەی لێ پەیدا بووە ، ئنجا ئەو ئاوانە ، وە ئەو

نَبْتَلِیهِ ،

تاتاقیی بکەینەوە ،

توخمانە کە تێکەڵ بوون هەریەکە ڕەووشتانی سرووشتی خۆی تیایە کە لە باوکو دایکو باپیرانو داپیرانەوە بۆی هاتووە ، وە ئەمیش دەوزی ئەکاتەوە بۆ وەچەو نەوەی خۆی ، وە ئەو ڕەووشتە سرووشتیانە دابەش ئەبن بەسەریانا بەجیاوازیی لەبابەت زۆریی‌و کەمیی‌و بەهێزیی‌و بێهێزیی‌و گەلێ شتی‌ترەوە ، لەبەرئەوە هەر مەردومێك جۆرە سرووشتێکی هەیە ، وە هەریەکێك جۆرە ڕەووشتو خوویەکی هەیە ، با لە یەك باوکو دایکیش‌بن •

ئنجا ئەگەر یەکێك بڵێ : خوایە تۆ بۆ ئادەمیت وا دروست‌کردووە ، کە هەر وەك تەحرو وێنەی کەس لە کەس ناچێ ، سرووشتو ڕەووشتو خووشیان لە یەك ناچێ ؟ خوا وەڵام‌ئەداتەوە ئەفەرموێ : ئێمە وامان دروست‌کردووە بۆئەوەی ( نبتلیه ) کە تاقیی بکەینەوە بەو دەستوورانەی کە بۆی دائەنێین ، وە بەو پێویستانەی کە لە سەری دائەنێین ، وە بەو ڕێنموونی‌یانەی کە ئەیکەین ، تا دەرکەوێ لەسەر شانووی ژیان بۆ خۆشیی‌و بۆ مەردوومیش ، ئایا ڕێی ڕاست ئەگرێ ، یا خوار؟ وە فەرمانبەریی ئەکات‌یانا(١) ؟ واتە ئەگەر ئادەمیی بەم‌ڕەنگە نەبوایە ، وە ڕەووشتانی سرووشتیی جوێ جوێ « طبائع

(١) ئەگینا خوا ئەزانێ بەندەی خۆی چۆنەو چۆن ئەبێ ، واتە باش ئەبێ یا خراپ ئەبێ ، وە پێویست بەم تاقی کردنەوەیە نی‌یە •

فَجَعَلْناهُ سَمِيعاً بَصِيراً ( ٢ )

ئنجا گێڕامان بە ژنەوای بینا (٢)

مختلفە»و خووی سرووشتیی دژدار « غرائزی متباینة»ی تیا نەبوایە،بەڵکو یەك توخم ، وە لەسەر یەك سرووشت بوونایە ، زەلامەکانیش ئەوکاتە بەناچاریی هەموو یەك ڕێیان ئەگرت ، وەك فریشتە ، وە نەیانئەتوانی لابدەن ، وە ئەم تاقیکردنەوەیە نەئەبوو ، وە دانانی یاساو شەریعەتو پێویستانی ئایین بێمانا ئەبوو ، بەڵکو ئەوکاتە ئادەمیی ئادەمیی نەئەبوو ، شتێکیتر ئەبوو .

وتمان خوا ئادەمیی دروستکردووە لە دڵۆپێك ئاوی تێکەڵ لە ڕەووشتانی سرووشتیی جوێجوێ بۆ تاقیکردنەوە ، ئنجا ئاخۆ ئەمە بچێتە سەر بێئەوەی کە ئادەمیی ژیریی‌و بیرو سەربەخۆیی بێ ؟ نەخێر بۆیە فەرمووی ( فجعلناه سميعا ) ئنجا گێڕامان بە ژنەوا بۆ گوێگرتن لە سرووش‌و فەرمانانی ئایین (بصيرا) بینا بۆ ووردبوونەوە لە نیشانانی تاك‌و تەنیایی خواو دۆزینەوەی ڕێی ڕاست .

بەم ئایەتە ئاوڕێك ئەداتەوە بە ئادەمیی بۆ ئەوەدەمەی کە تیا دێتە جیهان ، تا بزانێ لە چی دروستبووە ، وە فەلسەفەی هاتنە ڕووی چییە ؟!.

سێهەم باسی ڕێنموونیی ئادەمیی ئەکات بە ڕەوانەکردنی پێغەمبەران‌و ناردنی نامەی ئاسمانی لەگەڵیانا ، تا خۆی بە ئارەزووی

اِنّا هَدَیناهُ السَّبیلَ اِمّـا شاکِراً وَاِمّا کَفُوراً (۳)

ئێمە بێ‌گومان ڕێنموونییمان کرد : سا یا سوپاس‌گوزارە ، وەیا ناسوپاسە (۳)

خۆی ، ڕێیەك بۆ خۆی هەڵبژێرێ ، ئەفەرموێ ( انا هدیناه السبیل ) ئێمە ڕێنموونییمان کرد بۆ ڕێی ڕاست ، وە لەو سرووشانەی کە ناردوومانەتە خوارەوە باسی هەموو شتێکمان بۆ کرد ، وە ڕێی ڕاستو چەوتمان بۆ لەیەك جیاکردەوە ، تا بە ئارەزووی خۆی ڕێیەك بۆ خۆی هەڵبژێرێ ، وەکو ئەفەرموێ ( اما شاکرا ) یا سوپاس‌گوزارەو ڕێی چاکەو خواپەرستیی ئەگرێ ، وە ئەیخەینە بەهەشتی خۆمانەوە ( واما کفورا ) وە یا ناسوپاسیو بێفەرمانییمان ئەکات ، وە ئایینو پێغەمبەری ئێمە بەدرۆ ئەزانێ ، وە ڕێی چەوتو خراپە ئەگرێ ، وەئەیخەینە ناو دۆزەخەوە .

★ ★ ★

لەدوای ئەوەی کە ئادەمیی ڕاگرت لەسەر دووڕیانی بڕواو بێبڕوایی ، وە ئاووڕێکی پێ دایەوە بۆ پاشەوە کە ماوەیەك بووە نەبووە ، ئنجا ئاووڕێکیتری پێدایەوە بۆ پێشەوە لەگەڵ ووردبوونەوە لە دەوروبەری خۆی وە چرای سروشتی بۆ هەڵکرد لە بەردەمیا ، بۆ ڕوونکردنەوەی ڕێگاکەی ، وە دای بە گوێچکەیا کە بەیارمەتیی چاوو گوێو ژیرییو بیرو ئامۆژگاریی ئاینەوە ڕێی خۆت هەڵبژێرە ، ئنجا لەپێش ئەوەی کە لغاوی بەربداو بێ بنێتە بەرێ هاواری لێ ئەکاتو ئەیترسێنێ لە گرتنی ڕێی خراپەکەو هانەهانەی ئەدات لەسەر گرتنی

اِنّا أَعْتَدْنا لِلْكافِرِينَ سَلاسِلَ وَأَغْلالاً وَسَعِيراً ( ٤ ) اِنَّ الأَبْرارَ يَشْرَبُونَ مِنْ كَأْسٍ ، كانَ مِزاجُها كافُوراً ( ٥ ) عَيْناً يَشْرَبُ بِها عِبادُ اللهِ ، يُفَجِّرُونَها تَفْجِيراً ( ٦ )

---

ئێمە بەڕاستی ئامادەمان کردووە بۆ بێبڕوایان زنجیرو تەوقی زۆرو ئاگری هەڵگیرساو (٤) بێگومان چاکان لە پیاڵەی شەرابێك ئەخۆنەوە کە تێکەڵکراوی ( ئاوێکە وەك ) کافوور ( ساردو سپیو بۆنخۆش )ە (٥) ( کە ئەویش ) کانییەکە بەندەگانی خوا لێیئەخۆنەوە ، ( لە هەرلایەك ئارەزوو بکەن ) بەریئەدەنەوە چۆن بەردانەوەیەك (٦)

---

ڕێگا چاکەکە ، بە باسی ناخۆشیی دۆزەخو خۆشیی بەهەشت ، وە بە باسی بەدبەختی دانیشتووانی یەکەمو خۆشبەختی دانیشتووانی دووهەم ، وە فەرمووی ( انا اعتدنا للكافرين سلاسل ) ئێمە ئامادەمان کردووە بۆ بێبڕوایان زنجیری زۆر کە ئەکرێتە دەستیان ( واغلالا ) وە تەوقی زۆر کە ئەکرێتە گەردنیان ( وسعيرا ) وە ئاگری هەڵگیرساو کە هەمیشە تیا ئەسووتێن .

لەپاش باسی سزای بێ بڕوایان ، ئنجا باسی نازو بەهرەی بەهەشتو خۆش ڕابواردنی بەهەشتییان بۆ ئەکات ئەفەرموێ ( ان الابرار يشربون من كأس كان مزاجها كافورا ) چاکان ئەخۆنەوە لە پیاڵەی شەرابێك کە تێکەڵکراوی ئاوێکە وەك کافوور ساردو سپیو بۆنخۆشە ، کە ئەو ئاوەش ( عينا يشرب بها عباد الله ) کانییەکە لە بەهەشتا کە بەندەگانی خوا لێی ئەخۆنەوە ( يفجرونها تفجيرا ) لە

يُوفُونَ بِالنَّذْرِ ، وَيَخافُونَ يَوْماً كانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيراً ( ٧ )

( چونکه ) ئەوی بڕیاری لەسەربدەن ( لە چاکە ) ئەیکەن ، وە لە ڕۆژیکیش ئەترسن ( وەك ڕۆژی دوایی بێ ) کە بەدیی‌و سەختی‌یەکەی هەموان ئەگرێتەوە (٧)

هەر لایەك کە بی‌یانەوێ بەری ئەدەنەوە چۆن بەردانەوەیەك ، واتە لە هەموو شوێنێك دوگمەی تایبەتی هەیە کە لەگەڵ دەستی پیا نرا ئاو هاوە ئەکات .

لەپێش ئیسلامـا باو بووە لەناو عەرەبا کاتێك کە عەرەقیان بخواردایەتەوە کەمێك کافوور یا زەنجەفیلیان تێکەڵ ئەکرد ، هەر بۆ تام‌و بۆنخۆشیی ، ئنجا وا لێرەدا فەرمووی کە لە بەهەشتا ئەو ئارەزوووەشیان دێتەدیی .

وەك لێرەدا یەکێك بڵێ : خوایە چاکان بە چی شایستەی ئەم میهرەبانی‌یەن ؟ ئەویش ئەفەرموێ بە سێ شت :

١ ـ ( یوفون بالنذر ) ئەوی بڕیاری بدەن لە چاکەو کردەوەی باش ئەیکەن بە بێ‌دواخستن ، یا پەشیمان بوونەوە ، ئنجا ئەو چاکەیە بە گوفتار بێ یا بە کردار بێ ، کردارەکە یا ڕۆژوو بێ ، یا دەستگیرۆیی یەکێك بێ ، یا دروستکردنی خەستەخانە ، یا مزگەوت یا قوتابخانە ، یا هەر کارێکی‌تر بێ کە قازانجی بێ بۆ خۆی یا بۆ ئادەمیی .

٢ ـ ( ویخافون یوما کان شره مستطیرا ) ئەترسن لە ڕۆژێك ـ وەك ڕۆژی دوایی بێ ـ کە توندو تیژیی ئەوڕۆژە هەموو خراپێك ئەگرێتەوە .

وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَى حُبِّهِ مِسْكِيناً وَيَتِيماً وَأَسِيراً (٨)

وە خواردەمەنیی دەرخواردی هەژارانو هەتیوانو دیلان ئەدەن ، بـا خۆشیان حەزی لێ بکەن (٨)

٣ ـ ( ویطعمون الطعام علی حبه مسکینا ویتیما واسیرا ) خواردەمەنی خۆیان دەرخواردی هەژارانو هەتیوانو دیلان ئەدەن با خۆشیان حەزی لێ بکەنو پێویست بن پێی •

هەژار کەسێکە لەبەر نەبوونیی یا زەبوونیی دەستەوسان کەوتبێ ، وە کەس بیری بەلایا نەچێ ، لەبەرئەوەی کە هەتیوو دیل لە هەموو هـەژارێك نزیکترن بە لەناوچوون ، بۆیە بەتایبەتی ناوی بردن •

وابزانم باشترین بەڵـگە لەسـەر بڕوا بـە خواو ڕۆژی دوایی ـ بەزەیی هاتنەوەیە بە هەژارانو هەتیوانو دیـلانا ، وە هـەوڵدانە بۆ دەستگرتنو ڕزگارکردنیان لە ژیانی تاڵ •

پێویستە بزانین کـە مەبەس لە دیل لێرەدا کەسێکە کـە لەکاتی جەنـگو کوشتارو دوژمنایەتیدا گیرابێ ، وە مسڵمان نەبێ بەنیشانەی ئەوەی کـە تا هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەش دیلی زەمانی پێغەمبەر هەر لـە بتپەرستی عـەرەب بوون ، ئەمجۆرە دیلانە چونـکە مسڵمان نین وە لـە گەلێ شتا جیاوازن لەگەڵمانا ، وە لە وولاتی ئێمەدا بێ کەسو نەناسراون ، وە لەوانەن کـە ئازار بدرێن یا بێگاریان پێ بکەن ، یا قسەی سووکیان پێ بڵێن ، لەبەرئەوە قورئان ڕەبەدەم هاوار ئەکاتە مسڵمانان کە ئازاریان نەدەنو خزمەتیان بکەن ، تەنانەت نانپێدانو حورمەتگرتنیانی

اِنَّما نُطْعِمُکُمْ لِوَجْهِ اللهِ لا نُریدُ مِنْکُمْ جَزاءً وَلا شُکُوراً (٩) اِنَّا نَخافُ مِنْ رَبِّنا یَوْماً عَبُوساً قَمْطَریراً (١٠)

( لە دڵی خۆیانا ئەڵێن ) : ئێمە کە خواردنتان ئەدەینێ هەر بۆ ڕەزای خوایە ، نە داوای پاداشتان لێ ئەکەین‌و نە سوپاس (٩) بەڕاستیی ئێمە لە سزای خوای خۆمان ئەترسین لە ڕۆژێکی ترش‌و تاڵ‌و سەختا (١٠) •

کرد بە مایەی چوونە بەهەشت ، ئەگەر ڕاستت ئەوێ ئەمە بەسە بۆ گەورەیی قورئان‌و بەرزیی ئیسلام ، کە ١٣٥٠ ساڵ لەپێش توصیەی حقوقی دولی‌دا قورئان ئەم توصیەیە ئەکات •

بەڕاستیی ڕەحم خوێنی لەشی ئادەمێتی‌یە ، کە ئەم خوێنە نەما ئادەمێتی ئەمرێ ، یا کە کەم‌بووەوە ، نەخۆش ئەکەوێ ، کەوابوو ئادەمیی بێ‌ڕەحم وەك ئادەمی‌یەك وایە کە لەژێر زەویی‌دا بەهۆی زۆر مانەوەوە بووبێ بە بەرد «انسان متحجر» •

لەدوای ئەوەی کە بە ئایەتی « ان الابرار » نیشانی‌دا کە چاکان چاکە ئەکەن لەگەڵ هەژارانا ، ئنجا ئەفەرموێ کە هۆی ئەم چاکەکردنەیان دوو شتە :

١ ـ ڕەزامەندیی خوا ، وەك ئەفەرموێ لە دڵی خۆیانا ، وە بە زبانی حاڵ ئەڵێن ( انما نطعمکم لوجه الله ) ئێمە کە خواردەمەنیتان ئەدەینێ هەر بۆ ڕەزای خوایە ( لا نرید منکم ) چاوەڕوانیی ناکەین لە ئێوەوە ( جزاء ولا شکورا ) نە پاداش‌و نە سوپاس •

٢ ـ ترسی ڕۆژی دوایی ، وەك ئەفەرموێ ( انا نخاف من ربنا یوما عبوسا قمطریرا ) بەڕاستیی ئێمە لە سزای خوای خۆمان ئەترسین ،

فَوَقَاهُمُ اللهُ شَرَّ ذلِكَ الْيَوْمِ، وَلَقَّاهُمْ نَضْرَةً وَسُرُوراً (١١)
وَجَزَاهُمْ بِمَا صَبَرُوا جَنَّةً وَحَرِيراً (١٢)

---

ئنجا خوا پاراستنی لە بەدیی ئەوڕۆژە ، وە پێیدان پاراویی‌و شادمانیی (١١) وە پاداشیدانەوە بەهۆی خۆڕاگرتنیان ( لەسەر چاکەو دورکەوتنەوە لە خراپە ) بە بەهەشت‌و ( کاڵای ) ئاوریشم (١٢)

---

لە ڕۆژێکی ترش‌و تاڵ‌و سەختا •

دوای ئەوەی کە فەرمووی چاکان چاکە ئەکەن لەگەڵ هەزارانا بۆ دوو شت ، یەکەم بۆ ڕەزامەندیی خواو دووهەم لە ترسی ڕۆژی دوایی ، ئنجا باسی ئەوە ئەکات کە خوا هەردوو مەبەسەکەی بۆ بەجێهێنان ، بەم‌ڕەنگە :

یەکەم پاراستنی لە سزاوناخۆشیی ڕۆژی‌دوایی ، وەکوئەفەرموێ ( فوقاهم الله شر ذلك اليوم ) خوا پاراستنی لە بەدیی‌و خراپیی ئەو ڕۆژە کە ڕۆژی دوایی‌یە •

دووهەم پاداشی دانەوە بە خۆشیی‌و خۆش‌ڕابواردنی بەهەشت ، وەکو ئەفەرموێ ( ولقاهم نضرة وسرورا ) وە پێیدان پاراویی‌و شادمانیی ( وجزاهم بما صبروا جنة وحريرا ) وە پاداشی دانەوە بەهۆی خۆڕاگرتنیان لەسەر کردنی چاکەو نەکردنی خراپە ـ بە بەهەشت‌و

مُتَّكِئِينَ فِيهَا عَلَى الأَرَائِكِ ، لا يَرَوْنَ فِيهَا شَمْسًا وَلا زَمْهَرِيرًا ( ١٣ ) وَدَانِيَةً عَلَيْهِمْ ظِلالُهَا ، وَذُلِّلَتْ قُطُوفُهَا تَذْلِيلاً ( ١٤ )

( لەکاتێکا کە ) پاڵی تیائەدەنەوە لەسەر کورسی‌و تەختان ، نابینن لەناویا نەگەرمیی ڕۆژو نە سەرما (١٣)وە سێبەری درەختانی بەهەشت بەسەر سەریانەوەیە ، وە هێشووی میوەهاتی نزیکە دەست‌و ئاسان کراوە (١٤)

کاڵای ئاوریشم ، واتە بەهۆی ئەو خواردەمەنی‌یانەی کە لە دەمی خۆیان‌و ماڵ‌و منالیان ئەگرتەوە بۆ هەژاران‌و هەتیوان‌و دیلان ، لەگەڵ ئەوەی کە خۆیان حەزیان لێ ئەکرد ، وە بەهۆی ئەو بەرگ‌و کاڵایانەی کە لە خۆیان ئەگرتەوە بۆ ئەوان ـ خوا هەرچی خواردەمەنیی خۆش‌و کاڵای ئاوریشمینی بەهەشت هەبە هەمووی دانێ ، لەکاتێکا کە ( متكئين فيها على الارائك ) پاڵی تیا ئەدەنەوە لەسەرتەخت‌و قەنەفە ( لا يرون فيها شمسا ) نابینن لەناویانا نە گەرمیی ڕۆژ ( ولا زمهريرا ) و نە سەرما ، واتە هەوایەکی زۆر خۆشیی هەیە ، وە هەواو ڕووناکی‌یەکی وەك هەواو ڕووناکیی پێش هەتاوکەوتن وایە ( ودانية عليهم ظلالها ) وە نزیکە لە ژوورسەریانەوە ، سێبەری لقی درەختانی بەهەشت ( وذللت قطوفها تذليلا ) وە هێشووی میوەی نزیکە دەست‌و

وَيُطَافُ عَلَيْهِم بِآنِيَةٍ مِّن فِضَّةٍ ، وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا (١٥) قَوَارِيرَ مِن فِضَّةٍ

بەدەوریانا ئەسووڕێنەوە بە قابی زیبویین و پەرداخی شووشە (١٥) شووشە لە زیبو ،

ئاسان کراوە ، واتە بەئاسانی دەست ئەیگاتێ ( ویطاف علیهم بآنیة من فضة ) بەدەوریانا ئەسووڕێنەوە بە قابی زیبوینی پڕ لە خۆرشت ( واکواب کانت قواریرا • قواریر من فضة ) و پەرداخی شووشە کە بە فەرمانی خوا دروستکراوە لە زیبو ، ئنجا ئەمە چۆن ئەبێ ؟ لەکاتێکا کە زیبو لەگەڵ شووشەدا زۆر جیاوازن ، جا لەبەرئەوەی کە ئەگونجێ لێرەدا ئەم بیرە بەدڵا بێت ، ووتەی «قواریر»ی دووجار ووتەوە ، واتە ئەمە وایە ، وە جێی دوودڵی نییە ، وە ئەم دەفرو پەرداخانە هەرچەند لە زیبون،بەڵام شووشەن شووشە ، ئەوکاتە مەردوم تێئەگات کە شتەکە زۆر گرنگە،وە بۆ مەبەستێکی زۆر وورد ، وا ووتراوە ، ئنجا کە بیری کردەوە تێئەگات کە ئەم زیبوە بۆیە ناوبراوە بە شووشە چونکە وەك شووشە ساف و تەنك و ڕوون و بێگەردە ، واتە جوانیی و نەرمیی و سپێتی زیبو ، تەنکیی و ڕوونیی شووشەی تیایە ، کە ئەمە لە بەهەشتا نەبێ نەبووەو نابێ

قَدَّرُوهـا تَقْدِيراً ( ١٦ ) وَيُسْقَوْنَ فِيها كَأْساً ، كانَ مِزاجُهـا زَنْجَبِيلاً ( ١٧ ) عَيْناً فِيها تُسَمّى سَلْسَبِيلاً ( ١٨ )

ئەندازەی شەرابەکەیان گرتووە بە بێ زیادو کەم (١٦) شەرابێکیان دەرخوارد ئەدرێ لە بەهەشتا کە تێکەڵ کراوی ( ئاوێکە ) کە بۆنی زەنجەفیل ئەدا (١٧) ( کە ئەویش ) کانی‌یەکە لە بەهەشتا ناوئەبرێ بە سەلسەبیل (١٨)

( قدروها تقديرا ) ئەو پەرداخ گێڕانە ئەندازەی ئەو خواردنەوەیەی کە پێشکەشی ئەکەن ، ئەیگرن بەڕەنگێکی وا کە نە زیاد بێ‌و نە کەم .

لێرەدا فەرمووی قاپ‌و پەرداخی بەهەشت لە شووشەی زیوون لە ئایەتی « ويطاف عليهم بصحاف من ذهب واكواب » دا/٧١/الزخرف/ ٤٣ «(١) ئەفەرموێ لە زێڕن ، واتە هەردەمەی بە جۆرێکن ، هەر وەك شەرابخواردنەوەکەیان هەردەمەی بەجۆرێکە ، دەمێك لەگەڵ ئاوێك کە بۆنی کافوورو دەمێك لەگەڵ ئاوێك کە بۆنی زەنجەفیل بدا تێکەڵ ئەکرێ ، وەکو ئەفەرموێ ( ويسقون فيها كأسا كان مزاجها زنجبيلا ) لە بەهەشتا شەرابێکیان دەرخوارد ئەدرێ کە ئەوی لەگەڵیا تێکەڵ ئەکرێ ، ئاوێکە کە بۆنی زنجەفیل ئەدا ، کە ئەو ئاوەش ( عينا فيها تسمى سلسبيلا ) کانی‌یەکە لە بەهەشتا ناوی «سەلسەبیل» .

ئنجا بۆ زیادە خۆشیی ئەوانەی کە ئەم خواردن‌و خواردنەوەیە

(١) واتە ئەگەڕێن بەدەوریانا بە بەلەمی زێڕین‌و پەرداخەوە .

وَ يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدانٌ مُخَلَّدونَ اِذا رَأَيْتَهُمْ حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤاً مَنْثوراً ( ١٩ ) وَاِذا رَأَيْتَ ثَمَّ رَأَيْتَ نَعيماً وَمُلْكاً كَبيراً ( ٢٠ ) عاليَهُمْ ثِيابُ سُنْدُسٍ خُضْرٌ وَاِسْتَبْرَقٌ ، وَحُلُّوا اَساوِرَ مِنْ فِضَّةٍ ،

---

ئەگەڕێن بەسەریانا نەوجەوانانی هەتا هەتایی ،کە بی‌یان‌بینیت وائەزانیت دانەی مرواریی پرژاوون (١٩) وە کاتێك بڕوانیت لەوێدا ، ئەبینیت نازو بەهرەو دارایی‌یەکی گەورە (٢٠) لەبەریانایە بەرگی نەرمو نۆڵی سەوزکارو کاڵای ئاوریشمین ، وە ڕازانراونەتەوە بە بازنی زیو •

---

ئەگێڕن بەسەر بەهەشتی‌یانا ، مناڵانی جوانی پاكو تەمیزی ڕوخسار پ‌کن کە ئەڵێت فریشتەن ، وەکو ئەفەرموێ ( ویطوف علیهم ولدان مخلدون ) ئەگەڕێن بەسەریانا نەوجەوانانی هەتا هەتایی ، کە هەر بە مناڵی ئەمێننەوە لە بەهەشتاو پیر نابن ( اذا رأیتهم ) کاتێك بیان‌بینیت کەوا بڵاوبوونەتەوە بە یەکەیەکەو دوان دوان‌و سیان سیان ( حسبتهم لؤلؤا منثورا ) وائەزانیت کە دانەی مرواریی پرژاوون ( واذا رأیت ثم ) وە کاتێك کە بڕوانیت لەوێدا ( رأیت نعیما وملکا کبیرا ) ئەبینیت نازو بەهرەو دارایی‌یەکی گەورەو فراوان‌و بێ‌بڕانەوە ، کە زمان ناتوانێ باسی بکات‌و قەڵەم ناتوانێ بی‌نووسێ •

لەدوای باسی خواردن‌و خواردنەوەی بەهەشتی‌یان‌و قاپ‌و پەرداخیان، ئنجا باسی کاڵایان ئەکات ئەفەرموێ ( عالیهم ثیاب سندس خضر واستبرق ) لەبەریانایە بەرگی‌نەرمو نۆڵی سەوزکارو کاڵای ئاوریشمین ( وحلوا اساور من فضة ) وە ڕازانراونەتەوە بە بازنی زیو •

وَسَقاهُمْ رَبُّهُم شَراباً طَهُوراً ( ١٢ ) اِنَّ هـذا كانَ لَـكُمْ جَزاءً ، وَكـانَ سَعْيُكُمْ مَشْكُوراً ( ٢٢ )

وە پەروەردگاریان شەرابی پاكو تەمیزیان دەرخوارد ئەدا (٢١) ئـــەم بەهەشتە ، پاداشە بۆ ئێوە ، وە هەموو هەوڵیكتان شایستەی سوپاسە (٢٢)

لە سوورەی «كهف» دا ئەفەرموێ ( یحلون فیها من اساور مـــن ذهب )(١) لە سوورەی «فاطر»دا ئەفەرموێ « یحلون فیها من اساور مـن ذهب ولؤلؤا ولباسهم فیها حریر »(٢) • لەم ئایەتانەوە دەرئەكەوێ كـــە بەهەشتیی هەردەوەی شتێـكی جوان بەكاردێنن ( وسقاهم ربهم شـرابا طهورا ) وە پەروەردگاری ئەوان شەرابی پاكو تەمیـــزیان دەرخـــوارد ئەدات ، ئنجا لەڕووی مژدەوە پێیان ئەووترێ لە بارەگـــای خـــواوە ( ان هذا كان لكم جزاء ) ئـەم بەهەشتو نازو بەهرەیە پاداشە بۆ ئێـــوە ( وكان سعیكم مشكورا ) وە هــەموو هەوڵیـكتان پەســەندو شـایستەی پاداشــە •

ئێمــە كە مسڵمانین بڕوامان هەیە بــە كۆتو زنجیری ئاگریی دۆزەخ وە بە خواردنو خواردنەوەی بەهەشت ، وە بە قاپو پەرداخی زێڕینو زیوینی ، وە بە كاڵای ئاوریشمینو تەختو كورسیوخەڵی ڕەنـگاو ڕەنـگی ، بەڵـكو سەرەڕای ئەوە بڕوامان وایـــە كـە نازو

(١) واتە ئەڕازێنرێنەوە لە بەهەشتا بە بازنی زێڕ •
(٢) واتە ئەڕازێنرێنەوە لە بەهەشتا بە بازنی زێـــڕو مرواریـــی ، وە كاڵایان لەوێ ، ئاوریشمە •

بەهرەی بەهەشت سەدهەزار جار بەرزترو جوانترو خۆشترە لــە هی جیهان ، نەخوازەلا کە خۆشیی بەهەشت زۆرتر گیانی‌یە ، وە ئەوانە نە ناویان بۆ دانراوون‌و نە ووتەیەك هەیە لە جیهانا کە بتوانێ باسیان بکات، ئەمانەی کــە قورئان ئەیانفەرموێ بەشی زۆریان لەســەر تەشبیهن ، وە تەعبیری دنیــان •

ئــەم سوورەتە لــە مەککە هــاتۆتە خوارەوە ، وە سوورەتە مەککی‌یەکانیش ، یەکەمجار قسە لەگــەڵ بێ‌بڕواکانی قورەیشا ئەکەن، کــە ئەوانیش زۆریان حەز لە خۆش‌ڕابواردن بووە ، هــەروەك زۆر کەسی‌تریش حــەزی لێ‌یەتی ، وە بەمە ڕازی‌یە کە لە بەهەشتا بێ بــە پاداشی ، جــا لەبەرئەوە درێژترین باسی بەهــەشت لە قورئانا ، لــەم سوورەتە وە لــە سوورەتی « طور » دایە ــ کــە هەردووکیان مەککین ــ لەگــەڵ ئەمیشە قورئان وەك پزیشکێك وایە کــە دەرمانی هەرکەسێك بەجۆرێك ئەکات ، واتە بۆ هێندێك باسی خۆشیی بەهەشت ئەکــات بە باخ‌و باخــات‌و ئاوو میوەو گۆشت‌و کاڵای ئاوریشمین‌و بازنی زێڕو زیوو مرواریی‌و تەخت‌و کورسیی • بۆ هێندێکیش ــ وەك فەیلەسووفە گەورەکان ، کە عاشقە خواردن نین ــ باسی خۆشیی بەهەشتیان بۆ ئەکا بە گەیشتن بە خزمەت خواو نوقومبوون لە دەریای میهرەبانیی‌و نووری خوادا ، وەك ئایەتی « وجوه یومئذ ناضرة ، الی ربها ناظرة ٢٥/٢٢»(١) هەروەك بۆ هێندێ کەسی‌تریش باسی بەهەشت ئەکات بە ئایەتی‌وا ، کــە ڕایکێشیت ئەکشێ وەك ئایەتی « فلا تعلم نفس ما اخفی لهم من قرة

(١) واتە زۆر ڕوخسار لەو ڕۆژەدا پــاراوە ، تەماشــای پەروەردگاری خۆی ئەکات •

اِنّـا نَحْنُ نَزَّلْنـا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ تَنْزِيلاً ( ٢٣ ) فَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ ،

بێ‌گومان ئێمە قورئانمـان بۆ ناردیتە خوارێ بە ناردن( ٢٣ ) ئنجـا چاوەڕوانی فەرمانی پەروەردگارت بە ،

اعین/١١/٣٢ ،[1] واتە بۆ هەموو کەسێك بەشی خۆی هەیە لـە باسی خۆشی بەهـەشتو ناخۆشیی دۆزەخ بەجۆرێـکیوا کـە بۆ ئەویان هەوڵبداو لەمیان خۆی بپارێزێ .

★ ★ ★

زۆر جار پێغەمبەر ئەم ئایەتانە ، یا وێنەی ئەم ئایەتانەی ئەخوێندەوە بەسـەر بێ‌بڕواکانا ، بەڵام کاری تێ‌نەئەکردن ، وە لـە بێ‌بڕوایی نەئەگەڕانەوە ، وە دەستیان لـە گاڵتەکردنی خۆیان هەڵنەئەگرت ، بەمە پێغەمبەر دڵتەنگ ئەبوو ، ئنجا خوا ئەیەوێ دڵی پێغەمبەر بەهێز بکاتەوە، وە ئامۆژگاریی بـکات لەسەر خۆڕاگرتنو دانبەخۆداگرتن ، ئەفەرموێ ( انا نحن نزلنا علیك القرآن تنزیلا ) بەڕاستی ئێمـە قورئانمان بۆ ناردیتە خوارێ ئایەت بـە ئایەتو سوورەت بـە سوورەت بەپێی پێویست ، وە هـەرچی بەڵێنێکمان پێ داویتو هەڕەشەیەکمان کردووە لـە خراپان هەمووی دێتە دی ، نائومێد مەبە ( فاصبر لحکم ربك ) ئنجـا دان بـە خۆتا بـگرە ، وە چاوەڕوانی فەرمـانی پەروەردگاری خۆت بە تا کـاتی

(١) واتە هیچ کەسێك نازانێ لە بەهەشتا چی بۆ هەڵگیراوە لـەو شتانەی کە چاو ڕوونئەکەنەوە .

وَلَا تُطِعْ مِنْهُمْ آثِماً أَوْ كَفُوراً (٢٤) وَاذْكُرِ اسْمَ رَبِّكَ بُكْرَةً وَأَصِيلاً (٢٥) وَمِنَ اللَّيْلِ فَاسْجُدْ لَهُ، وَسَبِّحْهُ لَيْلاً طَوِيلاً (٢٦)

وە دوای هیچ گوناهبارو ناسوپاسێك مەكەوە لەوان (٣٤) وە ناوی خوای خۆت بەرە بەیانیان‌و ئێواران (٢٥) وە لە شەوا سجدەی بۆ بەرە ، وە ناوی خوا بەرە لە بەشێكی زۆر لە شەوا (٢٦)

خۆی دێ ، ئەوكاتە تۆ بە ئاواتی خۆت ئەگەیت ، وە ئەوانیش تووشی ڕۆژی ڕەشی خۆیان ئەبن ، وە ئەگەر ویستیان بە ماڵی دنیا یا بە حكمداریی بتخەڵەتێنن بەقسەیان مەكە ، وەكو ئەفەرموێ ( ولا تطع مهم آثما او كفورا ) دوای هیچ گوناهبارو ناسوپاسێك مەكەوە لەوان .

دان بە خۆداگرتن‌و وێستان لەبەر باری ڕۆژگارا ئیجگار قورس‌و گرانە ، پێویستە بە خۆئامادەكردن‌و توێشە بۆ هەڵگرتن ، ئنجا ئەبێ توێشەی پێغەمبەرو یارانی بۆ ئەم دان بەخۆداگرتنە بە بێ‌نوێژو شەونوێژو خواپەرستیی‌و نزاو پاڕانەوە چی‌تر بێ ؟ دیارە هیچی‌تر نی‌یە ئەمانە نەبێ ، وەكو ئەفەرموێ ( واذكر اسم ربك بكرة واصيلا ) ناوی پەروەردگاری خۆت بەرە بەیانیان‌و ئێواران ( ومن الليل فاسجد له ) وە لە شەوا سجدەی بۆ بەرە ، واتە نوێژی شێوان‌و خەوتنانی بۆ بكە ( وسبحه ليلا طويلا ) وە تسبیحاتی خوا بكە لە بەشێكی زۆر لە شەوا ، واتە شەونوێژ بكە ، وەك لە سەرەتای سوورەی «مزمل»ەوە باسكرا ، چونكە ڕێگاكەت دوورو درێژە ، وە پێویستیت هەیە بە توێشوو هەڵگرتن‌و زەخیرە خستن .

اِنَّ هؤُلاءِ يُحِبُّونَ الْعاجِلَةَ ، وَيَذَرُونَ وَراءَهُمْ يَوْماً ثَقِيلاً (٢٧) نَحْنُ خَلَقْناهُمْ وَشَدَدْنا اَسْرَهُمْ ، وَاِذا شِئْنا بَدَّلْنا اَمْثالَهُمْ تَبْدِيلاً ( ٢٨ )

ئەم بێبڕوایانە جیهانی کەم تەمەنیان خۆش ئەوێ ، وە پشت‌گوێی ئەخەن ڕۆژێکی قورس‌و گران ( ٢٧ ) ئێمە ئەوانمان دروست‌کردو جومگەکانیانمان قایم‌کرد ، وە کاتێك ویستمان ( لەناویان ئەبەین‌و ئەیانگۆڕین ، بە دەستەیەکی‌تری وەك خۆیان چۆن گۆڕینێك (٢٨)

ئنجا باسی جیاوازیی ئەکات لە ناوەندی ڕێگای پێغەمبەرو بێبڕوایانا ، کە دووهەمیان بێ‌ئاگان لە پاشەڕۆژی خۆیان ، وە هەمیشە بە جیهانی هیچ‌وپووچەوە خەریکن ، وەکو ئەفەرموێ ( ان هؤلاء یحبون العاجلة ) ئەم بێبڕوایانە جیهانی کەم تەمەنیان خۆش ئەوێ ، وە هەوڵی بۆئەدەن ( ویذرون وراءهم ) وە پشت‌گوێی ئەخەن ( یوما ثقیلا ) ڕۆژێکی قورس‌و گران کە ڕۆژی دوایی‌یە ، ئەوڕۆژەی کە زۆر توندو تیژە لەسەر بێبڕوایان ، وە ترش‌و تاڵە لەسەر خوانەناسان ، لەگەڵ ئەمیشە کە خوا دروستی کردوون ، وە هێزو تەوانایی پێ داوون ، وە ئەندامی دارشتوون ، وە بە ڕەگ‌و دەمارو پەی «عصب» هەموی بەیەکەوە بەستۆتەوە ، وەکو ئەفەرموێ ( نحن خلقناهم وشددنا اسرهم ) ئێمە ئەوانمان دروست‌کرد لە دڵۆپێك ئاو ، جومگەکانیانمان قایم‌کرد و بەستمانەوە بەهۆی ڕەگ‌و دەمارو پەیەوە ( واذا شئنا بدلنا امثالهم تبدیلا ) وە هەرکاتێك ویستمان لەناویان ئەبەین ، وە ئەیانگۆڕین

إِنَّ هَـٰذِهِ تَذْكِرَةٌ ، فَمَن شَاءَ اتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِ سَبِيلًا (٢٩)

ئەم سوورەتە پەندە ، ئنجا ئەوکەسەی حەزئەکات ڕێگایەك ئەگرێتەبەر بۆلای خوای خۆی (٢٩)

بـە دەستەیەکی تری وەك خۆیان ، واتە خوا بە تەوانایە لەسەر لەناوبردنی ئـەم بێبڕوایانە ، وە هێنانی دەستەیەکی‌تر لە ئادەمیی لە شوێنی ئـەوان کـە بێفەرمانیی خواو پێغەمبەر نەکـەن ، ئەم ئایەتە هەڕەشـەیە لـە بێبڕواکان ، واتە ئەگـەر ئەوان نەمـان وانەزانن کـە منالەکانیـان وەك ئەوان ئەبن لە بێبڕوایی‌دا ، بەڕاستی قورئان چـۆن ئەفەرموێ وابوو ، « ابو جهل » کوژرا «عکرمە»ی کوڕی لەپاش بەجێما ، «ولید»ی کوڕی « مغیرة » مرد «خالد»ی کوڕی لەپاش بەجێما ، کـە ئەم دوو باوکـە دوو سەرۆکی بێبڕوا بوون ، وە کوڕەکانیان دوو سەرکردە «قائد»ی جەنگیی پڕ بڕوا بوون لە لەشکری ئیسلاما .

لەدوای باسی چاکان‌و خراپان ، ئنجا باسی ئەوە ئەکا کـە ئـەم سوورەتە پڕە لە پەندو ئامۆژگاریی بۆ ئەوکەسانەی کە گوێی بۆ بگرن‌و دڵی بدەنێ ، ئەفەرموێ ( ان هذه تذكرة ) ئەم سوورەتە هەمووی پەندو ئامۆژگاری‌یە ( فمن شاء ) ئنجا هەرکەسێك حەزئەکـات لـەم سوورەتە بەهرە وەرگرێ ( اتخذ الى ربه سبيلا ) ئـەتوانێ ڕێیەك بـگری بۆلای

و ما تَشاءُونَ اِلاّ اَنْ یَشاءَ اللهُ ، اِن اللهَ کانَ عَلیماً حَکیماً (٣٠)

وە ئێوە حەزناکەن ( لە گرتنی ئەو ڕێیە ) مەگەر کاتێك کە خوا بیەوێ ( وە بەزۆر ناچارتان بکات ) خوا دانای دروست کردارە (٣٠)

پەروەردگاری خۆی ، بەو ژیریی‌و بیرەی کە خوا داویتێ وە بەو ڕێنموونیی‌یەی کە کردوویەتی ، بەلام ئەم بێبڕوایانە ، لاساریی وای لێ کردوون کە ئەو ڕێگایە هەرگیز نەگرن ، وەکو ئەفەرموێ ( وما تشاءون الا ان یشاء الله ) ئێوە حەزناکەن لە گرتنی ئەو ڕێیە مەگەر کاتێك کە خوا بیەوێ ، وە بە زۆر ناچارتان بکات بە گرتنی ، کە ئەمەش باوی خوا نی‌یە ( ان الله کان علیما ) بێگومان خوا دانایە بە بەندەگانی خۆی ( حکیما ) دروست کردارە ، لەم دەستوورو باوانەی کە داینـاوە ، وە لەم پێغەمبەرانەی کە ڕەوانەی کردوون ، وە لەم سرووشانەی کە ئەیاننێرێتە خوارەوە کە ئەمانە مایەی خۆشیی‌و خۆشبەختی بەندەگانن .

لە ئایەتی « فمن شاء اتخذ الی ربه سبیلا » وە دەرکەوت کە بەندەگان دوو دەستەن یەکەمیان ڕێی خوا ئەگرن ، دووهەمیان نایگرن ، کە ئەمەیان ستەمکارە ، ئنجا دوایی سوورەتەکە ئەهێنێ بە باسی

يُدْخِلُ مَنْ يَشاءُ فِي رَحْمَتِهِ ، وَالظّالِمِينَ أَعَدَّ لَهُمْ عَذاباً أَلِيماً ( ٣١ )

---

ئەوی ( خوا ) بی‌یەوێ ئەیخاتە نـاو بەخشـش‌و میهرەبانـی خۆیەوە ، وە ئامادەی کردووە بۆ ستەمکاران سزای بە سوێ (٣١)

---

سەرەنجامی ئەم دوو دەستەیە ئەفەرموێ ( يدخل من يشاء في رحمتـه ) ئەوی کە خوا بی‌یەوێ ـ کە دەستەی یەکەمە ـ ئەیخـاتە ناو بەخشش‌و میهرەبانی خۆیەوە ( والظالمين اعـد لهم عـذابا اليما ) وە ستەمکارانیش ـ کـــە دەستەی دووهەمن ـ بۆی ئامـــادە کردوون سزای سەخت‌و بەســوێ •

# سورة المرسلات

## بسم الله الرحمن الرحيم

وَالْمُرْسَلاتِ

---

# سوورەی ( مرسلات )ە

**بە ناوی خـوای بەخشندەی میهرەبان**

سوێند بە بای ڕەوانەکراوی

---

# سوورەی ( مرسلات )ە

**مەککی‌یە ، ٥٠ ئایەتە ، ١٨١ ووتەیە : ٨١٦ پیتە**

## بسم الله الرحمن الرحيم

**بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

با لەسەر دوو جۆرە ، یەکەم بایەکە کـە مایەی زیانی گیاندارە ، دووهەم بایەکە کـە بەهێزو تەووژم دێ بەجۆرێك کە دارو درەخت ئەشکێنێتەوەو مەردوم ناڕەحەت ئەکات ، زۆر کەس لـەم جۆرە بایە وەڕسن‌و جنێوی پێ ئەدەن ، وە حـەز بـە نەبوونی ئەکـەن ، ئنجـا بۆئەوەی تێمان‌بگەیەنێ کـە ئەم جۆرە بایە زۆر بەکەڵکە لـــە هێنان‌و بــردنی هـــەورو بڵاوکردنەوەی تۆو متـوربە کردن «تلقیح»ی دارو درەخت‌و گژوگیاو بردنی کەشتی بەسەر دەریاداو گەلێ شتی‌تر ، هات لەسەر دەستووری قورئان سوێندی پێ خوارد ، فەرمووی ( والمرسلات

عُرْفاً (١) فَالْعاصِفاتِ عَصْفاً (٢) والنّاشِراتِ نَشْراً (٣) فَالْفارِقاتِ فَرْقاً (٤)

---

یەك لەدوای یەك(١)وە بەو بایانەی كە بە توندیی هەڵئەكەن بە هەڵكردنێكی قایم (٢) وە بەوانەی كە هەوور ئەبەن‌و بڵاوی ئەكەنەوە (٣) وە بەوانەی كە هەوور دابەش ئەكەن ( بەسەر وولاتا ) بە دابەش كردن (٤)

---

عرفا ) سوێند بە بای ڕەوانە كراوی یەك لەدوای یەك ( فالعاصفات عصفا ) وە بەو بایانەی كـە بەتوندیی هەڵئەكەن بە هەڵكردنێكی قایم (والناشرات نشرا) وە بەو بایانەی كـە هەوور ئەبەن‌و ئەهێنن‌و بڵاوی ئەكەنەوە لـــە ئاسمانا ( فالفارقات فرقا ) وە بەو بایانەی كـە هـەوور دابەش ئەكـــەن بەسەر وولاتانا بۆ باران‌و زیندوو كردنەوەی سەرزەویی •

ئەو وولاتانەی كـە كانیی‌و كارێزو چەم‌و ڕووبارو جۆگەو تافگەی زۆریان لەناوا بێ ، وە ئەم ئاوانە لـە هەموو لایەكەوە بەرهەڵستیان لەبەرا كرابێ‌و دەریاچـــەیان لـێ دروست كرابێ بۆ ئاودانی زەویـــی‌و زارو كشت‌و كاڵ ـ ئەم جۆرە وولاتانە كەم هەوورو بارانیان بیر ئەكەوێتەوە ، وە خۆیان بە پێویستی باران نازانن ، بەڵام ئەو شوێنانەی كە وانین ، وە بۆ هـــەموو شتێك پێویستن بە باران ، بۆ ئاو خـواردنەوە ، بۆ باخ‌و باخات‌و دەغڵ‌ودان‌و گژوگیا ، ئەوانە ئەزانن كـە ژیانیان لەسەر بارانە ، ئەگـەر بوو ئەوا بەخۆشیی ئەژین ، وە ئەگـــەر نەبوو ئـــەوا ئەبێ چاوەڕوانی گرانیی‌و بێ‌نانیی‌و دەربەدەریی‌و ڕیسوایی بكەن ، لەبەرئەوە هەرچەند لە وەختی خۆیا بای باران‌و هەوور بیینن ئەگەشێنەوەو لـــە

فَالْمُلْقِيَاتِ ذِكْراً ( ٥ ) عُذْراً أَوْ نُذْراً ( ٦ ) إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَوَاقِعٌ ( ٧ )

ئنجا ناوی خوا ئەخەنە سەر زبان (٥) ( بەجۆرێك كـە ببێ ) بە بەهانە(ی لێخۆشبوونیان ) یا ترساندنیان (٦) ئەوی كە بەڵێنتان پێدراوە ( لە هاتنی ڕۆژی دوایی ) دێتەدی (٧)

خوا ئەپارێنەوە ، وە ناوی خوا ئەبەن‌و سوپاسی ئەكەن ، وەكو ئەفەرموێ ( فالملقیات ذكرا ) ئنجا ئەو بایانە لەپاش بڵاوكردنەوەی هـەوری باران‌و دابەش‌كردنی بەسـەر وولاتانا ـ ئەخەنە سەر زبانی دانیشتووانی ئـەو ناوچەو قەڵەمڕەوە ، ناوی ئەو خوایەی كە ئەو بای بارانەی بۆ ناردوون ، ئنجا سا یا بە سووپاسەوە وەك دەستەی دووهەم ، وە یا بە ناسوپاسی‌یەوە وەك دەستەی یەكەم ، وەكو ئەفەرموێ ئەوانەی كە پێویست بن بە باران، ناوی خوا ئەبەن بە ڕەنگێك كـە ببێ بە (عذرا) بەهانە بۆ شۆرینەوەی گوناهانیان ، واتە ناوەكەی لەگەڵ سوپاس‌و ستایشا ئەبەن كـەوا لەكاتی پێویستی‌یان بە بای باران ، هەوری بۆ ناردن‌و بارانی بۆ باراندن‌و جیهانی بۆ زینـدوو كردنەوە ، وە ئەوانەی كـە پێویست بـە بارانیش نین یا ئەگەر پێویستیش بن قازانجیان لە نەبارینا زۆرترە ، چونكە هەزاران تەن دەغڵ‌و دانیـان كـە هەیە ئەیفرۆشن بە گران ، با وولاتیش وێران ببێ ، وە هەزاران مەردوم لەبرسانا بمرێ ، ئنجـا ئەمـانە ناوی خوا ئەبەن بـە ڕەنگێك كـە ببێ بە ( او نذرا ) مایـنـەی ترساندنیـان بەهۆی ئـەو ناسوپاسی‌یەی كـە ئەیكەن ، واتە سوێند بەمجۆرە بایانە ( انمـا توعـدون لواقع ) ئەوی كە بەڵێنتان پێدراوە لـە هاتنی ڕۆژی دوایی‌و پاداش‌و تۆڵە

فَاِذا النُّجُومُ طُمِسَتْ (٨) وَاِذا السَّماءُ فُرِجَتْ (٩) وَاِذا الْجِبالُ نُسِفَتْ (١٠) وَاِذا الرُّسُلُ اُقِّتَتْ (١١)

ئنجا کاتێك کە ئەستێرەکان تاریك‌بوون (٨) وە دەمێك کە ئاسمان لەت‌بوو (٩) وە کاتێك کێوەکان تەخت‌کران (١٠) وە ساتێك کە کاتی محاکمە دانرا بۆ پێغەمبەران (لەگەڵ ئوممەتەکانیانا) (١١)

دێنەدیی ، ئەورۆژەی کە هەرچی گومان بێ تیا نی‌یە ، وە خوا سوێندی لەسەر ئەخوات بۆئەوەی کە مەردوم بێدار بکاتەوە ، وە تێ‌ی‌بگەیەنێ کە هەموو کەسێك ڕۆژی پرسینەوەی لەپێشەوەیە ، وەکو ئەفەرموێ (فاذا النجوم طمست) ئنجا کاتێك کە ئەستێرەکان تاریك بوون بەم‌ڕەنگە لەبەر نەمانی هێزی کیشندە لە شوێنی خۆیان ترازان ، وەك لە ئایەتێکی‌ترا ئەفەرموێ « واذا الکواکب انتثرت / انفطار/٢»[1] (واذا السماء فرجت) وە دەمێك کە ئاسمان لەت‌بوو ، واتە دەستووزو باوی لای زۆرروو تێك‌چوو (واذا الجبال نسفت) وە کاتێك شاخەکان تەخت‌کران .

ئەمە حاڵی ئاسمان‌و زەوی‌یە لەو ڕۆژەدا ، بەڵام حاڵی ئادەمیی هەر مەپرسە ، هەموو کەسێك لەوڕۆژەدا بە پێغەمبەرانەوە سامی لێ‌ئەنیشێ ، وە هەموو چاوەچاوی لێ‌پرسینەوە ئەکەن ، وەکو ئەفەرموێ (واذا الرسل اقتت) کاتێك کە پێغەمبەران ڕۆژی محاکمەیان بۆ دانرا

(١) واتە کاتێك کە ئەستێرەکان هەڵوەریین .

لِأَیِّ یَوْمٍ أُجِّلَتْ ( ١٢ ) لِیَوْمِ الْفَصْلِ ( ١٣ ) وَمَا أَدْرَاكَ مَا یَوْمُ الْفَصْلِ ( ١٤ )

بۆ چ ڕۆژێ دواخرا ؟ ( ١٢ ) بۆ ڕۆژی بڕیاردان ( ١٣ ) تۆ چووزانیت ڕۆژی بڕیاردان چی‌یە ؟ (١٤)

کە شاهیدیی تیا بدەن لەسەر ئوممەتەکانیان ، ئنجا لەوکاتەدا ئەبێژرێ ( لای یوم اجلت ) بۆ چ ڕۆژێ دواخرا محاکمەی ئوممەتان ؟ وەڵام ئەدرێتەوە کە هەڵگیرا ( لیوم الفصل ) بۆ ڕۆژی بڕیاردان لە ناوەندی بەندەگانا ، ئەو بڕیارەی کە هەرچی هەڵوەشاندنەوە بێ لەدوایەوە نی‌یە، ئنجا لەوڕۆژەدا پێغەمبەران حازر ئەبن بۆئەوەی بەرپرسیاریی «مسئولیت» لەسەر خۆیان لابەرن ، وە نیشان بدەن کە ئەمان پێویستانی خۆیانیان بەجێ هێناوە ، وە بە هەموو زبانێك قسەیان کردووە لەگەڵ ئوممەتەکانیانا ، وە ئەگەر درێغو کۆتاهی‌یەك بێ لەمانەوە نی‌یە ، بەڵکو لە ئوممەتەکەیانەوەیە .

ئنجا بۆ نیشاندانی سامو توندیی ئەوڕۆژە ، فەرمووی ( وما ادراك ما یوم الفصل ) تۆ چووزانیت کە ڕۆژی پرسینەوەو بڕیاردان چی‌یە ؟

وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ (١٥) أَلَمْ نُهْلِكِ الْأَوَّلِينَ (١٦)

---

وای بۆ بێ‌بڕوایان لەو ڕۆژەدا : (١٥) ئایا پێشینانمان لەناونەبرد (١٦)

---

واتە زۆر سەیرە ، بێ‌موبالاتیت بەو ڕۆژە ، وەکو تێی گەیشتبیت‌و ڕێی ڕزگاربوونت بۆ دۆزیبێتەوە وایە ، لەگەڵ ئەمیشە کە تێی‌نەگەیشتوویت ، وە نتزانیت چڕۆژێکی ڕەشە ( ویل یومئذ للمکذبین ) وای بۆ ئەو بێ‌بڕوایانەی کە ڕۆژی دوایی بەدرۆ ئەزانن ، واتە(١) لەوڕۆژەی کە ئەم شتانەی تیا ڕووئەدات تێ‌ئەگەن لە ئەندازەی گومڕایی خۆتان‌و شایستەیی تان بۆ تۆڵەو سزا .

★ ★ ★

دوای ئەوەی کە بێ‌بڕوایانی ترساند بە ڕۆژی دوایی ، ئنجا ئەیان ترسێنێ بە باسی لەناوبردنی بێ‌بڕوایانی پێشینانی زۆر کۆن ، ئەفەرموێ ( الم نهلك الاولين ) ئایا گەلانی پێشینانمان لەناونەبرد وەك گەلی «نوح»و «عاد»و «ثمود» بەهۆی بێ‌بڕوایی یان بە پێغەمبەرانیان‌و بە

---

(١) ئیشارەیە بۆ وەڵامی « اذا النجوم طمست » کە استفادە ئەکرێ لە « ویل یومئذ للمکذبین » .

ثُمَّ نُتْبِعُهُمُ الْآخِرِينَ ؟ (١٧) كَذَلِكَ نَفْعَلُ بِالْمُجْرِمِينَ (١٨)
وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ ( ١٩ )

لەپاشا گەلانی دوای ئەوانمان وەك ئەوان لێ نەكرد ؟ (١٧) هەروا ئەكەین بە گوناهكاران (١٨) وای بۆ بێبڕوایان لەوڕۆژەدا ! (١٩)

سرووشیان (ثم) دوای ئەوەی كـە ئەوانمان لەناوبرد ( نتبعهم الاخرين ) ئایا گەلانی‌تری دوای ئەوان لە بێبڕوایانو فەرمان‌نەبەرانمان وەك ئەوانی پێشوو لەناونەبرد ، بەمڕەنـگە ئەمانیشمان وەك ئەوان لەناوبرد ، واتــە ئەگـەر ئێوەش لەســەر بێبڕوایی بمێنـنـەوە ئـەی گـەلی قورەیش وەك ئەوانتـان لێ ئەكـەین ، چونـكە ئەمە دەستوورو باوێـكی تێكڕایی‌یە بۆ هـەموو گـەلێك كـە لە ڕێی ڕاست لابدات ، وەكو ئەفەرموێ ( كذلك نفعل بالمجرمين ) ئاوا ئەكـەین بە گوناهـكاران ( ویل یومئذ للمكذبين ) وای بۆ ئەوانەی كە بەمدەستووره باوەڕ ناكەن .

ئەم ئایەتی « ويل يومئذ للمكذبين » ەی دە جـار ئەیلێتەوە لــەم سوورەتـەدا وەك سوورەی «الرحمان» كـە لــەدوای باسی هــەموو بەهرەیەكەوە ئەفەرموێ ( فبأى الآء ربكما تكذبان ) ئەمە وەك ئەوە وایـە كـە یەكێك بە پیاوێـكی خۆی بلێ : من چاكەم لەگەل نەكردیت ژنم بۆ هێنایت ؟ من چاكـەم لەگەل نەكردیت خانووم بۆ كڕیت ؟ من چاكـەم لەگەل نەكردیت دوكانم بۆ دانایت ؟ من چاكەم لەگەل نەكردیت فلان شتو فلان شتم بۆ كردیت ؟ ووتنەوەی ئەمجۆرە نەقەراتە لــەم جۆرە شوێنانەدا زۆر جوانو دلگیرە .

اَلَمْ نَخْلُقْكُمْ مِنْ مَاءٍ مَهِينٍ (٢٠) فَجَعَلْنَاهُ فِي قَرَارٍ مَكِينٍ (٢١) اِلَى قَدَرٍ مَعْلُومٍ ؟ (٢٢) فَقَدَرْنَا فَنِعْمَ الْقَادِرُونَ (٢٣)

---

ئایا ئێوەمان دروست نەکرد لە ئاوێکی بێ نرخ ؟ (٢٠) ئنجا خستمانە ئارامگاهێکی قایمەوە (٢١) تا ماوەیەکی زانراو ؟ (٢٢) ئنجا ماوەمان بۆ دانا ، چاك ئەندازە گرێکین (٢٣)

---

لەم سوورەتەشا دوای هەموو بەهرەیەك یا هەڕەشەیەك ئەم نەقەراتە تازە ئەکاتەوە بە باسی سزاو لەناوچوون بۆ ئەو بێ بڕوایانەی کە نرخی بەهرە نازانین ، یا گوێ بە سزا نادەن بۆ داچڵەکاندنیان .

★ ★ ★

لەدوای باسی قڕکردن و لەناوبردنی گەلانی پێشوو ، ئنجا باسی دروست کردن و گیانکردن بەبەرا ئەکات ئەفەرموێ ( الم نخلقکم من ماء مهین ) ئایا ئێوەم دروست نەکردووە بەم جوانیی و ڕێکی و پێکی یە لە دڵۆپە ئاوێکی بێ نرخ ( فجعلناه في قرار مکین ) ئنجا خستمانە ناو ئارامگاهێکی قایمی بەهێز کە منداڵدانە ( الی قدر معلوم ) تا ماوەیەکی دیاریی کراو کە ٢٧٤ ڕۆژە ـ کە ئەکاتە نۆ مانگی ڕۆژیی ـ تا ٢٨٠ ڕۆژ کە ئەکاتە دە مانگی عەرەبی ، یا چل حەفتە ( فقدرنا ) ئنجا ئەندازەمان بۆ دانا ( فنعم القادرون ) چاك ئەندازە دانەرێکین ، واتە دوای متربەبوونی گیانداری تۆویی «حیوان منوی» لەگەڵ گەرادا ، وە ئارامگرتنی لە منداڵدانا ، ئیتر بەرە بەرە گەورەی ئەکەین هەر ئەندامەی بەپێی خۆی ،

وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ ( ٢٤ ) أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ كِفَاتاً ( ٢٥ ) أَحْيَاءً وَأَمْوَاتاً ( ٢٦ )

---

وای بۆ بێبڕوایان لەو ڕۆژەدا (٢٤) ئایا ئێمە زەوییمان نەگێڕاوە بە کۆکەرەوە ؟ (٢٥) بۆ زیندووانو مردووان ؟ (٢٦)

---

وە پلە بە پلە سەری ئەخەینو قۆناغ بە قۆناغ پێی ئەبڕینو پەردە بە پەردە پێشی ئەخەین تا کاتی خۆی ، وە لە هیچ پلەیەکا هەناسەیەك پاشو پێش نابێ ، تا ئەبێ بە ئادەمی یەکی ڕێكوپێكو دێتەجیهانەوە ، کە ئەمە گەورەییو داناییو زانایی خوا نیشان ئەدات ، بەڕەنگێك کە بێبڕوا پێی شایستەی هەموو جۆرە سزاو زیانێکە ، وەکو ئەفەرموێ ( ويل يومئذ للمكذبين ) وای بۆ ئەوانەی کە بڕوایان بەئەندازیاریی خـوا نی‌یە .

★ ★ ★

ئەگەر بەمانای پێشووش بڕوا ناهێنن با بەم نیشانەیە بڕوا بێنن کە ئەفەرموێ ( الم نجعل الارض كفاتا احياء واموانا ) ئایا ئێمە زەوییمان نەگێڕاوە بە ڕاکێشەرو کۆکەرەوەی زیندووانو مردووان لەناو خۆیا ، واتە زیندووی گرتووە بە کۆڵەوەو مردووی گرتۆتە باوەش لەگۆڕا ، وە هەردوو لا بەمجۆرە ئەحەسێنەوە .

عبدالقادری مغربی لە تەفسیرەکەیا ئەڵێ : لەدوای ئەوەی کە هێزی کێشندە دۆزرایەوە ، وە زانرا کە زەویی بەهۆی ئەو هێزەوە

وَجَعَلْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ شَامِخَاتٍ ،

وە گێڕامان لەناویا شاخانی بەرزی لەنگەر داکوتاو ،

هەرچی لەسەر پشتی بێ لە ئادەمیی‌و گیان‌لەبەرو شتی‌تر ، ڕای‌ئەکێشێ بۆ لای خۆی ، وە ئەگەر ئەم هێزە کێشندەیە نەبوایە ، هەرچی لەسەر پشتی زەویی بوو هەمووی ئەچوو بەحەوادا بەهۆی سووڕانەوەی بە گردی خۆی‌و بە گردی ڕۆژا ـ ئەم دەرکەوتنی هێزی کێشندەیە دەری‌خست مانای ئەم ئایەتە کە چۆن زەویی گیان‌لەبەران ڕائەکێشێ بۆ لای خۆی ، وە ئەی‌نووسێنێ بە سنگی‌یەوە وەك دایك کە منال ئەنووسێنێ بەخۆیەوە .

هەر لە میهرەبانیی خوایە ئەم کێوانەی کە چوون بەئاسمانا ، وە پێویستە لەسەر مەردوم کە لێی ووردبنەوە ، وەکو ئەفەرمووێ ( وجعلنا فيها رواسي شامخات ) وە گێڕامان لە زەویی‌دا کێوانی وا کە سەرێکی ڕۆچووە بە زەویی‌دا وەك سنگ‌و سەرەکەی‌تری بەرزبۆتەوە بەئاسمانا . بەسەری خوارەوەی زەویی توند ئەکاتەوە وەك گوێ بزمارڕێژ ، وە نایەڵێ بەهۆی جۆش‌و خورۆشی ناوی لەیەك بەربێ‌و شەقار شەقار ببێ . بە سەرە بەرزەکەشی تەم‌و هەوور ڕائەکێشێ ، وە لە هەموو شوێنێك زۆرتر باران‌و بەفری لەسەر ئەبارێ ، وە بەم‌هۆیەوە چەم‌و ڕووبارو کانیی‌و کارێز لەداوێنی شاخەوە زۆر ئەبێ ، کە زۆریی ئەمانەش مایەی زۆریی باخ‌و باخات‌و دارو درەخت‌و کشت‌وکاڵ‌و گژوگیاو لەوەڕە ، هەر ووڵاتێك شاخ‌و داخی زۆر بێ ، بەفرو باران‌و

وَاَسْقَيْنَاكُمْ مَاءً فُرَاتاً ؟(٢٧) وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ !(٢٨)

وە ئاوی شیرینمان پێ نۆشین ؟ (٢٧) وای بۆ بێبڕوایان لەورۆژەدا(٢٨)

ئاوی شیرەنیشی زۆر ئەبێ ، وە هەر وولاتێك شاخی نەبێ ، یا کەمی بێ بەفرو بارانی کەم ئەبێ • هەر لەبەرئەمەیە کە لەدوای باسی کێوی بەرزەوە فەرمووی ( واسقیناکم ماء فراتا ) بەهۆی ئەو شاخەوە ئاوی شیرینمان پێ نۆش کردن ، بۆئەوەی نیشان‌بدات کە شاخی بەرز لە هەموو شوێنێك عەماری ئاوە •

هەندێ لە زانایانی سرووشتی ئەڵێن : ئەم کێوانە پەیدابوون بەهۆی بوو•ەلەرزەی بەهێزو لەتبوونی زەویی‌و دەرچوونی ئەو گازانە تواوانەی کە لەناو سکیا بوون ، واتە ئەگەر وانەبوایە ، وە ئەم مادە بەجۆش‌و خرۆشانە هەر لەناوزەویی‌دا بمانایەتەوە ، ئەم شاخانە پەیدا نەئەبوون ، ئەوکاتە زەویش هەمیشە لە جونبوش‌و جوولەجوولەو تەکان‌خواردنا ئەبوو ، وە ئارام بۆ سەرزەویی‌و دانیشتووانی نەئەما (ویل یومئذ للمکذبین ) وای بۆ ئەوانەی کە بڕوایان بەم میهرەبانی‌یانەی خوا نی‌یە ، وە سوپاس ناکەن •

★ ★ ★

لەدوای نیشاندانی ئەم چەشمەندازانە ، وە لەدوای پڕبوونی چاوو گوێ‌و هەست بەم‌باسانە ، ئنجا کوتوپڕ ئەچێتە سەر باسی ڕۆژی پرسینەوەو سزا ، وە ئەبینین کەوا فەرمان ئەدا بە گوناهباران کە ملی

اِنْطَلِقُوا اِلَى مَا كُنْتُمْ بِهِ تُكَذِّبُونَ (٢٩) اِنْطَلِقُوا اِلَى ظِلٍّ ذِى ثَلَاثِ شُعَبٍ (٣٠) لَا ظَلِيلٍ وَلَا يُغْنِى مِنَ اللَّهَبِ ! (٣١)

(بەم بێبڕوایانە ئەووترێ) بڕۆن بـۆلای ئەو دۆزەخـەی کە بڕواتـان پێنەئەکرد (٢٩) بڕۆن بۆلای سێبەرێکی سێ قۆڵ (٣٠) نە سێبەرێکی فێنکەو نە شتێك لە گڕەی (دۆزەخ) کەم ئەکاتەوە (٣١)

ڕێبگرن بۆ ئەو سزایەی کـە لە جیهانا پێیان باوەڕ نەئەکرد ، ئەفەرموێ (انطلقوا الى ما كنتم به تكذبون) بچن بۆ لای سزایەك کـە لـە جیهانا پێتان بڕوا نەئەکرد ، کە ئەویش سزای دۆزەخە ، بەڵام ئەم جارە بـە وێنەیەکی تازەی وا باسی ئەکات کـە هێشتا نەبیستراوە ، بەگاڵتەوە پێیان ئەفەرموێ (انطلقوا الى ظل ذى ثلاث شعب) بڕۆن بۆلای سێبەرێك کـە لەدوای بەرزبوونەوەی ئەبێ بە سێ قۆڵ هەروەك هـەموو دووکەڵێکی زۆری خـەست کـە بەرزبووەوە ، ئەگـەر با نەبێ ئەبێ بـە سێ قۆڵ (لا ظليل) نە سێبەرێکی فێنکە کـە بتپارێزی لـە گـەرمیی دۆزەخ (ولا يغنى من اللهب) وە نە شتێك لە گڕەی دۆزەخ کەمئەکاتەوە .

هەموو ئاگرێك بزیسك ئەهاوێژێ گەورە یا بچووك ، کـاتی وا هەیە ئەم بزیسکانە بەرودوا ڕیزئەبەستن وەك قـەتار ، ئنجـا لێرەدا تەشبیهی بزیسکە گەورەکـانی دۆزەخ ئەکـات بـە کۆشكو ئەفەرموێ

اِنَّها تَرْمِی بِشَرَرٍ کالْقَصْرِ ( ٣٢ ) کَأَنَّهُ جِمالَةٌ صُفْرٌ ( ٣٣ )
وَیْلٌ یَوْمَئِذٍ لِلْمُکَذِّبِینَ ! ( ٣٤ )

---

بەڕاستیی دۆزەخ پزیسکی وەك کۆشك ئەهاوێ ( ٣٢ ) ( بەرودوا ئەڕۆن ) ئەڵێیت کاروانی حوشتری زەردن (٣٣) وای بۆ بێبڕوایان لەوڕۆژەدا (٣٤)

---

( انهـا ترمي بشرر کالقصر ) دۆزەخ پزیسکی گەورە ئەهاوێژێ وەك کۆشك ، وە تەشبیهی ڕیزە پزیسکە پچووکەکانیش ئەکات بە کاروانی حوشتر لە زەردییو یەك لەدوای یەکیدا ، ئەفەرموێ ( کأنه جمالة صفر ) گۆیا ئەڵێیت کاروانی حوشتری زەردن ، واتە پزیسکی واتان تێ‌ئەگرێ کە هێندێکیان بەقەد خانوویەكو هێندێکیان بەقەد حوشترێك ئەبێ ، وە یەك لەدوای یەك ڕووتان تێ‌ئەکەن وەك کاروانێك کە ڕووبەڕووتان بێت ( ویل یومئذ للمکذبین ) وای بۆ بێبڕوایان لەو ڕۆژەدا .

ئەبومسلمی ئیسفەهانی ئەڵێ : ئەگونجێ مەبەست لەم سێ‌قۆڵی سێبەرە ، ئەو سێ سیفەتەی بێ کە لەدواوە فەرمووی کە ئەمانەن :ـ

١ ـ لا ظليل .
٢ ـ ولا يغني من اللهب .
٣ ـ انها ترمي بشرر کالقصر .

★ ★ ★

هذا یَومُ لا یَنْطِقُونَ (٣٥) وَلا یُؤْذَنُ لَهُمْ فَیَعْتَذِرُونَ (٣٦) وَیْلٌ یَوْمَئِذٍ لِلْمُکَذِّبِینَ (٣٧) هـذا یَوْمُ الْفَصْلِ ، جَمَعناکُمْ وَالاَوَّلینَ (٣٨) فَاِنْ کانَ لَکُمْ کَیْدٌ فَکیدُونِ (٣٩)

---

ئەمڕۆ ڕۆژێکە (بێبڕوایان) ناتوانن قسەی تیا بکەن (٣٥) وە ڕێ نادرێن کە بڕوبیانوو بهێننەوە (٣٦) وای بۆ بێبڕوایـان لەوڕۆژەدا (٣٧) ئەمـڕۆ ڕۆژی بڕیاردانە ، ئێوەو پێشینانمـان کۆکردۆتـەوە (٣٨) ئنجـا ئـەگەر چارەیەك شك ئەبەن چاری خۆتان بکەن (٣٩)

---

بەڕاستیی خەمو خەفەتو ئازارو سزای ئەوڕۆژە زبانی بێبڕوایان ئەبەستێ ، وەکو ئەفەرموێ ( هذا یوم لا ینطقون ) ئـەمڕۆ ڕۆژێـکە کـە بێبڕوایان ناتوانن قسەیەکی تیا بـکەن کە کەڵـکیان بگرێ ( ولا یؤذن لهم فیعتذرون ) وە ڕێنادرێن کـــە بڕوبیانوو بهێننەوە ( ویل یومئـذ للمکذبین ) وای بۆ بێ بڕوایان لەوڕۆژەدا .

( هذا یوم الفصل ) ئەمڕۆ ڕۆژی بڕیاردانە ، بڕیارێـکیوا کـە نە تکای تیایەو نە هەڵوەشانەوە ( جمعناکم والاولین) ئێوەو پێشینانتانم کۆکردەوە تا بڕیاری خۆمان بدەین بەسەرتانا ( فان کـان لـکم کیـد فکیدون ) ئنجا ئەگـەر فڕوفێڵێك شك ئەبەن بۆ ڕزگـارکردنی خـۆتان بکەن ، وە ئەگەر دەسەڵاتێکتان هـەیە بەکاری بێنن ، واتە لەمڕۆژەدا نە فڕوفێڵ بەکاردێو نە دەسەڵات ، وە هـەموو بێبڕوایەك شایستەی

وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ ! (٤٠) إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي ظِلَالٍ وَعُيُونٍ ( ٤١ ) وَفَوَاكِهَ مِمَّا يَشْتَهُونَ ( ٤٢ ) كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئاً بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ ( ٤٣ )

---

وای بۆ بێبڕوایان لەو ڕۆژەدا (٤٠) بێگومان پارێزگاران لە سێبەرو ( قەراغی ) سەرچاوەهای زۆران (٤١) وە لەناو میوەهاتێکدان کە ئارەزووی ئەکەن (٤٢) بخۆنو بخۆنەوە نۆشتان بێ بەهۆی ئەوەی کە ئەتان کرد (٤٣)

---

هەموو سزاو دەردی سەری یەکە ، وەکو ئەفەرموێ ( ويل يومئذ للمكذبين ) وای بۆ بێبڕوایان لەوڕۆژەدا •

لەدوای باسی تۆڵەو سزای بێبڕوایان لە ڕۆژی دواییدا ، ئنجا باسی خۆشیی‌و پاداشی چاکان ئەکات لە بەهەشتا ، ئەفەرموێ ( ان المتقين في ظلال وعيون ) پارێزگاران لەژێر سێبەری باخاتی بەهەشت‌و قەراغی کانی‌و کارێزو سەرچاوەی پاك‌و ڕووناك‌و ساردو سازگاران ( وفواكه مما يشتهون ) وە لەناو هەموو جۆرە میوەیەکان لەوانەی کە خۆیان حەزی لێ ئەکەن و ئارەزووی ئەکەن ، وە پێیان ئەووترێ لە بەهەشتا ( كلوا واشربوا هنيئا بما كنتم تعملون ) بخۆنو بخۆنەوە لەوەی کە ئارەزووی ئەکەن ، بە نۆشی گیانتان بێ بەهۆی ئەو کردەوە جوانانەی ئەتان کرد لە جیهانا •

اِنّـا كَـذلِكَ نَجْـزِى الْمُحْسِنِين ( ٤٤ ) وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ ! ( ٤٥ ) كُلُوا وَتَمَتَّعُوا قَلِيـلاً اِنَّـكُمْ مُجْرِمُونَ ( ٤٦ )

---

ئێمە ئاوا پاداشی چاکان ئەدەینەوە (٤٤) وای بۆ بێ‌بڕوایان لەو ڕۆژەدا (٤٥) ( ئەی بێ‌بڕواینە ) بخۆن‌و بەهرەمەند بن ماوەیەکی کەم ( لە جیهانا ) بەڕاستی ئێوە گوناهبارن (٤٦)

---

مەبەس لەم فەرماندانە بە خواردن‌و خواردنەوە ، فەرمانە بە هەموو جۆرە خۆشیی‌و ڕابواردنێك ، وەك لە سوورەی «حاقە»دا .

( انا كذلك نجزى المحسنين ) ئێمە ئاوا پاداشی چاکان ئەدەینەوە ( ويل يومئذ للمكذبين ) وای بۆ ئەو بێ‌بڕوایانەی کە بڕواناکەن بەم مژدە خۆشانەی کە خوا ئەیدا بە چاکان .

★ ★ ★

لەپاش باسی چاکان‌و نازو بەهرەیان لە بەهەشتا ، ئنجا گوتوبێژ بائەداتەوە سەر بێ‌بڕوایانی جیهان‌و پێیان ئەفەرموێ ئێوەش لە جیهانا ( كلوا وتمتعوا قليلا ) بخۆن‌و بەهرەمەند بن چەند ڕۆژێکی کەم تا ئەمرن‌و بە تۆڵەی پاشەڕۆژی خۆتان ئەگەن ( انكم مجرمون ) چونکە

وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ ! ( ٤٧ ) وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ارْكَعُوا لا يَرْكَعُونَ ( ٤٨ ) وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ !
( ٤٩ )

---

وای بۆ بێ‌بڕوایان لەوڕۆژەدا (٤٧) وە کاتێك پێ‌یان بووترێ : (لە خوا بترسن‌و ) سەری بۆ دابنەوێنن سەردانانەوێنن ( ٤٨ ) وای بۆ بێ‌بڕوایان لەوڕۆژەدا ( ٤٩ )

---

بەڕاستیی ئێـــوە گوناهبـــارن ( ویل یومئذ للمکذبین ) وای بۆ ئـەو بێ‌بڕوایانـەی کـە بۆ چـــەند ڕۆژێـکی کەم دەست لـە خۆشی‌یەکی هەتاهەتایی هەڵئەگرن ، وە بڕوا ناکەن بەو هەڕەشانەی کە خوا لێ‌یان ئەکـــات .

ئەو بێ‌بڕوایانە سەرەڕای بێ‌بڕوایی‌یەکەیان ، بە دەعیەو فیزیشن لەگەڵ خوادا ، وەکو ئەفەرموێ ( واذا قیل لهم ارکعوا ) کاتێك کە پێ‌یان بووترێ لە خوا بترسن‌و دەست لەم سەرکێشی‌یە هەڵگرن (لا یرکعون) ناترسن‌و دەستی لێ هەڵناگرن ، وە ســـەر بۆ ســرووشی ئاسمـــانیی‌و فەرموودەی خوا دانانەوێنن‌و بڕوای پێ‌ناکەن ( ویل یومئـذ للمکذبین ) وای بۆ بێ‌بڕوایان لەو ڕۆژەدا .

ئنجا ئەم بێ‌بڕوایانە ئەگـەر بڕوا بەم قورئانە نەکەن کـــە بـــە سرووش لە بارەگای خواوە دێتە خوارەوە بۆسەر دڵ‌و زبانی پێغەمبـەری

فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ ؟! ( ٥٠ )

( ئەگەر ئەوان بڕوا بە قورئان نەکەن ) ئیتر بە چ فەرموودەیەکی‌تر بڕوا ئەهێنن دوای قورئان ؟ (٥٠)

ئیسلام ( فبأی حدیث بعده یؤمنون ) ئیتر بە چ فەرموودەیەکی‌تر بڕوا ئەهێنن ؟ واتە هیچ نامەیەکی ئاسمانی ناگا بە قورئان ، ئنجا ئەگـەر ئەوان بڕوا بە قورئان نەکەن ئیتر بڕوا بە چی ئەکەن ؟!!.

**بەیارمەتیی خوای میهرەبان تەفسیری جزمی تبارکم تەواو کرد لە ڕۆژی ١٣٨٥/٦/١٧هـ بە ڕێکەوتی ١٩٦٥/١٠/١٢م**

# تکایە پێش خوێندنەوە ئەم هەڵانە چاك بکە

| لاپەڕە | دێڕ | هەڵە | ڕاستەکەی |
|---|---|---|---|
| ٩ | ٣ | اْلبَصَرَ | الْبَصَرُ |
| ١٧ | ٢ | الخبيرو | الخبير |
| ١٧ | ٩ | دڵنتانا | دڵتانا |
| ٣٢ | ١ | ان | انِ |
| ٣٤ | ٣ | گوێو چاوو پێداوون | گوێو چاوو دڵی پێداوون |
| ٤٨ | ١١ | هەزارو چوارسەد ساڵە | هەزارو پێنجسەد ساڵە |
| ٥٨ | ١ | لَیَصْرِ مُنهَا | لَیَصْرِ مُنَّها |
| ٥٨ | ٥ | بەسەر باخەدا | بەسەر باخەکەدا . |
| ٦١ | ٩ | هەمووی بەگرە کەوتبووە | هەمووی بەگرە کەوتبووە |
| ٦٢ | ٣ | خوای ئێمە خۆمان ستەمکار بووین | خوای ئێمە دوورە لە ستەم ئێمە خۆمان بووین |
| ٦٣ | ١ | انا الی ربّنا | انا الی ربّنا |
| ٦٤ | ٢٠ | هێندێجار کاڵتەوە | هێندێجار بەکاڵتەوە |
| ٦٥ | ١ | ( ٤٣ ) | ( ٣٤ ) |
| ٧٠ | ١٦ | گیانەڵاوە | گیانەڵاوەوە |
| ٧١ | ١٧ | دەستووری | دەستوورو |
| ٧٢ | ١ | سنستدرجهم | سنستدرجهم |
| ٧٤ | ٢ | فەرمانیی | فەرمانی |
| ٨٥ | ١٥ | دارخوارمای | دارخورمای |
| ٨٥ | ١٦ | ٢ | ١ |
| ٨٦ | ١٧ | خنکانو | خنکان |
| ٨٧ | ١ | انا لما طغی الـماءُ | انا لما طغی الْماءُ |
| ٩٣ | ١ | «جسم وحجم» | « جسم وحجم »یە |
| ٩٩ | ١٨ | ان | « ان |
| ١٠٤ | ١ | فلا أقسِمْ | فلا أقسمُ |

| لاپەڕە | دێڕ | هـــەڵە | ڕاستەکەی |
| --- | --- | --- | --- |
| ١٠٤ | ٢ | یەوانەی | بەوانەی |
| ١٠٥ | ١٨ | نەوەتی | ئەوەتی |
| ١٠٨ | ٣ | لێ ئەسەد | لێ ئەسەند |
| ١١٢ | ١ | مکذّبین | مکذّبین |
| ١١٥ | ٤ | نی‌یە بۆ بڕوایان | نی‌یە بۆ بێ بڕوایان |
| ١١٥ | ١٠ | لەو بێ‌بڕوایە | ئەو بێ‌بڕوایە |
| ١١٨ | ١٧ | کەس لە کەسی | کەس‌لەکەس |
| ١٢٨ | ٥ | خانەی خوایان | خانەی خوایان بکەن |
| ١٣٠ | ١١ | ئەو کەلە لە هەموو | ئەو کەلە هەموو |
| ١٣٨ | ١٠ | وە تا حاڵی ببێ کە | وەتا تێ‌بگات کە |
| ١٤٩ | ٧ | « زەوی » | « زەویی » |
| ١٥٩ | ٤ | لەپیش لافاوەکەوە | ١ ـ لەپێش لافاوەکەوە |
| ١٦٣ | ١١ | هیندیکیان لەئاوئەژیین | هێندێکیان لەئاوا ئەژیین |
| ١٦٦ | ٦ | چەند کەسێك جنۆکە | چەند کەسێك لە جنۆکە |
| ١٦٧ | ٣ | سەیرمان بیت | سەیرمان بیست |
| ١٧٠ | ١٨ | مەردوم تەواویی | مەردوم بەتەواویی . |
| ١٧٢ | ١٩ | ( فوجدناها ملئت | ( فوجدناها ملئت |
| ١٧٥ | ١ | نَقعُدُ | نقْعُدُ |
| ١٧٥ | ٤ | ئەستێرە ئەبیینی | ئەستێرە ئەبیینێ |
| ١٨١ | ٢ | فمن یؤمن بربه وانا منـــا المسلمون | فمن یؤمن بربه فلا یخاف بخسا ولا رهقا . |
| ١٨١ | ٣ | ومنا القاسطون . فمن اسلم | وانا منا المسلمون ومنـا القاسطون . |
| ١٨٦ | ١١ | ( کادوا ) | ( کادوا |
| ١٩٠ | ٤ | کە ئەڵێن | کە بەڵێن |
| ١٩٧ | ١٣ | ئەوێستا تا | ئەوێستان تا |
| ١٩٧ | ١٤ | ( طه ، ما انزلنا علیك | « طه ، ما انزلنا علیك » |
| ٢٠١ | ١٠ | بەهەڵستی | بەرهەڵستی |
| ٢٠٤ | ٢ | فیرئوْنَ | فیرعوْنَ |
| ٢٠٥ | ١١ | ( وکان وعده مفعولا ) | ( کان وعده مفعولا ) |

| لاپەڕە | دێڕ | هـــەڵە | ڕاستەکەی |
|---|---|---|---|
| ٢٠٨ | ١١ | ( فقرۆوا ما تیسر | ( فاقرۆوا ما تیسر ) |
| ٢٠٩ | ١١ | بەرزبوونەوەیان | بەرزبوونەوەیان‌و |
| ٢١٨ | ٢ | و شت مەبەخشەو | وە شت مەبەخشەو |
| ٢٢١ | ٤ | (زۆری) یان‌و | ( زۆری ) یان‌و |
| ٢٢٧ | ١٨ | فریشتەی | فریشتەیێ |
| ٢٢٨ | ١٧ | ئەبینین | ئەبینن |
| ٢٣٤ | ٢٠ | یا پاش‌ئەکەوێ | یا پاش‌کەوێ |
| ٢٤٤ | ١٧ | بەتەما مەبە ، | وەڵام ئـەدرێتـــەوە لـــە بارەگای خواوە ئەفەرموێ ( کلا ) دەرچوون نی‌یەو بەتەما مەبە |
| ٢٥٥ | ١٧ | ( ایحب الانسان ... ) | ( ایحسب الانسان |
| ٢٥٨ | ١٦ | هێناویەتە | هێناوێتیە |
| ٢٦٥ | ١٨ | تەناسراون | نەناسراون |
| ٢٦٨ | ١٤ | نابینین | نابینن |
| ٢٧٢ | ١٦ | کورسیی خشڵی | کورسی‌و خشڵی |
| ٢٨٧ | ٩ | نازانین | نازانن |
| ٢٨٨ | ٩ | پێ‌پروا | بێ‌بڕوا |

# سەرچاوەکانی تەفسیری خاڵ


١ ـ تەفسیری منار هی سید رشید رضا ٠

٢ ـ تەفسیری شێخ محمد عبده ( خوا لێی خۆش‌بێ ) ٠

٣ ـ تەفسیری سید قطب ٠

٤ ـ تەفسیری شێخ احمدی مراغی ٠

٥ ـ تەفسیری جمال الدینی قاسمی ٠

٦ ـ تەفسیری محمد عزة دروزە ٠

٧ ـ تەفسیری قرآنی پیرۆز نووسینی ( محمود محمـد حمـزە ، حسن علوان ، محمد احمد برانق ) ٠

٨ ـ تەفسیری عبدالقادر مغربی ٠

٩ ـ تەفسیری احمد مظهر العظمة ٠

١٠ ـ گوڤاری نورالاسلامی جامع الازهر ٠

# ناوەرۆکی جزمی تبارك

لاپەڕە | بابەت

| لاپەڕە | بابەت |
|---|---|
| ٨٢ | باسی صالح پێغەمبەر • |
| ٨٥ | برجی پیرێژن • |
| ٨٨ | مەبەس لە فووکردن بە کەڕەنادا • |
| ٩٢ | مەبەس لە عەرشی خوا • |
| ٩٣ | مەبەسانی ڕۆژی دوایی ووتەیان بۆ دانەنراوە • |
| ٩٤ | هەرچی گوفتارو کرداری نهێنی هەیە هەمووی دێتە ڕوو لە ڕۆژی دواییدا • |
| ٩٥ | مەبەس لە نامەوەرگرتن بە دەستی ڕاست یا چەپ یا لەپشتەوە • |
| ٩٧ | فەرماندان بە خواردنو خواردنەوە لە بەهەشتا ، مەبەس هەر خواردن خواردنەوە نیە ، بەلکو مەبەس هەموو جۆرە خۆشیو ڕابواردنێکە • |
| ٩٩ | زۆر ژمارە لە قورئانا خۆی مەبەس نیە ، بەلکو هەر بریتییە لە زۆریی • |
| ١٠١ | فەرماندانی قورئان بە ڕێکخستنی کۆمەڵانی چاک ( جمعیاتی خیری ) • |
| ١٠٤ | مەبەس لە ( لا اقسم ) • |
| ١٠٨ | باسی پێغەمبەرێتی ( بوودە )و (کنفوشیوس)و (زەردەشت) • |
| ١٠٩ | پێغەمبەرێتی پێغەمبەری ئیسلام • |
| ١١٠ | بیرو باوەڕی تۆماس کارلایل دەربارەی ئایینی ئیسلام • |
| ١١٤ | سوورەی ( معارج ) |
| ١٢٦ | ئیسلام کۆمەڵی پاکو تەمیزو ناوچەوان بەرزی ئاشکرای ئەوێ |
| ١٢٧ | باسی بەندەو بەندەیی • |
| ١٣٠ | باسی گەواهیی ( شهادة ) • |
| ١٣٧ | سوورەی ( نووح ) • |
| ١٣٧ | نووح یەکەمین پێغەمبەرە لە ئادەمییدا • |
| ١٤٦ | چۆن بڕواهێنان ئەبێ بەهۆی زۆریی دارایی‌و باخاتو منال • |
| ١٥٠ | چوار معجزەی زۆر گەورە لە دوو ئایەتی پچووکا • |
| ١٥٥ | ئایینی صابئی • |
| ١٥٨ | باسی لافاوی نووح • |
| ١٦٢ | سوورەی ( جن ) • |
| ١٦٢ | باسێکی گرنگ لەبابەت جنۆکەوە • |
| ١٧١ | باسی جووکیی‌و ساختەچی‌و نوشتەو دێوبەند |

## لەم تەفسیرەدا

هەموو لاپەڕەیەك چەندەی قورئان بەربکەوێ ، ئەوەندە لەسەری لاپەڕەکەوە نوسراوە ، ئنجا خەتێك کێشراوە ، وە وەرگێڕراو « تەرجەمە »کەی لەژێرا نوسراوە ، دوای ئەوە خەتێکی‌تر کێشراوەو تەفسیرەکەی نوسراوە .

هەموو ئایەتێك سەرەتایەکی‌وای بۆ نوسراوە کە مەبەس لە ئایەتەکە ڕوون‌بکاتەوە ، بەجۆرێکی وا کە هەموو خوێندەوارێك تێ‌بگات کە چی ئەفەرموێ ، وە پەیوەستیی چی‌یە لەگەڵ ئایەتی پێشوودا .

لەهەموو جوانتر ئەوەیە کە تەفسیرەکە لەگەڵ قورئانەکەدا جۆش‌دراوە ، هەروەك تەفسیرەکە خۆی لەگەڵ خۆیا جۆش‌دراوە، لەگەڵ ئەمیشە کە بە کوردی‌یەکی پەتی ڕەوانی وا نوسراوە کە هەموو کەسێك تێ‌ی بگات .

جا کەوابوو ئەی کوردی مەرد تەفسیری قورئانە پیرۆزەکەت بەووردیی بخوێنەوەو دڵی بۆ بکەرەوە ، وە تا تەفسیری ئەم جزمە ئەخوێنیتەوە ـ خوا یار بێ ـ جزمێکی‌ترت بۆ لەچاپ‌ئەدرێ ، وە جزم بە جزم پێشکەشت ئەکرێ .

لە کتێبخانەی نیشتمانیی بەغدادا
ژمارە ( ٦٤٠ )ی ساڵی ١٩٨٦ی دراوەتێ

٤٠٠٠ هەزار دانە لەم کتێبە چاپکراوە

نرخی [illegible]

چاپخانەی ( الحوادث ) ت ٤١٥٢٦٨٥